# مەستوورە

دەمێك بوو لەو خولیایەدا بووم، بوێژی کورد ماهشەرەف خانم، کە نازناوی (مەستوورە)ی کوردستانی‌یە بە خوێندەوارانی کوردزمان بناسێنم، چونکە بە دەگمەن نووسەران و ئەدیبانی کورد دەربارەی ئەم بوێـژە دواون ، بەلام جێی داخـە دەرفەتم بۆ هەل نەدەکەوت، لە مێـژەوە دەم زانی کە مەستوورە خانم کتێبێکی سەبارەت بە مێـژووی بنەمالـەی ئەردەلان بە زمانی فارسی دانـاوە، لە دلەوە دەم ویست ئەم کتێبە لە فارسی‌یەوە وەرگێـرمـە سەر زمانی کوردی و ئەم وەرگێرانە ببێتە کەرەسـەیـەك بۆ ناساندنی باشتری مەستوورە بە خوێندەوارانی کورد، بەلام ئەم توانـەم لە خۆم دا نەدەبینی، تا مامـۆستـای بەرێـزم شوکـور مستەفام بینی، ئامادەیی خۆی بۆ وەرگێرانی ئەم مێژووە دەربری، کە بە دووقـۆلی ناوی خوامـان لێ‌هێنـاو دەسمـان بە کارکرد. لەبەر دژواریی سەبك و دارشتن و شێوازی نووسینی فارسیی سەردەمی قاجاری‌یەکان کە مەستـوورە پەیـرەوی ئەو سەبـك و شێـوازەیـەو لەو قوتـابخـانـەیەدا گەیشتـوتـە مایە، هەروا لەبەر تەبعی شاعیرانەی مەستوورە کەزۆر بەی نووسینـەکـەی بە سەجـع و ئەدەبیـاتی شیعـر و واژەی کۆنی عەرەبی -

فارسی‌یه، ئه‌مانه هه‌مووی بوو به هۆی پترکردنی ئه‌رکی وه‌رگێرانی مێژووی ئه‌رده‌لانی مه‌ستووره. به‌لام نه‌بوونی مه‌علوماتێکی شایانی باس تا ئێستا له‌باره‌ی مێژووی ئه‌رده‌لان و پێشده‌ستی ئێمه له‌م کاره‌دا بۆ ده‌وله‌مه‌ندکردنی کتێبخانه‌ی کوردی‌و پێداویستی ناساندنی شاعیرو ئه‌ده‌بییێکی به‌ناوبانگی وه‌ك مه‌ستووره به خوێنده‌وارانی کورد باری ئه‌م ئه‌رکه‌مانی سووك کرد.

ئه‌وه‌ی شایانی باسه نرخی ناسینی مه‌ستووره‌و نووسینه‌کانی له‌وه‌دایه که له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی ۱۹ هه‌م دا ژنان ته‌نانه‌ت له ئه‌ورووپاش دا مافی دیاری کراویان به خۆیانه‌وه نه‌دیتبوو بگره شۆڕشی مه‌زنی فه‌ره‌نسایش که له مێژووی جیهان و به‌تایبه‌ت له مێژووی ئه‌ورووپادا کارێکی گه‌وره‌ی کردووه‌ته سه‌ر ژیانی کۆمه‌لایه‌تی‌و رامیاری مافێکی ئه‌وتۆی بۆ ژن دیاری‌نه‌کرد. ته‌نانه‌ت ناپلیۆنیش که به داکۆکی‌که‌ری مافی ژنان داده‌نرێ له یادداشته‌کانی‌دا، که له سانت هێلانه نووسیونی به‌م جۆره ده‌رباره‌ی ژن ده‌دوێ: «بۆیه ژنم به پیاو به‌خشی تا به‌به‌ری بێنێ، هه‌روه‌کو داری به‌به‌ر موڵکی باخه‌وانه ژنیش موڵکی پیاوه» له کاتێکدا ئه‌مه بارودۆخی مافی ژنان بووبێ له ئه‌ورووپادا ئه‌ی له رۆژهه‌لاتی موسولمانه‌تی‌دا ئه‌بێ چۆن بووبێ؟ بێ‌گومان له ساکارترین مافی مرۆڤایه‌تی بێبه‌ش بوون و له چوارچێوه‌ی دیواری ماڵ دا زنجیری نه‌ریتی کۆنه‌په‌ره‌ستانه‌ی کۆمه‌لایه‌تی به ده‌ست و پێیانه‌وه ئالابوو، له‌م چه‌رخه‌دا له شارێکی موحافزه‌کاری کوردا که شاری سنه‌یه، ژنه خوێنده‌وارێ وه‌ك مه‌ستووره هه‌لکه‌وێ که ناوی شاعیری‌و نووسه‌ریی له هه‌موو ولاته‌کان دا ده‌نگ بداته‌وه جێی شانازی‌یه بۆ ئه‌و میلله‌ته‌ی که مه‌ستووره‌ی له داوێنی‌دا په‌روه‌راندووه، له لاپه‌ڕه‌یێکی زێرین دا ناوی

لەگەڵ بوێـژان و نووسـەران و ئەدیبانی پایەبەرزی کورددا لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆ تۆماربکرێ.
بۆ ناسینی مەستـووره خانم پێویستـە چەنـد دێرێ دەربارەی ژیانی بدوێین. مامۆستـا عەلائـەددین سەججادی سەبارەت بە مەستووره لە چەند دێرێ بەولاوە لە ژیانی نەدوواوە .
مەستـووره ماهشـەرەف خانمی کچی ئەبولحەسەن بەگ کوری محمد ئاقـا، کچی مامی (صـادق الملك)ە، و هاوسـەری خوسـرەو خانی ناکـام، والیی سنـەیـە. لە تیـرەی بەنـاووبـانگی قادرییـە، لە ساڵی ١٢٢٩دا، لە شاری سنــە لەدایـك بووەو لەسـاڵی ١٢٦٤دا لە شاری سلێمانی بە نەخۆشیی رشانەوە، لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا لە دنیا دەرچووە

بۆ باشتـرنـاسینی شاعیـری بەنـاووبانگ، مەستووره خانم پێویستە دەربـارەی ژیـانو، بەسـەرهـاتی لە نزیکـەوە بدوێین. مامۆستـا عەلائـەددین سەججـادی، وەك وتمـان، لە چەنـد دێـرێبـەولاوە لێی نەدواوە.
رەزا قولیخـانی هیـدایـەت لەبـارەی مەستوورەوە دەڵێ: «مەستوورەی کوردستـانی لە ژنــە نەجیـوە بەنـاووبـانگـەکـانـە. خۆشنـووسێکی دەسـت رەنگـیـن و بەهـرەو ژنـێـکـی جوان و شۆخ و داوێـن پاکـی رەوشت مەردانە بووە» .
میرزا عەلی ئەکبەر صادق الملك بەم جۆرە باسی مەستوورەیکردووە: یەکێـك لە بنـەمـاڵـەکـەمـان ژنێکـە ناوی ماهشەرەف خانمە. نازناوی مەستـوورەیـە. بەراستی، کارێکی بەجێیە مێژوونووسانی گێتی ناوی ئەم ژنــە لەبــەر خوێنــدەواریو خەتخــۆشیو جوانیو شاعیــرێتیو

نووسەرێتی لە لاپەڕەی مێژووی جیهان دا تۆماربکەن   نزیکەی بیست هەزار شیعـــری لە دیـوانــەکـەدا هەبـوو   ، زۆربـەی ئاســاری ئەم خوێنـدەوارە لەنـاوچـووە. ئەوەی بە من گەیشتـووە دیوانێکە کە لە دوو هەزار بەیـت پتـرە ـ هەروا کتێبێکی هەیــە دەربــارەی مێـژووی فەرمـانـڕەوایـانی ئەردەڵان لە سەرەتـای دامـەزرانی ئەم بنـەمـاڵەیەوە تا سەردەمی خۆی تیا نووسیوە

ئەوەی شایانی باسە، ئەو نووسەرانەی دەربارەی مێژووی ئەردەڵان دوواون دانیــان بەوەدا ناوە کەمــەستـــوورە شاعیــر و نووســـەرێکی بەدەســەڵاتی زمانی کوردیو فارسی بووەو جوانیو شۆخ وشەنگیی ئەم ژنـە کوردە هەڵکـەوتـووە ئەوەنـەی ترلـە پلەو پایەی لەناو کوردەواریدا بەرزکـردبـۆوە      . مەستـوورە ئەگـەر شیعری بە کوردی کەمە، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە کاربەدەسـتانی دەوڵەتی ئێران هەوڵیان داوە کە لەغەیری زمــانی فارسی زمــانێکی تر لەســەرتـاســەری ئێـران دا پەرەنـەسێنیو هەوڵیــان داوە کە میــرنشینی ئەردەڵان بە هەمـــوو جۆرێــك لە ژێــر چاودێرییان دا بێت و بە هۆی ژن و ژن خوازییەوەو تەئسیراتی ترەوە مەزهـەبی میـرەکـانی ئەردەڵان بگۆڕن. هەر لەم ڕووەوە ئەڵێن، زمانی ئەدەبیی میـرنشینی ئەردەڵان زمـانی فارسی بووە، تەنانەت نامەنووسین لەنـاو خەڵکا بە فارسی بووە. بێگومان زمانی بێخاوەن و بێدەسەڵاتی سیاسی، نە میری، نە بازرگانی، نە کاسب کاری نە مەزهەب و دین، هیچیان لە نووسینی ڕەسمیو ئەدەبیو زانستدا بە لایەوە ناچن

ئاشکــرایــە ئەگـەر زمـانی فارسی زمـانی ئەدەبیی ئەو سەردەمـە بووبێو لەبــەر چەنــد هۆیێکی تری وەك تەئسیــری دەوروبــەرو پەروەردەبوون مەستوورەیش هەر بەم زمانە تەبعی شاعیرانەی خۆی

دەرخستووەو لەو مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاوداوە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە مەستوورە لە هۆنەنەوەی شیعری کوردیدا دەستی نەبووبێ! شاعیری دوو هەزار دێرە شیعری هەبووبێو شیعری پوختەی کوردیی ئیمرۆکەی بەرچاوکەوێت گومان لەوە ناکات کە دیوانی شیعری بەکوردی هەبووە، بەڵام زوربەی ئەشعاری کوردییەکەی لە ناوچووبن. بۆ زانینی پلەوپایەی شیعری مەستوورە ئەم چەند دێرە شیعرە بە زمانی کوردی لە خوارەوە بە نموونە دەهێنمەوە:

گرفتارم بە نازی چاوەکانی مەستی فەتتانت
برینذارم بە غەمزەی هەردوو چاوو تیری موژگانت
بە تاڵی پەرچەمی ئەگریجەکانت غارەتت کردم
دڵێکم بوو ئەویشت خستە ناو چاهی زەنەخدانت
منیش هاتم بفەرموو بمکوژن بمکەن بە قوربانت
تەشەککور واجبە بۆ من ئەگەر بمرم بە زەخمی تۆ
بەشەرتێ کفنەکەم بدورێ بەتای زولفی پەرێشانت
لە کوشتن گەردنت ئازاد دەکەم خۆ بێتە سەر قەبرم
کە رۆژی جومعە بم نێژی لەلای حەشر زەحمەتی نادەن
ئەگەر وەك من لە ئەم دونیایە سووتابێ لە هیجرانت
هەمیشە سوجدەگاهم خاکی بەردەرگانەکەی تۆیە
رەقیب رووڕەش بێ چوون ناڵێ بگا دەستم بە دامانت
دڵم مەشکێنە چونکو مەخزەنی دەردو غەمی تۆیە
فیدای شەرت و وەفاکەت چی بەسەر هات مەیلی جارانت

ئەتۆ ئەمرۆ لە موڵکی دلبەری‌دا نادیرەی دەهری
بە رەسمی بەندەگی «مەستوورە»وا هاتۆتە دیوانت

بە پێی راگەیاندنی سەرچاوە مێژوویینەکان شاعیرانی کورد لە سەدەی ١٩ هەم دا پەرەیان بە هۆنراوەی شیعری کوردی داوەو نالی‌و سالم و کوردی سەرحەڵقەی ئەم شاعیرانەن. ئاشکرایشە خۆشامەدی‌کردنی کۆمەڵگەی کوردزمان، لە شیعری کوردی گەیشتە رادەیەك کە ئەگەر لەمەوپێش شاعیری کورد لە ئالقەی پیاوان دا کەم بوون دواتر ئافرەتی کوردیش بوونە شیعربێژ، ماهشەرەف خانم ئەم حیسابەی بۆ بکرێ کە دیارە ئەویش لە بلەی پەیدابوونی هەڵبەستی کوردی‌دا بووەتەبوێژو شیعری کوردیشی هەیە . ئەوەی سەرنج رادەکێشێ کاتێ شیعرەکانی بە فارسی دەخوێنی‌یەوە یەکسەر بۆت دەردەکەوێ کە مەستوورە هەروا شاعیرێکی ساکار نی‌یە، بەڵکو جێگای خۆی لە ریزی پێشەوەی هۆنەرانی چەرخی ١٩ هەم دا بەناوبانگەوە گرتووە، تەنانەت شانی لە شانی کەڵە شاعیرانی سەردەمی خۆی داوەو لە هەموو بابەتێکی شیعردا خۆی لەگەڵیان دا تاقی کردۆتەوە. جگە لەمە وەك هەموو خوێندەوارێکی ئەو سەردەمەی خۆی شارەزایی‌یەکی چاکی لە شەریعەت و بیروبروای ئایینی‌دا پەیداکردووەو لەم بابەتانەدا نامیلکەو کتێبیشی داناوە

د. حەسەن جاف

# به ناوی خودای بەخشندەو دلۆڤان

سوپاس شایانی خوداییکە لە کەس نەبووەو نامرێ، هەر دەمینێو لە نەمان نایە. ئەفرانکارێکی لە پاکیدا بێهاوتا، رۆزیدەرێکی لە هەمـوو ئاکـارێکیدا تاك و تەنهـا. «سبحـان الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا احد» هەبوویێکە سەرپەنجە لە روون کردنەوەی سوپـاسیدا لاڵ ،پـەرستـراوێکە خامەو زمان لە سوپاس نووسینیدا شەرمـەزارە ،ئـارایشـتی روخـسـاری ئاخـاوتـن ، لە پەسن و پێداهـەڵگـوتنی ئەوە، رازانـدنـەوەی ئەگـریجەی قسان بە پەرستنی ئەوە. چامـەیێ شایستـەی سوپـاسی ئەوبێ بە بیـرێ هیچ کەسێکدا نەهـاتـووە، زمـانی هیـچ خاوەن هۆش و بیرێ بە هیچ هەڵبەستێ، شیـاوی سوپـاسی ئەو بێ هەڵنـەهـاتـووە، ئاوەزی بە ئاوەزان لە ستایشیدا گێژو سەراسیمە، بەهرەی بەهرەمەندان لە پێداهەڵدانیدا پەشێـوو سەرگـەردان، دێـاچـەی بەرەبـەیـان لە پرتـەوی نووری حەزرەتی خۆیـەتی، تیشکی سەردێـری ئەوین لە رۆشنـایـی گەشی پێشـەنگی روخسـاریـەتی «الله نور السمـوات والارض مثـل نوره كمشكاة فيها مصباح، المصباح في زجاجة».

به هەستی پەست و نزمـەوە دەم لە وەسپ و ناکـارگێـڕانـەوەی کارێکی بێجێو ناشـایـانـەو بەم هەستـە پەستـەمان پەسن و ستایش وەهم و خەیاڵە، پەسن و وەسپی بە ترازووی هۆش هەڵ ناسەنگێو ناساندنی لە بنچینەی بیردا ناگونجێ، «سبحانك لا أحصي عليك ثناءا انت كما اثنيت على نفسك، فلك الحمد حتى ترضى، ولك الشكر حتى رضيت»

هەڵبەست

که وەسپی ئەو بەگوتن دوایی نایێ

ئەوە چاکە زمان لەمەلاشوودا بمایێ

دروودی بێ پایان بۆ یەکەم بەری خامەی توان، بنچینەی بنەماڵەی پەیامبەری، هۆی داهێنانی هەردوو گەردوون و شاسواری مەیدانی هەردوو دنیای جنۆکەو ئینسان، گەورەییکی ئەگەر لەبەر بوونی ئەو نەبوایە هیچ بووێك نەدەبوو، بە کام گەیشتوویێکی ئەگەر مەبەست لە ئەفراندنی دنیا زاتی بەختەوەری ئەو نەبوایە، خامەی چارەنووس هیـچ ئەفـرانـدەیێکی لەسـەر تاتی توانی بۆ نەدەنـووسی، هۆی ئەفراندنی دایکە حەواو باوکە ئادەم، مایەی گووراندنی تات و خامە هەر ئەوە «لولاك لولاك لما خلقت الجن والانس والافلاك»

هەڵبەست:

محمد شەهەنشایی دنیاو دین

شەفیعی گوناهـ شافیعی مورنیبین

اللهم صل على رسوله المبشر وآله المكرم المطهر.

ئەوجـا لە پاشـان منی هەژاری هیـچ، مەستـوورەی ئازاد، کیـژی خودالێخـۆشبـوو ئەبـولحـەسەن بەگ و نەوەی نیهادپاکی موحەممەد

ئاغای کوردستانیم ،خودا گلی گۆریان پرگولاوکا، عەرزی زانایانی بەدەم وپل و بەهرەمەندانی هونەرفرەوانان دەکەم، پاش ئەوەی لە سای لاسامەی سەرریزی خودای لە هەمووشتێ هەورازترو لە پەنای بەزەیی و میهرەبانیی داوەری بێهاوتا ،لە زگی دایکمەوە کەوتمە باوەشی پەروەردەی باوکمەوەو، نیوە شیعر : رەحمەت لەو گۆرە پاکەی ـ لە فەری نەجیبی نیوچاوانی بەهرەو هێزی بینای بەخشندەگی و لە بەرەکەتی ئەو ئەختەری چلەپۆپەی زانست و خۆری گەردوونی ئاوەزە کە مەیلی سروشتی و شەوقی راستەقانیی لە پەروەردەکردنی منداڵان و بەهێزکردنی جگەرگۆشان دا زۆر بوو، بە تایبەت منی یەکەم گوڵی ئەو گوڵشەنەو نوخشە تەمامی ئەو چەمەنە کە دەستم خامەی ئاشنایی گرت و چاوم بە نامەی رۆشنایی هەڵێنا، ناوبەناو مەیلی سروشتیم و ئارەزووی زگماکم بە متالای کتێبان دەبزووت، تا رۆژێکیان رێم کەوتە دیوانەکانی پێشینان و تۆمارو بەیازی پاشینان مێژوویێکم لە کوردان و دەستاوێژێکم لە نیشتمانەکەم بەرچاوکەوت.

پاش متالاو دوای نامە گۆرینەوە، تەماشام کردو خوێندیشمەوە کە شەرحێکیان لەمەر چۆنیەتی حاڵ وباڵی فەرمانرەوایانی وڵاتی کوردستان (١)نووسیوە.
ئەگەرچی بە دووردودرێژی نووسراون، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە کورتەیێك لەمانەی ماونەوە دوری ئەسمراو بوو، منی کەمینە کە کەمترین دارخورمای گوڵشەنی ئەم گوڵزارە وەك لیرەم بنیات نراوە، پشتاوپشت تەمامی سایە پەروەری ئەم بنەماڵەیەم و ئێستا بەزنی

بەهرەم بە زێوەری چەندین پشت لەگەڵ ئەو زنجیرە پایە بڵیندەدا ڕازاندوێتەوەو بە سەر قەڵاندوشکانی شانازیی بە بەزەکی هاوپێوەندی لەگەڵ ئەو بنەماڵە ستایشت کراوە دا ڕازاندراومەوەو بە سروشتی بڵێسەدارو زەینی ڕەخنەگرانەوە بە دووی درێژەپێدانەوە چوونم بە پێویست زانی‌و پەرژامە سەر نووسینی ئەم چەند دێرەو دەنگ و باسی پاشەڕۆژ بە خێرو خۆشی‌و بەختەوەری گوزەرێنی زنجیرەی پایەبڵێندی بەنی ئەردەڵانم بە بەشێك کە لە مێژووم هەڵێنجاوەو لە پێشینانم بیستووەو بەرچاوی منی کەمینە کەوتووە، لەم نوسخەیەدا ڕوون کردوێتەوەو لە خوێنەرەوە چاوڕوانی نزای چاکەم.

## لەمەڕ بنەچەکەی بابا ئەردەڵان

ئەگەرچی لەمەڕ ڕوون کردنەوەی بنەچەکەیان دا کێشەیێکی بەربڵاو هەیەو بەشێکی کە لە ماکی بنەچەکەی ئەو زنجیرە پایەبڵێندە پشتی پێ‌دەبەسترێ ئەوەیە کە:

ڕۆژگارێکی زوحاکی ناپاك لە سۆنگەی دڵپیسی ئەهریمەنی‌و هانەهانەی خواستی دەروونی، سەرپێچیی لە گوێڕایەڵیی خودای گەورەو لە هەمووشت سەرووتر کردو دەبدەبەی یاخی‌بوونی لە سەرانسەری دنیادا دەنگی دایەوە، لە تۆڵەی ئەو کردارەی دوو پارچە گۆشت، وەکو حەزیا لەسەر شانی ئەو شۆفارە نەگریسە دەڕوێ‌و لە ڕادەبەدەر ئێش وئازاری ئەو نموونەی شۆفارییە دەدەن ئیبلیسی نەحلەتی دەچێتە کلێشەی حەکیمێکی بەبەزەیی‌یەوە کە گوایە چارەسەری دەردی بێ دەرمانی ئەم سپلەی پێ‌دینە بە لای ئەوەوەیە،

دەڵێ دامـرکـاندنـەوەی نەوس و ئاڵهـای ئەم حەزیـایـە لە مێشکی سەری مـرۆ دابین دەکـرێ، یەکسـەر بۆ ئەزمـوون و تاقیکـردنـەوە سەری کابرایێك لە لەشی جوێدەکرێتەوە، مێشکی ئەو بێگوناهە زۆرلێکـراوە دەکـرێ بە هەتـوانی ئەو دوو مارەو مارگـەلی تایـەن دەسـرەون. هەنـگـی بریـاردەدرێ هەمـوو رۆژێ دوو کەس لە بێگوناهان بەردەوام بە ئاشپەزی ئەو خوێنخۆرە شۆفارە بسپێردرێو مێشـکیـان بکـرێ بە خۆراکـی ئەو دوو مارە. لەبـەر ئەوەی کە ئاشپەزی ئەو درندەیە لاوێکی بە ئاکارو پەسند دەبێ هەموو رۆژێ لاوێـکی لە کوتی مەرگ لەوان رەهـادەکـردو مەرێکی لە بری وی سەردەبریو مێشکی لەگەڵ مێشکی ئەو لاوەدا تێکەڵ دەکردو پێشانی دەدا.

ئەوانەی لە تێغی زۆرداری رزگاربیوون لەترس و سامی زوحاکی ناپـاك و چەپـەڵ بە شەوی تاریـك و ئەنگـوست لە چاو رووبـان لە دونـدو ترۆپکی کەژوکێـوو لاچـەپ و کەلاوەو بیـابـان و کۆسـارانی سەخت و دژوار دەکردو لەو شوێنانە خۆیان حەشار دەداو رۆژگارو ساڵان و چەرخ و چاخی دوورودرێژیان بەو ئاوایە دەگوزەراند.

قسەی بەناووبانگ ئەوەیە کە یەك لەوان نێوی کورد بووە، پاش زاوزێ و ژن وژن خوازی، کوردان سەرتـوێیـان لەو نیهـاد پاکـە سروشت خاوێنـە کەوتـوونەوە (٢). لە گەورەگەوران و کەڵەپیاوانی ئەو هۆزە مەزنە چوار تیرە هاتوونە گۆرێ: یەکەم و هەرە مەزنیان تیرەی گەورەی بەنی ئەردەلانە کە لەگەڵ سەرتۆپی هۆزو تیرەکانی کورددا، لە خووورەوشت و گەورەییو خوێنـدەواریو کەڵـەمێردیو جوامێـریو دەهنـدەییو دەست بڵاویدا دەسکیـان لەدوو ناکـرێو

کەس بە تۆزی قولـەپێـان دا ناگـا. خۆیـان بە سایـەچـەوری سەرلەبەری هۆزو تیرەکان زانیوەو دەزانن. دووەمیان تیرەی لوڕ، کە لە لوڕستـان هێـوریـون و هێندێکیان فەرمانڕەوان. سێیەمیان تیرەی کرماجە (٣) کە بە دەماودەم و لە نێو ڕەشەخەڵکان بە بابان نێویان ڕۆیشتووە. چوارەمیان تیرەی گۆرانە (٤) کە ئێستاکانێ لە کرماشان نیشتـەجێن و کۆرەکـورەی ئازاو دلێـریـان لێ‌هەڵکەوتوون و هەمیشە کەڵـەوەکێشیو سەرپێچیـان لە زۆرینـەی فەرمـانـڕەوایان کردووەو سەریـان بۆ کەس دانـەنـەوانـدووە. بەڵام زۆربـەی پێشینـان لەو بروایـەدان و پشتیـان بەوە بەستـووە کە زنجیـرەی پایـەبلینـدی بەنی‌ئەردەڵان لە ڕەچەڵەك دا دەگەنەوە ئەردەشیری بابەکان و(٥) بە گەڕوخـولی ڕۆژگـار بەرەو وڵاتی شام (٦) داکشیـون و لەوێـیـان بەسـەر بردووەو لە سەروبـەنـدی ئیمـام جەسـەنی موجتەبادا (د) بە فەرمـانی ئیمـامی سەردەم بە فەرمـانـڕەوایی ئەیـالـەتی کوردستـان سەرفرازبووە وئیتر لەو سەردەمانە بەدواوە تەنها تا ئێستاکە، کە سالی ١٢٦٢ی کۆچیـیە، لەم دەوروبـەرانـەدا لە پیـرۆزیی دەستەوداوێن بوونی دەروونیی ئەو سەروەرە پشتـاوپشت دەبن بە فەرمـانـڕەواو حوکمران. بۆ ڕاستیی ئەم قسەیەیش ئەو گوستیلکە ئاقیقەیە کە بە خەتی کووفی لە سەری هەڵکەندراوەو بە ناوی پیرۆزیو موفەرکەوە لەو سەروەرە پایـەبـەرزە بە دەستـی بابـا ئەردەڵان گەیشتـووەو تا ئێستـایش بە دەست بنـەمـاڵـەی شان و شکـۆداری ئەردەڵانـەوە ماوەتـەوە، خودا دەوڵـەت و شەوکـەتیـان تا ڕۆژی قیـامـەت هەر پایەدارکا. لە کتێبێکی مێژوودا کە مەلا موحەممەدی شەریفی قازیی ئەردەڵان دایـنـاوەو لە نوسخـەیـەکیش دا کە هی خودالێ‌خـۆشبـوو

خوسرەو بەگی کوری موحەممەد بەگی ئەردەلانە، دەربارەی ئەم بەشە، نووکی قەلەم وای ڕوون کردۆتەوە کە سەرەتای دەولەت و فەرمانرەوایی ئەم بنەمالەیە لە سەردەمی حوکمرانیی چەنگیزخانی یەکان دا، لە هەریمی موسل و دیاربەکرو ئەو دەوروبەرانە بووە. بە گەروخولی ڕۆژگارو ڕووداوی ئاسمانی بابا ئەردەلان لە هۆزو خێلەکانی خۆی دوورکەوتۆتەوەو بەرەو ڕووکاری شارەزوور هەل کشیوە. پاش ئەوەی کە لە سایەی فەری خودای دادگەرو بە یارای بەهرەو توان و لێ هاتوویی‌و یارمەتیی بەخت لەو ناوچەو هەریمانەدا سەربەخۆیی وەدەست هیناوەو بووە بە فەرمانرەواو ماوەیێکیش بە سەر پالنگان راگەیشتووەو لەو شوینەدا کە مولکەی کوردی گۆران بووە، فەرمانرەوایی کردووە.

لە ئاخروئۆخری دەسەلاتداریتیی چەنگیزی یەکان دا، لە سای ئازایەتی‌و نیهادپاکی خۆیەوە توانی کۆیەو هەریرو شارەزوورو بابان بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی‌و سالانی سال بەشی زۆری کوردستانی بە دەستەوە بێ.

دەگێرنەوە: ئەمیر تەیمووری گورگانی فەرمانرەوایی کوردستانی جار لە دوای جار بەرەورووی بابا ئەردەلان کردۆتەوە. بەلام ئەقلی بێخەوش و چێژو سەلیقەی ڕاست ئەم قسەیە ناسەلمێنێ، چونکە سەردەمی فەرمانرەوایی چەنگیزخانی‌یەکان تا سەردەمی دەسەلات و توانی ئەمیر تەیمووری گورگانی ماوەیێکی دوورودرێژەو لەگەل ئەم قسەیەدا ڕێك ناکەوێ. خودا هەر خۆی لە ڕاستیی هەموو شتێ ئاگادارە.

# فەرمانرەوایی بابا ئەردەلان

بابا ئەردەلان [٧] ئەمیرێکی بیروبڕواپاك و نیهادخاوێن و خودانێکی سروشت چاك و باوەڕپتەو بووە، سەرلەبەری کاتی خۆی بە خوداپەرستی بەسەربردووەو هەرگیز هەڵپەی کاری دزێوو ناپەسندی نەداوە. وڵات لە سایەی دادیدا ئاوەدان، خەڵك لە دەهندەیی و مەردایەتیی شادمان، لەنێو ڕەشەخەڵکان دا بە گەورەو ئاکارچاك بەناوبانگ، وێرای دەسەڵاتداری، سەرپێچیی لە دەستوورو گوێیەفەرمانیی کردگار نەکردووەو هەرگیز دەورو خولی کاری گەنی نەداوە. چەندین ساڵ لە ناوچەکانی کوردستان دا خۆی بە حوکمڕانییەوە سەرقاڵ کردووەو سەرەنجام شەربەتی مەرگی بە دەستی ساقیی ڕۆژی خۆی نۆشیوەو ڕەخشی بەرەو ئاخیرەت ئاو داوە. فەرمان هەر هی خودا خۆیەتیو هەموو بەرەو ڕووی ئەو دەبینەوە.

## فەرمانڕەواییی کلۆڵی بەنی ئەردەڵان

پاش مردنی بابا ئەردەڵان کلوڵی کوری چووە سەر تەختی فەرمانرەوایی دام ودەزگای ستەم و زۆرداریی لە قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی پێچایەوە. تەلاری داد لە سایەی ئەوەوە دامەزرا، بناخەی دەهندەیی لە پەنای بەختەوەرییەوەی پایەدار، سێبەری میهرەبانیی بەسەر خەڵکەوە سەیوان، هومای بەزەیی بوو بە چەلەنگی سێبەری خەڵک و خوا، سەرتۆپی تێکرای خەڵک شادمانی داستانی دیداری، سەرلەبەری مەردوم بە هەوبای خزمەتی، دەستی بە تەنگەوەهاتنی دەرەووی هەموو چاولەدەست بوونێکی بەستووەو لەفرەیی دەهندەییو دەس بڵاویی‌دا سەر پاکی نیازمەندانی لە کۆتی دەسکورتی رزگار کردووە، سەروەرێکی بەخشندەو دڵاوا، دادگەرێکی سەرراست بوو. لە نەریت و داوودەستووری باووباپیرانی‌دا گوێی گرەوی بردۆتەوەو هەرگیز خۆی لە قەرەی کردەوەی ناشایشتەو ناپەسەند نەداوە، یاساو دەستووری وڵاتداری لە سای ئەوەوە پایە ئەستوور، بنکەی کرداری پەسەندو شایان لە هیممەتیەوە پایەدار. چەندین ساڵ بەم تەرزو ئاوایە وڵاتداری کردووەو سەرەنجام بە پێی وتەی خودای گەورەو مەزن «کل نفس ذائقة الموت» بەرەو بەهەشتی بەرین چووەو لە پەنای کاروئاکاری چاکی خۆی‌دا گیانی بە نەمری شاد بووە.

## سەرداریتیی خدری کوڕی کلۆڵ

پاش مردنی باوك خدری كوڕی چووه سەر تەختی حوكمرانی. دەرکی دووزمانیو ئاژاوەگێریو چەپەڵکاریی لە رووی ژێردەستانی خۆی پێوەدا، میرێکی پاوەخێرو پاتشایێکی دەسبڵاوو دڵاوابووە. رێگــای باووپیـرانی گرتـوتـەبـەرو خودانێکی بەخشنـدەو دادگـەرو بەپەرۆش بووە، هەمیشە هاودەمەکانی زاناو خاوەن بەهرە بوون. لە دژ زۆردارو ئاکـارپیـســان بە رك و کینـە، ژێـردەستـان لە سای چاوێرییەوەی کامەران بوون. گەورەو بچووك لە فەری پەرۆشی شادمان، لە چەسپاندنی بناخەی دادبڵاوکردنەوەو خێڵ پەروەریدا بێمــاتــەنــد، لە کاروبساری ولاتـداریدا خاوەن راوتـەگبیـر، لە رێورەسمی دادگــەریدا پەیـرەوی فەرمـانـرەوایـانی پێشـووی، ژێـردەستـانی لە کردەوەی جوانیدا سپـاس گوزارو رەزامەند. لە پاش ماوەیێك فەرمانرەوایی، لەدنیای بۆکەس نەماوە رەخشی بەرەو کۆشکی هەتاهەتایی تاو داوە.

# فەرمانڕەوایی ئەلیاس کوڕی خدر

کاتێکی خدر ڕۆژی دوایی هاتووە، ئەلیاسی کوڕی لەسەر
بالیفی ولاتداری پالی داوەتەوەو بە شێوەی دادگەری ڕازاوەتەوەو بە
زێوەری بەخشندەیی‌و دەهندەیی‌و نیهادپاکی ئارایشت دراوە. بە
خاوەن ویژدان بەنامێ ،خێرەومەند لە نێوان خەلك وخوادا، لە ناو
سەروەران دا بەرەوشت بەرزی ناسراو. پایەبلیندان و ناسراوانی
ولات لە هیممەت بلێندی‌و سروشت خاوێنی ئەو شانازی‌یان
دەکردو بەردەوام لە پێناوی بەدادگەیشتن و دادخوازی‌دا خاوەن
ڕەفتاری بەرزو ئاکاری پەسند. لە فرەبەخشندەیی ئەودا حاتەمی
تەی باروبنەی پێچاوەتەوە. هەیت وهوونی شان و شکۆی گالتەی بە
دەبدەبەی جەم وکەی کردووە ،لە خۆش گوزەرانی سپایی‌و
ژێردەستانی‌دا گەیوەتە ئەوپەڕی‌و چاوی لە خەیانەتکاری‌یان
پۆشیوە. لە برەوپێدانی شەریعەتی پاك دا تاك و لە ڕێ‌ورەسمی
ولاتداری‌دا خاوەن بیرو فرەزان. بە کرداری شاهان و ئاکام خێر
پاشماوەی ژیانی پێچایەوەو بەرەو باخاتی ڕەزەوان بەرێ‌کەوت. (بەر
بەزەیی خودا کەوێ).

## لەبارەی خدری دووەمی کوڕی ئەلیاسەوە

ئەویش لەسەر ڕەوشتی باووباپیرانی سەردەمی خۆی بە ئارامیو بێئـاژاوەو هەرا، بە هێـزو توانـەوە بەسـەربـردووە، هەمیشە لەگەڵ خاوەن هۆش هاونشین و هاودەم. لەسـەروبـەنـدی میـرایـەتییدا سەربەخۆییکی تەواو بووەو دەسەڵاتێکی بێچەندوچوونی هەبووە. فەرمـانـڕەواییکی سەردەم پیـرۆزو پاتشـاییکی ئاکـاربـەفەڕ، ستەم و زۆرداریی لەسەروبەندی فەرمانڕەوییدا بچووك وەك ئیکسیر، بە زێوەری ئەقڵ ڕازاوە، نیشانەی زۆرزانیی لە ڕەنگە ورووی دیاری، دنیساو هەرچییـەکی تیـدایـە لەکن وەك با بووە، گەورەو بچـوك بە بوونی دڵخۆش وشاد بوون. سەرڕای ئەم هەموو دادە بە پێی ئایەتی «کـل شيء هالـك الا وجهـه» ماڵاوایی لە دنیـای فانی کردووەو ڕێگای مەرگی وەبەرگرتووە.

# لەبارەی فەرمانڕەوایی حەسەن
# کوڕی خدری دووەمەوە

دوای کۆچی دوایی باوکی ، ئەو پاتشا دادکەرە بە پلەکانەی پایەبڵیندی‌دا بەرەو سەروو هەنگاوی هەڵێناوەو دەرووی چاکەو نوازشتی لە ڕووی خەڵك کردوتەوە . دەگێرنەوە : میرێکی نیهادپاك و ئاکارپەسند بوو، نێوو نیورۆك لێك جووت بوون . لە ڕێوڕەسمی فەرمانرەوایی‌دا، لە فەرمانرەوایانی پێشووی لەبەرتر بوو. لەبەر ئەوەی لاوێکی خاوەن ڕاوتەگبیر و قسەزانێکی بێ‌هاوتا بوو، لە داوودەستووری باووباپیرانی بستێ نەترازا . لە خێروخۆشی بۆ ژێردەستان فەراهەم کردن دا هێندەی چاو بترووکێنی ئۆقرەی نەدەگرت . هەرکەسەی بە پێی پلەو پایەی خۆی ڕێزلێ‌دەناو هەموو کەسێکی بە پێودانی لێوەشاوەیی خۆی سەربەرز دەکرد، هەرگیز مەیلی بە لای گوناهـ و خراپەدا نەدەبزووت و دەرگای ڕابواردنی لە ڕووی خۆی نەدەکردەوە . ئاشقە خوداپەرستی بووو زۆر بە پەرۆشی ئەوەوە بوو کە مل کەچی پەروەردگاربێ . بەراستبێژی‌و کردارپاکی ناسرابوو، ناووبانگی دادگەریی بە گوێی دوورو نزیك گەییوو . لە داوودەستووری ئازایەتی‌دا تاك و تەنیاو لە ڕەوشتی جوامێری‌دا بێ هاوتا بوو . سەرەنجام لەم دنیا باروبنەی بۆ ئەو دنیا

پێچایەوەو فەرمانی دادگەری بێهاوتای بەجێ هێنا.

هەڵبەست

سەرپێچی لە کەسێ ناکەم دۆستی خۆش بوێ
ئەوەی ئەوی خۆش دەوێ خۆشم دەوێ
ذلك تقدير العزيز العليم

## لەمەڕ دادگەریی بابلوولی کوڕی حەسەن

دەگێــرنــەوە بابلوولل لاوێکی جوان خاسی بە زێــوەری دلێــڕی ڕازا بۆوە زۆربــەی گەنجینــەو دراوی باووبــاپیری بە ژێردەستان و پایەبڵیندان و پیاوماقوولان بەخشیوە. کاو کێوی لەپێش چاو وەك یەك بوون. زۆر جاران لەشکــری هەڵــدەکــردە سەر یاخیو سەرپێچانی دەوڵەت و بە سەرکەوتوویی دەگەڕایەوە. خەڵکیوڵات و میرەکان لە بەرەکــەتی هیمــەت وســام و شکــۆیــەوە لەتــرس و هیــوادا دەژیــان. سەروەرێکی دانــاو دادگــەرێکی بەفــەرو هونــەرو توانــا بوو. لە دەسبــڵاویو دڵاوایی‌دا دەبــدەبــەو ناووبــانگی لەمــەعنی شەیــانی تێپــەڕانــدبــوو، لەدەهنــدەییو سەخاوەت دا گۆی گرەوی لە یەحیاو جەعفەری دووەم بردبۆوە. لەناو بێشەی هیچ وپووچان نەڕەشێر و لە مەیدانی شەڕدا شمشێری تیژی بوراو لە مەردایەتیو ئازایەتی‌دا لە سەرانسەری وڵات دا، بەناووبانگ و لە دادگەری‌دا دنیا بە تاسەی دیــداریــەوە بوو. چون ماوەیێکی بەڕاپــاکیو نیهادخاوێنی بەسەربرد مەرگ بەرۆکی گرت و گیانی پاکی بۆ بەهەشت ڕەوانەکرد.

# چیرۆکی سەروە رایەتیی
# مونزیری کوڕی بابلوولە

دوای مردنی باوك جەنابی مونزیر بە سەرکەوتوویی وبەختەوەری‌یەوە تەختی میرایەتیی بەخوێ ڕازاندەوەو فەرودادی بە دنیا بەخشی خەڵکی وڵات و سەرسنوور و دەوروبەر ،کەمەری خزمەتیان بۆ بەست و بوگوێڕایەڵیی ئەو وگەورەیە بەگیانوبەدل ئامادەبوون. گەورەپیاوان لەهەموو گۆشەو کەنارێکەوە بە ناردنی دیاری‌و شتی گرانبایی‌و موژدەو شادی دەربڕین دەستی خزمەتیان درێژ کردو میرو لێ پرسراوان بە پێشکێشی شایان بەخزمەتی شەرفمەند بوون و ڕوویان لە هاسانەی کردو ئەویش بە خەڵاتی گرانبەهاوەی بەڕێ کردن . سەبارەت بەوە کە زۆر سەرگران و دووربین بوو لە داوودەستووری گەورەیی‌دا لە باووباپیرانی لەپێشترو تەنها نیهادخاوێنێك بوو، وڵات لەسای دادی‌دا ئێکجار ئاوەدان خەڵك لە بیروباوە کی‌دا ، لە ڕادەبەدەر، ڕەزامەندو سوپا سگوزاربوون .

لەڕێ‌و ڕەسمی ئازایەتی لە ڕادەبەدەروکەلەمێردی‌دا بێ‌هاوتاولە شێوەی کۆڵ نەدان دا کەس شانی لەشان نەدەدا .

گەورەو مەزنان زۆر بە دڵەوەی گوێ بەفەرمان بوون . چاك و خراپ لە سروشت پاکیی شادو کامەوان ،لەسایەی دادی‌دا مەڕو

گورگ پێکەوەیان ئاودەخواردەوە لەسای نوازشتیدا بازو مەلیچك هاورێ بوون.

پاش ماوەیێك لە حوکمرانی ،کاتێکی ڕۆژی دوایی هات و نیشانەیمەرگی لە خۆدا بەدیکرد، مەئموون بەگی کوڕی کرد بە جێنشینی خۆیو ئەو پایە بەرزەی سەرفرازکرد. دوای ماوەیێ مەلیچکی گیانی بەرەو بەهەشتی بەرین هەڵفڕیو لەگەڵ ڕەوشت و ئاکاری خۆدا سەری ئاسایشتی نایەوە.

## لەمەڕ فەرمانڕەوایی مەئموون بەگی کوڕی مونزیر

بەیەغبالبەختەوەرو بە ئەستێرە بەرز و بەسەردەم وکات سەرکەوتوو و ئەختەری پیرۆزی بووکی فەرمانڕەوایی لە باوەش گرتووەو نازەنینی حوکمرانیی لە تەنیشتی خۆیەوە داناوەو وڵاتی لە چەپەڵی دژمنان خاوێن کردۆتەوەو یاخییانی لە ناوبردووەو خۆشەویستانی دەوڵەت لە دیداری شادمان و هاورێو هاودەمانی لەپیرۆزیی هیمەتی بڵیندی کامرەواو کامەران و ئاوازەی دەسبڵاویی، دنیای سەرلەبەر تەنیبۆوەو دەبدەبەی دەهندەییو دڵاوایی لە گوێی لاوویران دەزرینگایەوەو تێخی ئاوداری کوشندەی گیانی ڕۆستەم و ئەسفەندیار و تیری پڕیشك هاوێژی لەتکەری گیانی دژمنی نالەبار. لەشێوەی زانست و زانیاری دا لەباووباپیرانی گەورەو مەزنی بە بەهرەتر بووو لە ئایینی سەرگرانیو بوردەباریو ژیریدا لەهەموان

بەشـــدارتـــربـــوو . سپـــاهی‌یـانی پیٚ پشت ئەستـوورو لە سایـەی سەرریٚژی‌یەوە موژدەپیٚدراوو گەورەو بچووك بەرماوخوٚری خوانی و بریکارانی‌و تاجیك لە دوویەوە وشووچنی خەرمانی شەوکەتین و لە رۆژگاری کوٚنەوە کاری چاك و کردەوەی پەسندی زۆری بە یادگار لیٚ‌بەجیٚ‌ماون و بەسەر زۆربەی ولاٚتی باوکی راگەیشتووەوسەرپیٚچی لە فەرمانی نەکردووەو وردودرشت گویٚ رایەل و گویٚ بەفەرمانی بوون .

پاش ئەوەی ماوەی سی‌و دووســـالی خشـتی لە حوکـمـــرانی پشتاوپشت بوٚ بەجیٚ‌ماوی بەوپەری سەربەخوٚیی‌یەوە بەسەربردووەو ریٚـگـــای راستی‌و بیـــروبـــروا خاوینی‌و گەورەیی گرتـــوٚتـــەبـــەرو گەورەپیاوان و کەلەکەلەی ولاٚتی لە خزمەتی خوٚی کوٚکردووەتەوە بە زمانی گەوهەرباری فەرموویەتی: وا کاتی کوٚچی‌دوایـیم لەم دنیایە نزیك بووەتەوەو دەستی چارەنووس بەروٚکی گرتووم ،ئاواتم ئەمەیەو ئارەزووم ئەوەیـە، ژیٚـردەستـان کە ئامـانەتی پەروەردگارن، پیٚویستە بەخوٚش گوزەرانی‌و سەرئاسوودەیی بژین و لە چەرمەسەریٚی رۆژگار قوتـاربن و لە بشیٚـوی‌و ئاژاوە بە دووربن .لـەبـەر ئەوە چاکتـر وایە ولاٚت لەنیٚوان کورەکانم دا دابەش کەین . بوٚ ئەوەی لەپاش ئیٚمە بیٚ ناکـــوٚکـــی‌و دووبـــەرەکـــی هەریـــەکـــە بە کاروبـــاری رەعیـــەت پەروەری‌یـــەوە خەریـك بیٚ‌و هەرکـەسـە بە ریٚ‌وورەسمی دادپەروەریی ژیٚردەستانی خوٚی سوپاس گوزارکاو ستەم لیٚ‌کراوان نەبـن بەپیٚشیٚلی ئاشـــووب و ئاکـــارپیسی‌و دانیشـتـــوان بە ستـــەم و کیٚشەوبەرە لەناونەچن. دانشوەران وایان بەچاك زانی ئەیالەتەکانیان بەم شیٚـوەیـە بەسـەر کورەکـانی‌دا دابـەش بکـا. ژیٚـردەستـانیـان بە

ئامـانـەتـی بەم جۆرە پێ سپـاردن. چونکـە بیکـە بەگ، کە کورەگەورەی یاوك بووو لە هەموو کورەکانی ژیرترو لە پێشتر بوو، ناوچـەکـانی زەڵم و گوڵعـەنبـەرو شەمیـران و هاوارو دووران و ئەوســووی بەفـەرمـانـرەوایی پێ سپێـردران و سورخاب بەگی کورە ناوەنجیی بوو بە فەرمانرەوای (نوی)و مەریوان و تەنوورەو ئەورامان و میهرەیان و کلۆکلاس، بە وتەیێکی‌تر کلاشیش و نەشکاشیشی پێ شسپێردران کەئەمولاتانە هەنـدێکیـان ئەمروکە روون نین. بـەلام بە پێی کتێبـەکەی خوسرەو بەگ و شەریفی قازی، وەك مێـژوونـووسـان نووسیـویـانـە ئێمـەیش هەر بەو جۆرەمـان نووسین. سروچـك و قەرەداغ و ئالان و شارەزووری بە محـمــد بەگی کورە گچـکــەی سپارد. پاش دابەش کردنی ولات بەسەر کورەکانی‌دا ماوەیێکی تر بە کاروبـاری دادگـەری و ژێـردەست پەروەی‌یـەوە خەریـك بووەو دەبدەبەی نێووبانگە چاکێتیی لە سەرانـەری دنیادا دەنگی دایەوە. لەبــەر ئەوەی میـرێکی دادگـەرو کیشـوەرگیـرێکی دادپـەروەر بوو، زنجیرەی بەنی ئەردەلان تا ئەمرۆکە بە ناوی ناووبانگی ئەوەوە، بە «مأمونی» ناویان رۆیشتووە. سەرەنجام بانگی «کل من علیها فان »ی‌بــە گوێی گیـان بیست و مردنی بەجێ‌هێنـا. رەحمـەت لەو گۆرە پاکەی بێ.

# لەبارەی سەربەخۆیی بیگە بەگەوە

پاش مردنی باوك کورەکانی هەریەکە بە پێی وەسیەتی باوکیان بوو بە فەرمانرەوای ناوچەیێ . بیگەبەگ تەمەنی لە براکانی تری زیاتر بووو لەوان پایەبلێند تر بوو، تێکرا بەگەورەو دەمراستی خۆیان هەلبژاردو کەمەری خۆبەبچووك زانیو گوێبەفەرمانیان بۆ بەست و هەریەکە لە سنووری قەلـەمرەوی خۆیدا خەریکی کاروباری رەعیەت پەروەری خۆی بووو رێ ورەسمی گرتەبەرو لە راستەرێی باووباپیری خۆی لای نەدا. ئاوازەی رەوشت چاکیی بە بەدکاری نەدۆراندووە، ولات لە دادی ئاوەدان بووە. لەبەخشندەییو دلاوایی‌دا ژێردەستانی پێخۆشحال و شادمان بوون. هەمیشە بۆ رەزامەندیی بیگەبەگی براگەورەیان تێکۆشیون و مافی خۆبەبچووك زانینیان هەرگیز لەبیرنەکردووە. بیگەبەگیش بەش بەحالی خۆی پێداویستی گەورەیی خۆی لە راستیان نوواندووەو هەرگیز بە پێچەوانەی بیر.ورای ئەوانەوە نەجوولاوەتەوە. لە ئەیالەتی خۆی‌دا ماوەی چل و دوو سالی فەرمانرەوایی کردووەو پاشانەکێ مالاوایی لە دنیای فانی کردووە. «منها خلقناکم وفیها نعیدکم ومنها نخرجکم تارة أخری».

# لەبارەی فەرمانڕوایی
# مەئموون بەگی دووەمەوە

پاش کۆچی دوایی بیگەبەگ مەئموون بەگی دووەمی کوڕی بوو بە جێنشینی . دەرگای دووزمانیو شوفاریی لە ڕووی دووزمان و گێرەشێوین بەست لاوێکی تا بڵێی ڕووخۆش و ئاکارنەرم و ڕەوشت خاوێن. نوکتەزانێکی قسەخۆشی زات چاك و نیهادپاکێکی بەغیرەت، بە دەهەندەییو دەسبڵاوی بەناووبانگ، بە ئازایەتیو گەڕناسی بە نامێ ،لە لاوچاکیو قۆزیو قۆچاخیدا بێهاوتا ،لە ڕەوشت باشیو زمان شیرینیدا بێمانەند. ژێردەستانی پێ دڵخۆش و شادمان، دەست و پێوەندانی لە سای ڕەفتاری بەرزیو ئاکاری بڵێندیەوە بەختەوەرو خۆش گوزەران.

پاش مەرگی باوکی دوو سالی بە سەربەخۆیی تەواوو بەدەبدەبەو شان و شەوکەتەوە بەسەر ولات ڕاگەیشت . تا سولتان سەلیم[٨] خونکاری ڕوم کەوتە سەر کەلکەلەی داگیرکردنی کوردستان و شارەزوور. بە پێی قسەی خوسرەوبەگی موسەننیف[٩] حوسێن پاشا

(۱۰) ناوێکی بە سوپایێکی زۆروزەوەندەوە بۆ داگیرکردنی ئەو ولاتانە بەرێ خست. حوسێن بەگ کاتێ گەیشتە خاکی شارەزوور لەگەڵ مەئموون بەگ بەشەڕهاتن، بەڵام هیچ لایێکیان بەسەر لایەکەی تردا سەرنەکەوت. مەئموون بەگ کە زانی گورو توانی بەرەنگاربوونی هێرشەکەی بەبەرەوە نی‌یە، ناچار خۆی لە قەڵای زەڵم قایم کرد. حوسێن پاشا ماوەیێك ئەو قەڵا سەخت و دژوارەی گەماروداو بە لەشکرێکی گەورەو گرانەوە لە دوورەوە هەواری‌گرت و دەرگای لە خەڵکەکە پێوەدا. سەرەنجام مەئموون بەگ لەبەر زۆرخایاندنی گەمارۆکە تەنگە تاوبوو توانی شەڕکردنی لەخۆی‌دا نەدیت و ناچار لە شەڕ کشایەوەو لەناکاو لە قەڵا وەدەرکەوت و لەگەڵ برێ خەڵکدا رووی لەبارەگای خونکار کرد. سولتانیش بە پێچەوانەی رێورەسمی سولتان و پاتشاو خاقانەکان ئەو لاوە نائومێدەی خستە زیندانەوە . بە پێی کتێبەکەی مەلا محەممەد شەریفی قازی سولتانی روم فەرمانی داگیرکردنی ئەو ولاتەی بە سولتان عەلی‌بەگ ناوێ داوە . دوای راکردنی مەئموون بەگ و بە بارەگای سولتان گەیشتنی زوری ریزلی‌گرتووە بەلام بە ناچاری قەڵەمی نائومیدی بە سەر مافی فەرمانرەوایی ولاتی باووباپیرانی‌دا کیشا . ناوچەی حیللەی (۱۱) سەر بە ویلایەتی بەغدای پێ بەخشیوەو ناخرونوخری ژیانی لەوی بەسەربردووەو تا رۆژی خۆی هاتووەو مردووە . پاش نەوەی مەئموون بەگ گەیشتە روم . سورخابی مامی ولاتەکەی خستە سەر قەلەمرەوی خۆی‌و بە نەرم و نیانی لەگەڵ نەشکری رۆم‌دا جوولایەوە.

# لەبارەی فەرمانڕەوایی سورخاب بەگ و ناگاو ڕووداوەکانی

پاش هەلاتنی مەئموون بەگ، برازاکەی قەلای زەلم و شارەزوورو سەرانسەری ئەیالەتەکانی تری خستە سەر قەلەمرەوی ولاتەکەی خوی. بو بەرژەوەندی خوی لەگەل روٚمەکان دا ریك کەوت. پاش ماوەییك کە لە کاروباری فەرمانڕەوایی‌دا بە تەواوی سەربنەخویی وەدەست هینا، سەرپیچی لە سولتانی روٚم کرد. سولتانی روٚمیش سەبارەت بەم کردەوەیەی بلیسەی توورەیی بەجاری بەرزبووەو بو لەناوبردنی دەس بەکاربوو.

وا مەشهوورە، مەئموون بەگی دووەم تا ئەو سەروبەندە لە بەندیخانەی سولتان دا بووە. پاش ئەوەی سولتان ئەم ڕووداوەی بیستەوە وای بە بەرژەوەند زانی لە بەندیخانەی رەهاکاو فەرمانرەوایی حیللە بە خوی‌و فەرمانرەوایی سروچك بە ئیسماعیل بەگی کوری بسپیری. بو ماوەییك هەردووکیان لەو دوو ناوچەیەدا فەرمانرەوایی‌یان کردووە. وەك دەگیرنەوە. تا سالی ١٠٠٤ی کوچی، ئەوەو نەتیژەکانی لە حیللە حوکمران بوون. خودا بو خوی دەزانی.

سورخـاب بەگ پاش بەسـەرراگـەیشتنی ناوچـە بە میـرات بۆ بەجیٚماوەکانی، توانی بەشە ولاتەکەی‌محەممەد بەگی برایشی بە زۆر لە دەست دەرێنیٚ‌و وەسەر قەلەمرەوی ولاتەکەی خۆی‌خا. بەمە بوو بە فەرمـانـرەوای سەرانسـەری ولاتی لە باووبـاپیـرەوە بۆ بەجیٚماوو ئاوازەی هیممـەت بلیندیی لە سەرتـاسـەری دنیـادا دەنگی دایـەوەو دەبدەبەی شان و شەوکەتی بەرگویی لاوو پیران کەوتەوە. ئەلقاس میرزای برازای شاتاهماسب رووی لە دەولەتی ئیران وەرگیرابوو، پەنـای وەبـەر دەولـەتی عوسمـانی بردبـوو. سولتـانی رۆمیش ئەم هەلاتنەی ئەلقاسی بە هەل و دەرفەت زانی، بەوپەری ریزلیٚنان و دلنـەوایی کردنـەوە پیشـوازی لیٚکرد. سەرلەشکریکی بەناووبانگی لەتەك سوپایەکی گەورەو گران دا بەگەل خست و بەرەو کوردستان و سەرسنووری ئیرانی بەریٚخست و پاش هەول و تەقەلایەکی زۆرو لەشکرکیشییەکی بیٚ شومار، چونکە ئەختەری بەختی رووڵەکزی‌و ئەستیرەی یەغبالی رووڵەکشان بوو هیچی پیٚنەکرا. سپاهی‌یەکان لەوەی کە بەرەو رۆم برۆن پەشیمان بوونەوە. ئەلقاس میرزا ناچار پەنـای بۆ سورخـاب بەگ هینـاو داوای لیٚکـرد، لە خزمـەت شادا پووزشتی بۆ بێنیتەوەو لە گوناهی خۆش بیٚ. شاتاماسپیش لەبەر دلی سورخاب بەگ، چاوی لە تاوانەکانی پۆشی‌و فەرمانی سەرداریتیی شیروانی وەك جاری جاران لەگەل بری خەلاتی شاهانەدا بۆ ریزلیٚنان و سەربـەرزکـردنی پیٚبەخشی. ناوبراو بە ترس و ئاواتەوە بەرەو شیروان بەریٚکـەوت. پـاش ئەوەی گەیشتە شیروان پاتشا بیروڕای لیٚگۆڕی. شا نیعمـەتـولـلای قەهستانی‌و بری پیاوماقوول و هەمەکارانی دەولەت فەرمانی بەندکردنی ناوبراویان پیٚ سپیردراو ئەوانیش کۆت و زنجیریان

کردو لە قەڵای قەهقەهەیان بەندکرد. پاش ساڵێکی رەبەق ئەنجا فەرمانی کوژرانی دراو لەسەر قەڵاکەوە هەڵدرایە خوارێ و بەم شێوەیە لەناوبرا. سورخاب پلەوپایەی بەم کارە هێندەی دیکە بەرز بووەو ساڵانەیێکی هەزار تمەنی لە خەزێنەی پاشاوە بۆ برایەوە، هەموو ساڵێ بەرێك وپێکی وەری دەگرت.

هەروەك لە پێشەوە گوتمان سورخاب بەگ قەڵەمڕەوی موحەممەد بەگی برای لە دەست دەرێنا و خستیە سەر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی یەکەی خۆی. هەرچی موحەممەد بەگ بوو توانی بەربەرەکانێی سورخاب بەگی برای بە خۆیەوە نەدەدیت. ناچار رووی لە دەرباری سوڵتان سەلیم کردو لە بێ ویژدانیی سورخاب بەگی برای کەوتە سکاڵاو گلەیی و گازن. جا سوڵتانی رۆم یارمەتی دانی ئەوی بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانی، رۆستەم پاشای سەرەك وەزیرو چەند پاشایەکی تر هەروەها عوسمان پاشای میرمیرانی لە تەك لەشکرێکی گەورەوگران دا بەگەڵ موحەممەد بەگ خست و لەشکرەکە بەرەو جێگای مەبەست بەرێ کەوت و بۆ هێمنی و ئاسایشت دابین کردن گەیشتە شارەزوورو دەوروبەری. هەرچی سورخاب بەگ بوو، چونکە توانی بەربەرەکانێی لەشکری رۆمی بە خۆیەوە نەدەدیت، ناچار لە قەڵای زەڵم خۆی حەشارداو لەسەر بورجی قەڵاوە دەستیان بە شەڕکرد لەو کاتەدا گوللەیێکی وێڵ لە لایەن یەکێ لە شەڕکەرانی قەڵاوە بەر موحەممەدبەگی کەساس کەوت و لەناوچوو. لەشکری رۆمیش کەوتە تاڵان و برۆی ناوچەکەو ئالای زۆرداری و ستەمیان هەڵ کرد. بەم جۆرە گەمارۆدانی قەڵا دوو ساڵی خشتی خایاند، تا هەواڵی لەشکرکێشی بە شاتەهماسب گەیشت. حوسێن بەگ ناوێکی بە

لەشکریکی گەورەوگرانەوە بو یارمەتی سورخاب نارد. سەرلەشکرو پاشایانی روم کاتیکی ئەم هەوالەیان بیست ،وازیان لە گەماروادانەکە هیناو عوسمان پاشای میرمیرانیش هەر لەو شوینەدا کوچی دوایی کرد.
خەلکی قەلایش کە ماوەییکی دوورودریژ بوو لە ژیر باری گەماروادانەکەدا بوون ، پشوویکیان داو کەوتنەوە سەر کاروباری ژیانی خویان. لەو دەمەدا موحەممەد پاشا ناوی کە یەکی لە سەردارانی لەشکرەکە بوو دەرفەتی هینا، سەربازیکی زوری لە دەوری خوی کوکردەوەو سالی ٩٦٩ پیی ئازانیەتی و مەردایەتیی لە رکیفی کەلەمیردایەتی توند کردو خوی هاویشتە نیو قەلای زەلمەوە. هەرچی سەرەرو و کەلەوەکیشی نیو قەلا هەبوون، سەرلەربەری فراندن و ناوو بانگی ئازایەتی و گەرناسیی بەرگویی دوورو نزیك کەوتەوەو زەلم و شارەزوورو دەوروبەری، سەرانسەر گرتەدەست. سورخاب بەگیش ناچار داوای ریك کەوتنی لەگەل دەولەتی روم دا کردو بەشی لە ئەیالەتەکانی خرانە سەر قەلەمرەوی دەولەتی عوسمانی(١٢) سورخاب یازدە کوری هەبوون: حەسەن بەگ و ئەسکەندەر بەگ و سولتان عەلی بەگ و یەعقووب بەگ وبەهرام بەگ و زولفەقار بەگ و سەلماس بەگ و شاسوار بەگ و ساروخان بەگ و قاسم بەگ و بسات بەگ.
دەگیرنەوە: سولتان عەلی بەگی کوری سورخاب بەگ بە مەردایەتی و ئازایەتی و دلیری ناوو بانگی رویشتبووو لەسەردەمی باوکیدا بە زوری بازووی کەلەمیردیی خوی توانی زەلم و دەوروبەری لە ژیر چەنگالی عوسمانییان دەرینی و خوی بیی بەفەرمانرەوای ناوچەکە. بارام بەگ، کورەکەی تری سورخاب بەگ ، لە ژیانی باوکیدا لە رەواندز و ئامیدی بووە بە فەرمانرەواو بەوەندە

بەشە داکەوتووە. لەو سەردەمەوە تا ئەمرو کە سالی ۱۲٤۲ی کوچی‌یە، کوران و نەوەو نەتیرەکانی هەر حوکمرانن. هەرچەندە لە کتیبان دا بەرچاونەوکەتووە، بەلام وەك لە بەرینانم بیستوە، سورخاب بەگ لە ژیانی خوی‌دا ولاتەکەی بەسەر کورەکانی‌دا بەشیوەتەوە. ناوچەی ئیلاخی بە سەلماس بەگ سپاردووە. نیوبراو لەو ناوچەیەدا گەرماو و کوشك و تەلاریکی بەهەیبت و هووت و دەبدەبەو سەنسەنەی بنیات ناوەو ئاوەدانی‌یسەکی بەرچاوی خستووەتەوە. گوندی سەلماس نیستاکانی، لە کاتی نووسینی ئەم چەند لاپەرەیسەدا لەوپسەری ئاوەدانی‌دایەو بووە بە هەوارگەی فەرمانرەواوحوکمرانانی ئیلاح و تیرەی سلیمانی کەتەمرو لەوی دەژین لە کورانی ئەون. هەروەها ناوچەی مەریوانی بە کورەکەی تری، ئەسکەندەر بەگ سپاردووەو کورەکانی تا ئەمرویش لە مەریوان ماون. (زانست لای‌خودایە)
سورخاب بەگ ماوەی شیست سالی، یا وەك دەلین، شیست و حەوت سالی، لە ئەیالەتی کوردستان و شارەزوور، نازادو سەربەخو، فەرمانرەوایی کردووە. تا فەرمانی خودای بە فەرمایشتی «ارجعي الی ربك راضیة مرضیة»مالاوایی لە دنیای ناپایەدار کردووە.

## فەرمانڕەوایی سوڵتان عەلی بەگی
## کـــوڕی ســورخــاب بــەگ

پاش باووبــاپیــرانی دادپــەروەرو بە هونــەرانی خوی، تەختی سەروەریی ڕازانـدوتـەوەو ماوەی سی ساڵی بەوپەری سەربەخـویی و سەربــەستی یــەوە بەســەر ئەردەلان وشارەزوور ڕاگـەیشتـووە. تا لە هەرەتی لاوێتی دا ئەو نوێیـاوی بلخی کامـەرانی یە مالاوایی لە دنیـای فانی کردووەو باروبنەی بەرەو سەرای هەتاهەتایی کێشاوە. دوو کوری بەخت یاری بە ناوی تەیموورخان و هەلوخانەوە لەپاش بەجێ ماون، کە بە هوی تەمـەن بچـووکی یانەوە نەیان توانیوە ئەرکی فەرمانڕەوایی لە ئەستو بگـرن. لەبەر (ئەوە) بســات بەگ، برا هەرە گچکـەی سوڵتـان عەلی یێ هاویشتە سەر پلەوپایەی بلیندتر وچووە سەرتەختی فەرمانرەوایی.

## میرایەتیی بسات بەگی
## کوڕی سو رخاب بەگ

لاوێکی خووڕەووشت چاك و میـرێکی شوخ و شەنگ و توچاخ و بە بیـر وبـر وادر وست بوو. ولاتی بە فەڕی پیوقـەدەمی پیروزی خوی ئاوەدان کردەوەو ژێــردەستـانی لە دادپـەروەری لە خوی خوشحـاڵ و

دلشادکرد. زۆربەی کاتی بە خوداناسی‌یەوە بەسەردەبرد. شەووڕۆژ بە دادپەروەری‌یەوە خەریك بوو. لە شێوەی دانایی‌و فەزڵ و هونەردا لە هەمووان لەپێشتر و لە ئادابی زانست و ئەقڵ و ژیری‌دا بێ‌نیاز بوو. لەگەڵ ئەمیندار و میران دا نموونەی گەورەیی‌و لەگەڵ خەڵك و خوادا شیمەی‌دادی لەپەرەی دڵان دا بووە. ماوەیی بە ڕێ‌ورەسمی پەسندەوە حوکمرانی کردووە، تا ئەو دەمی تەیموورخان و هەڵۆخان بە تەمەنی لاوێتی گەییوون، هەوای فەرمانڕەوایی‌و سەرۆکایەتی‌یان کەوتۆتە سەر و بە نیازو ئامانجی دادخوازی‌یەوە ڕوویان لە بارەگای شاسمایلی سەفەوی کردووەو ماوەیی لەوێ ماونەوە، تا شاسمایل فەرمانی خودای بەجێ‌هێناوە. تەیموورخان و هەڵۆخان بێ ئەوەی بە ئامانج بگەن بەنائومێدی بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕاونەوە. لەم هەنگامەیەدا ئەوەبوو، تەیموورخان کەوتە تاڵان و برۆی وڵاتی ئەردەڵان و بریاری دا مامی لەناوبەری‌و قەڵەمرەوی وڵاتەکە سەرلەبەر بەتاڵان دا. نیشتەنی‌یانی هەموو هێنایە ژێر تێخی سیاسەت و بە شەڕو ئاژاوە ناوچە بە میرات بۆ بەجێ‌ماوەکانی لە چەنگالی بسات بەگ دەرێنا. لەبەر ئەوەی کە بسات بەگ میرێکی نیازپاك و ڕەفتارخاوێن و ڕەوشت پەسندو حوکمدارێکی دادخوازو ژێردەست پەروەر بوو، لە ژیانی خۆی‌دا، سەرەرای ئەوەی کە تەیموورخان هەمیشە خەریك بوو لەناوی‌بەرێ، گەورەو بچووك گوێ بەفەرمانی بوون، تا گەردوون باروبنەی پێ پێچایەوەو دوایی بە بەزمی ژینی‌هێناو، گیانی‌بەگیان ئافەرین سپارد.

# تەیموورخانی کوڕی سوڵتان عەلی

تەیـمـــوورخـــان پاش کۆچـی دوایـیـی مامـی لە ساڵـی ٩٨٦ دا بە ئەختەری بەختەوەری‌و سەردەمی شادی‌و خۆشی‌یەوە تەختی لە باوکەوە بۆ بەجێ ماوی بە جەستـــەی خاوەن هەستی‌و پیـــاوەتی رازانـــدەوەو سەریـــری سەروەریی بە پیـــرۆزیی هاتنـە سەر تەختەوە ئارایشت دا. پاتشـاییکی دادپەروەرو خودانیکی دەسبلاوو دلاوا بوو. لە مەردایەتی‌و ئازایەتی‌دا ڕۆستەمی زاڵی دووەم و لە پیاوەتی‌و دەهندەیی‌دا بێ هاوتاو بێ وێنــە بوو. خودای داوەر پشتیـــوانی بووو بە یارمـــەتی‌و کۆمـــەگی پەروەردگـــاری مەزن سەرکـــەوتبـــوو، تیشکی ئاوری بە سەر گەورەو چووکەوە سەیوان و سێبەری نوازشتی بە سەر هەمووانەوە چەلەنگ و تانج بوو.

لە پاش داگـــیـــرکـــردنـــی ناوچـــەی ئەردەڵان (٩٨٨) بە پێـی بەرژەوەنـدی خۆی لەگـەڵ خونکاری ڕۆم نێوانی خۆی خۆش کرد. لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە سێ نیشانەی، کە بە زمانی ئەو وڵاتە توغی پێ دەڵێن، بۆ گەورەکـــردن و ڕێـــزلێ‌نانی پێ بەخشـراوەو نوازشتیکی ئێکجـار زۆرکراوەو ئازناوی «میرە یران» ی پێ خەڵاتکراوە[١٣] ناوچەی سەنقـوڕو دینـەوەری وەسـەر قەڵـەمرەوی وڵاتەکەی هاویشتوەو بەسـەر بەخۆیی‌وە لەوێ‌و لە ئەردەڵان و شارەزوور بووە بە فەرمانڕەوا. بە هۆی بەلای عـوسـمـانی‌دا داتـاشینیـەوە سەت هەزار ئاقچـەی خەرج وباجی ناوچـــەی شارەزووری بە ساڵانـــە بەردەوام پێ دەبـــەخشـرا. بەڵام بە پێچـــەوانـــەی ڕێ‌وڕەسمی مەزنـــایـەتی‌یـەوەوبە بەرەواژیی ڕەوشتی دادپـەروەری‌یـەوە هەمیشـە ئەو وڵاتـەی بە تاڵان و برۆ بردووەو زۆری

حەز لە ئازار و ئەشکەنجەدانی دراوسێکانی بووە. لە ئاکام دا سەرپێچی لە فەرمانی ئێران و ڕۆم کردووەو ئازادو سەربەخۆ لە ولاتەکەیدا حوکمڕانیی کردووە. تەیموورخان ولاتەکەی بەسەر کوڕەکانیدا بەشی یەوە. فەرمانڕەواییی سنەو حەسەن ئابادو قزلجەو زەلم و شارەزووری بە سولتان عەلیی کوڕە گەورەی، کە بە ناوی بە نامیی باوکیەوە ناونرابوو، سپارد. کوڕەکەی دیکەی، بوداق بەگیش لە ناوچەی قەرەداخ دانا. ناوچەی مەریوانیشی بە موراد بەگ بەخشی. هەرچی ناوچەی شاربازێریش بوو[14] بە ئەمیر عەلەمەددین بەخشی، کە بە تەمەن لە هەموان منداڵ تر بوو.

تەیموورخان پاش ماوەیێ کە بە سەربەخۆیی لە ولاتەکەی خۆیدا فەرمانڕەوایی دەکرد، دەستی بۆ کرماشان و زەرینکەمەریش، کە ئەمرۆ بە گەرووس بەناووبانگە، درێژکردو هەردوو ناوچەکەی داگیرکرد.

ئەم ناوداره زۆربەی کاتی بە ڕاووڕووت و تاڵان وبڕو بەسەردەبرد. تەنانەت دوو سێ جار هۆزی عومەربەگی کەلهوڕی تاڵان کردو ئەو بێدەرەتانانەی ئاتاجی نانی شەوی کرد. لە دواجاردا عومەربەگ پەنای وەبەر شاوێردیخانی لوڕ بردو داوای کۆمەگی لێکرد. شاوێردی خانیش بە پێی ڕێورەسمی دراوسێتیو بەدەماریی هۆزەکی لەشکرێکی لە ئازاو کەلەمێردانی هۆزەکەی خۆی پێکەوەناو بە هاواری هومەربەگ و هۆزەکەوەی نارد. لە دەربەندێک دا کە لەسەرەڕێی لەشکرەکەی تەیموورخان و لەشکرە بێشومارەکەی ئەردەڵان دابوو، خۆیان لە بۆسەداو لە کاتێک دا کە لەشکرەکەی تەیموورخان بەوپەڕی دڵنیاییەوە، خەریکی تاڵان دابەش کردن بوون. هۆزی لوڕو کەلهوڕ لێیان ڕاپەڕین و هەڵیان کوتایە سەریان و

کار بەدەســەو بــەرۆك بوون گەیی و شەڕ گەرم بوو. پاش هەلایســانی ئاگــری شەڕ، چونکــە بواری شەڕەکــە تەنــگ و سەخت بوو، دلێرە ئاودار و گەڕناسەکان لەبەر شەکەتیی ڕێگاوبان، دەرگەی ڕزگاربوونیان لێ وەتــەنگ هات، ناچار تەیموورخان دەستی لە شەڕەکە هەڵ گرت.
چونکە شوێنەکە نە ڕێی هەڵاتنی هەبوو و نە بە دەستی خوی بوو، برێ لە پیــاوماقــوولان و کەلــەمێردان لەگەڵ تەیموورخان دا بەدیل گیران و هەرچی تالانی یــەکی وەختی خوی کردبــوویــان لەگــەل دەسکــەوتێکی زۆری دیکــەدا بو خاوەنــەکــانیــان گەڕایــەوەو خەلکی کەلهــور لە ئەشکــەنجــەو ئازاری رابــرد وو سەرئاسوودە بوون. پاش چەند ڕوژێ شاوێــردی خــان و عومــەر بــەگ بەویــەری ڕێــزلێنــران و حورمــەتــەوە تەیمــوورخــان و دەس و دایــەرەکــەیــان ئازاد کردو بو ئەردە لانیــان ناردنەوە. سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا گەردی پەشیمانیبە سەر ڕووی کەلــەمێــردانەوە مابوو و هێشتا لە ماندویتیی شەڕ نەحەسابوونەوەو چون پێشتــر ئەیــالەتی زەرین کەمەر لە ژێر دەستی ئەو میرەکینەتوزەدا بوو و لە لایــەن دەربــاری سەفــەوییــەوە دەولــەتیــار سولتــان سیامەنــووری بو سەرپــەرشتیی ئەو ناوچــەیــە دانــدرابــوو، تەیموورخان ئەمەی بە دژی خوی زانی و بە مانای لە پایەکەم کردنەوەی دایەقەلەم، لەبەر ئەمە سالی ٩٩٨ ی کــوچی سپاییکی سازکردو دەولەتیار سولتان سیامەنــووری ئەم ڕووداوەی بەدەربــاری پاتشای ئیرانی ڕاگەیاند. لە ئاکام دا هێزێکی لە بارو کوکی بو یارمــەتی و کومــەك نێــردرا. کاتێ تەیمــوور بەرێ کــەوت دەولەتیار سولتان سیامەنــووری پێشدەستیی خوی کردو بە لەشکرێکی گەورەوگــرانــەوە بەرەنگــاری سوپسای تەیمــوورخــان بوو. پاش شەڕوشــوڕێــکــی گەورە لە نێــوان هەردوولادا، تەیــمــوورخــان

سەرکـەوت و نەیـارانی ژێرکـەوتن. بەم شێـوەیـە سوپـای ئەردەلان زاڵ بووو قزلباش و دەولەتیار سولتان سیامەنسووری بەزین و رووویان لە مەیـدانی شەڕ و نەبـەرد وەرگێـڕاو زۆربەی لەشکرەکە بەدیل گیران و ئەودواکـەی بە شمشێـر لەتـوپـەتکران و ئەوانەی مایشنەوە پەنایان وەبەر قەلای زەرین کەمەر بردو شوورەو وارشەکانیان کرد بە سەنگەری خۆیان.

تەیمـوورخان بە هۆی نازایەتیو کەلەمێردایەتییەکی پێی‌ناسرابوو، بەوپـەری شانـازییـەوە، بێ ئەوەی گوێ بە وتـەوتـەو پڕ و پـووچی دەوروبـەری بگرێ قەلاکەی گەمارۆدا. دژدار و قەلاچییان ئەگەرچی داوای ئامـانیـان کرد، هیـچ سوودی نەبوو، سەرەنجام لەسەر دیواری قوللەو وارشـەکـانـەوە تەقـەو لێکـدان گەرم بوو، لەم کاتـەدا، بە پێی «چـارەنـووس ناگـۆڕێ» لە گەرمەی شەڕ وشۆڕدا ئەو میرە خوێندەوارە بوو بە قوربـانی گوللەیێ. پاش ئەوەی سوپـا ئازاو دلێـرەکـەی چاویان بەم رووداوە پڕمـەتـرسییـە کەوت شێرازەیان تێکچوو دەستیان لە شەڕ هەلگـرت و شێری تولەیان لەکێلان هاویشتەوەو تەرمی تەیموورخانیان بەرەو ولات گەڕاندەوە «ذلك تقدير العزيز العليم».

# هەلۆخان

پاش ئەوەی تەیموورخان لە سالی ۹۸ی کۆچی‌دا کوژرا هەلۆخانی برای ،بووکی ولاتی لە باوەش کرد، چون فەرمانرەوایی بە پێوقەدەمی پیرۆزی فراژی‌بوو گەشایەوەو گولشەنی پاتشایی لە دەهندەیی‌و دلاوایی تەڕوپساراو بوو ولات لە سەروبەندی‌دا ئاوەدان و ژێردەستان لە دادپەری دا زۆر شادمان‌و کامەران بوو. لە کەلەمێردی‌و ئازایەتی‌دا سەت پلە لە براکەی لەپێشتر بوو لە خەلك نەوازی‌و بدەیی‌دا، لە سەرانەری ولات دا ببوو بە داستانی سەرزاری گەورەو بچووك. سپایی‌و لەشکری لە پیرۆزیی پێ‌و قەدەمی شادمان و رەعیەت و ژێردەستان لە فەیزی بەزەیی‌و نوازشتی جمرانەی ئاسوودەیی‌و سەرسووکی . چیمەنی فەرمانرەوایی لە هەوری دادپەروەری یەوەی تێراو ، نەمامی کامەرانیی لە زولالی بەزەیی یەوەی تەروپراو. ئەویش وەك برا ناودارەکەی هەر لە سەرەتای کارەوە لەگەل سولتان مواردی پاتشای رۆم دا ڕێك کەوت . هەروەها لەگەل شاعەباسی سەفەوی‌دا لە رووی بەرژەوەندەوە دەرووی دۆستایەتیی کردەوە . سەروسامانیکی زۆرو گەنجیکی بێ

شوماری لە سەروبەندی خودا پێکەوەنا . زۆربەی کاتی پرملیەی بە قەڵارۆنــان و مزگــەوت بنیـات نان و قوتـابخـانـەدروست کردنـەوە بەسـەربـرد . هەروەهـا قەڵای زەلم و قەلای پاڵنگـان کە بە ئەسـڵ پێتەختی تیرەی گۆران بووەو بە گەردوخولی رۆژگار ویران و خاپوور بـــوو ، ئاواکـــردەوە. دەلـیـن، قەلاییکی تا بڵێی سەخت و دژێکی ئێکجار قایم بووە ، تەنانەت لەبەر سەختیو دژواریی ڕیرەوەکەی دژمن و نەیار زۆر بە زەحمەتی لێ پەڕیونەوەو لە کاتی قەڵاپاریزیدا بوو بە کۆسپ و لەمپـــەر لە ڕێی هێـرشکـەران دا. هەروەهـا قەلای حەســـەن ئاوایشی ئاواکـــردووە، کە بەراستی خودای ئەفـــرانکـار، سەرانســـەری دنیـا بگــەرێی، قەلاو مەلبـەنـدیکی وا بەم شان و شکـۆیـەی لە هیـچ شوێنێ دروست نەکـردووەو هیـچ دنیـادیتـەیێك چاوی بە شتی وا نەکـەوتـووە. ئەمـەیش باس وخـواسی لە هەمـوو دیرۆك و مێژووی دنیادا تۆمار کراوەو پەسن و وەسپی لە پەرتووك و دەفتـــەری زۆرینـــەی جیهـــان دا نووسـراوە. من ئەم کەمینـەیـە، بەچـــاویخـــۆم دیـتـم بالـیـــوزی ڕووس و ئینگلیس لەســـەردەمی فەرمانرەواییئەمانوللاخانی والیدا بەناوی دیتنی ئەم قەلایەوە، بەسەر کوردســـتــان (سنــــە)دا تێدەپـەڕین و لەگـەڵ ئەوەش دا کە قەلاکـە وێرانەبوو، سەیرانی شوێنەوارو کەلاوەکەیان دەکرد

لە شاری مەریوانیش، قەلایەکی سەخت و قایم و بازارو گەرماوو قوتابخانەو مزگەوتێکی دلگیری بنیات ناوە.

وەك دەلێن، ئاسەواری ئەم خانووو بەرەو ئاوەدانی‌یە تا ئێستایش هەر ماوە. بەرە بەرە قەلـــەمـــرەوی فەرمـانـرەوایی یەکـەی فرەوانتـر بووەتەوەو شان وشکۆیبەرادەیە گەیشـتـووە خەیالی هیچ کەسێ توانی

ژماردنی نەبووە. لەبەرئەوە دەرووی ڕێك کەوتنی لەگەڵ پاتشایانی ڕۆم و ئێران دا بەست و بەوپەڕی سەربەخۆیی‌یەوە لەولاتی خۆی فەرمانڕەوایی کرد. ناوبە ناوێکیش دەستی دەدایە تالان و بڕۆی دەوروبەری خۆیو ئاوازەی شان و شەوکەتی خۆی بە گوێی دوورونزیك گەیاند، تا لە ساڵی ۱۰۱۹ ی کۆچی‌دا حوسەینخانی لوڕ کەڵکەڵەی تۆڵەساندنی کەوتەسەر ، بە لەشکرێکی زۆرەوە هەڵی‌کوتایە سەر هەڵۆخان، لە قەڵای حەسەن ئاباد شەڕو شۆڕێکی گەورە دەستی پێ‌کرد. هەڵۆخانیش نەی‌کردە نامەردی لەشکرێکی بۆ تەمێ‌کردنی حوسەینخان لەسەر ئەم بێ‌ئەقڵی‌و ملهوڕی‌یەی بەڕێ‌خست و زۆر چاکیان گوێ‌ڕاکێشا، ئەویش کە دیتی ئاڵای بەخت و خواستی کەچ و سەرەوژێرە، بەسەرشۆڕی‌یەوە هەڵاتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

ئیتر هەڵۆخان، بەم جۆرە پێی لە فەرمانڕەوایی‌و حوکمڕانی‌دا پتر چەسپی‌و دەسەڵاتی قایمتر بوو.

دەگێرنەوە، شاعەباسی سەفەوی چەند جارێ لەشکرێکی گەورەوگرانی بۆ ژێردەست خستنی هەڵۆخان و وێران کردنی قەڵاو قەڵایچەکانی ئەو هەرێمە بەڕێ‌خستووە، بەڵام بێ‌ئەوەی بە هیچ ئامانجێ بگا، بە سەرشۆڕی گەڕاوەتەوە بۆ بارەگای سەفەوی‌یان. سەرەنجام ئەمە بووە بە هۆی زێتر باوەشێنکرانی ئاگری توورەیی پاتشای سەفەوی تەنانەت، پاتشا، خۆی بە لەشکرێکی بێ شومارەوە، بە نیازی گوێڕاگێشانی هەڵوخانەوە، پێی هاویشتۆتە سنووری وڵاتی هەڵۆخان و لە گوندی مەیەم ، کە کەوتۆتە ناوچەی ئەسفەند ئابادەوە. تەشریفی هەواری گرتووە.

رۆژێکیـان، به نیـازی ئەوەی شارەزای ناوچـەکـە بێ، تەماشای کەژوکێـوانی کوردستـانی دەکـرد، بە سەر کەژێکـەوە گیـرسـایەوە. زۆربەی بەرپرسیارانی دەوڵەتی پاتشایی دەستەونەزەر راوەستابوون، (ئالی‌بالی‌زەنگەنە) کە جەڵەوکێشی پاتشا بوو، جەڵەوی ئەسپەکەی پاتشای بە دەستەوە گرتبوو، لە خزمەتی‌دا راوەستابوو. لەبەر ئەوەی هۆزی زەنگەنە لە کوردستانەوە نزیکن و دراوسێی یەکن، شاعەباس لە ئالی‌بـالی‌زەنگـەنـەی پرسی، داخوا ئەو مەڵبەندەو قەڵاکانی لە چ حالـوبـاڵێکـدان، باری سوپـای هەڵـوخـان لە چ رادەیـەك دایـە؟ ناوبـراویش لە وەڵام دا گوتی، ئەوەی شیـاوی باسـە، کوردستـان قەڵاو قەڵایچـەی زۆر سەخت و کەژوکێـوی تا خەیـاڵ بفـەرمـووی دژواری هەن، تەنـانـەت مەلی خەیـاڵیش ناتـوانێ بیـان گاتێ‌و داگیـرکـردنی لە وزەو توانی هیـچ خاوەن دەسـەڵاتێکـدا نی‌یـە. لەو بێشـەیـەدا نەرەشێرو هوژەبـرانی کینـەوەری وا هەن لافی هاوشانیی رۆستـەمی داستـان و ئەسفـەنـدیـاری پاڵـەوان لێ‌دەدەن، مەتـرسی لەوەدایە سوپای پاتشـا بە نیازی تەمێ‌کردنی هەڵوخان بەرێ‌کەوێ‌و خودانـــە خواستـــە ماوەی گەمـــارۆدانی قەڵا درێـژە بکێشێ‌و لەبـەر سەختی‌و دژواری قەڵا لە گرتنی نائـومێـد بێ‌و بێ ئەوەی بە هیـچ ئامـانجێ بگـا، لە هەڵکـوتـانـەسـەری پاشگـەزبێتـەوەو بە بێ هیچ دەسکەوتێ رێی‌هەڵاتن بگرێتەبەرو ئەمەیش ببێ بە مایەی نەنگ و شوورەیی بۆ دەســەلاتـی پاتشـــایی‌و دیسارە شتی وایش لەگـــەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت دا ناگونجێ‌و لەوانەیە ئەم کزی‌و بێ‌دەسەڵاتی‌یە ببێتـــە هۆی ئەوە کە هەڵـــوخـــان بە جارێ دەست بەســـەر هەمـوو ناوچـەکـانی وڵات دا بگـرێ. جا لەبـەر ئەوە ،چاك ئەوەیە خودانی

دنیـــا ، پاتشـــا دەستی نوازشت و لاوانـــدنـەوە بەسـەریدا بێنێو بە تەگبیـر و ڕاو پرس چارەسـەری کارەکـەی بکـاو بەمـە بخرێتە ڕیزی نوکـەرانی دەولـەتـەوەو ڕێگـای خزمـەت و سەرڕاستی بگرێتە بەر. شایش بیری وردو سەرنجی ڕاستی ئالیبالی پەسندکردو پلەو پایەی زیاد کردو لە چوونەسەر هەلۆخان پەشیمان بۆوە[11].

هەلۆخانیش پاش ئەم کەین وبەینە خان ئەحمە دخانی کوڕی،

کەلــە ناو کورەکـــانیدا ، بە ئازایـەتیو دەهنـدەییو شوخیو قوچـاخی ناوبانگی ڕۆیشتبوو، بە دەسودیاریی گرانبایییەوە نارد بۆ دەرباری شا عەبـــاس. خان ئەحمـــەد خانیش پاش ئەوەی بە خزمـەت شاعـە باس گەیشت، خەلاتێکی زۆر کراو لە ڕادەبەدەر چاودێری کراو پەیتا ـ پەیتا ئەو پاتشـا دادگـەرە ناوبراوی بە نوازشتی زۆرو زەوەند سەربلیند کرد. پاش ماوەیێ کە بەهـرەو توانی خان ئەحمـەد خان لە شاعـەبـاس ڕوون بۆوە، لە پایـەوپلەی زیـادکـردو خوشکـە گەوهـەرە درەخشـانەکەی نێو گەوهەردانی شاهێتیو ئەستێرە پرشنگدارەکەی ناو بورجی سەڵتەنەتی، کە ناوی زەرینکولاهـ بوو پێ بەخشیو سەری بەزاواو خەزووریی شا بەرزبـــوەوە. ویـــرای ئەوەی کە میـــژوو لەم بارەوە زۆری لەســـەر نەڕۆیشتـــووە، بەلام وەك لە پێشینـانم بیستـووە، دوای نیشـان کردنی زەرین کولاهـ، ئەو گەوهـەرە گرانبـاییە ئەختەربلیندە، بە هاوسەریی خان ئەحمەد خان قاییل نەبوو.

حەزرەتـی پاتشـــا کە لاوچـــاکیو ئازایـــەتیی خان ئەحمـــەد خانی لێڕوون بووو دلێـریو کەلـەمێـردیی کە جێگـەی شانـازیی بنـەمـالەی ئەردەلان بوو، لە ئاوێنـەی بیـریدا ڕەنگیدابۆوەو سەردەرانەی تالاری بە بوونـی بەختـــەوەرنـــەیـــەوە ڕازانـــدبـــۆوەو بە فەری هێنـــابـــوو،

زەرین کولاهی بۆ ئەو جێگایە کە ئاسمانی بوو ، لەسەر زەوی جێگیر بــوو، لە تەنیشت خۆیــەوە دانــا، ئەنجا فەرمانی دا کە لە دەرگــای حەوشــەوە خان ئەحمــەد خان بێنن و لە دەرگــایەکی دیکـەیشـەوە.
نەرەشێرێکیان ، کە چەندین ساڵ بوو لە کن شێرەوانەکانی شا لە زنجیر درابوو، بەرەڵڵاکـەن شێـری تایەن لەوچەقی مەیـدانـەدا هەڵی کردە سەرخــان ئەحمــە دخـان و پەلاماری‌دا . ئەو هوژەبـرە چاونـەتـرسـە نەسلەمی‌یەوە، یەکسەر شمشێری دلێریی هەڵکێشاو بە هێزی بازووی شێـرانـەی‌و دەمی شـمشێـری دلێرانەی شێرەکەی کوشت و لەناوی‌برد .
شای سەفــەوی ئەگــەرچی ئازایــەتی‌و دلێـریی خان ئەحمـەدخـان و لەبـەرچـاو زیـاتـر بوو، بەلام لە کوشتنی شێـرەکـەو بێباکیی ئەو دلێرە، ناوبراوی سەرزەنشت کرد . خان ئەحمەد خان لە وەلام دا فەرمووی، ئێمـە دوو شێـری هاوتاو دلاوەر پەلاماری یەکترمان دا، یەغباڵ هێنای‌و بەخت سوار بــوو. من ئەوم بەزانــد . شا فەرمایشتـە جوانـەکـەی ئەو لاوچـاکـەی زۆر بـەدلەوە چووو زەرینکولاهـ بە هاوسەریی ئەو هومای کەشکــەلانی بلینــدی‌یـە شاد بوو . ئینجـا بە ڕێ‌ورەسمێکی شایـانی شاریـاران بی‌و بە بەزەك و دوزەك و دەبـدەبـەو سەنسـەنەیێکی لە شانی گەورەپیــاوان بوەشـێنـتـەوە هەردوو پرشـنگــدار جووت بوون ویە یەك گەیشـتـن [١٧] کە ماوەیـێکی زۆر خان ئەحمــەد خان لە باوەشی پەروەردەکـردنی شادا نوقـرەی گرت . شا ڕوژ لە دوای ڕوژ پلەوپـایـەی بلّینـدتـر دەکـردەوەو چەنـدین سال بوو شا زۆر بە ئارەزووی دیـدەنی هەڵـوّخـانـەوە بووو لەمیــژ بـوو مرخی لە داگیـرکـردنی کوردستان خوش کردبـوو، بەلام سەبـارەت بە سەخـتــی‌و دژواریــی قەلاّو قەلاّیچـەکانی کارەکەی بە شەڕوشوّڕ بوّ جێ‌بەجێ نەدەکرا . سەرەنجام

لە دووی خان ئەحمەدخانی ناردو دووبەدوو بە یەك گەیشتن. ڕایەخی بەزم و ڕابواردنیان ڕاخست و لەپاش خۆشەویستی‌دەربڕین و دلسۆزی‌و نوازشت دەرخستن مەبەست و نیازی ڕاگەیاندی‌و گەنجینەی ڕازی بۆکردەوە. فەرمووی: لە مێژە من بە ئارەزووی دیدەنیی باوکتەوەم، بەلام لەبەر سەخت و دژواریی قەلاو قەلایچەکانی کوردستان نەمان توانیوە ئەم ئارەزووەمان بەدی بهێنین و لەم ڕووەوە شەرمەزارین. جا ئێستا، کە تۆ پێوەندی‌یەکی تەواوت لەگەل ئەم دەولەتە بەرزەدا هەیە، هەر کاتێ گەڕایتەوە بۆ کوردستان، سا بە هەر فێلێ بێ، هەلۆخانمان بۆ دەربار ڕەوانە بکەو خۆت سەری کارەکە بگرە دەست. بێ گومان ئەم کردەوەیەت دەبێ بە مایەی ڕەزامەندی پاتشاو بەرزبوونەوەی پلەو پایەت وسەری پێوەنازینت دەگاتە ئاسمان.

خان ئەحمەد خان بە هۆی زاوایەتیی پاتشاو تەماحی حوکمڕانی‌یەوە بەلێنی‌دا کە خواستی شا بەجێ‌بێنێ‌و بەم جۆرە بە دلنەوایی‌یەکی زۆرو خەلاتێکی گرانبەهاو بەخششێکی فرەوە لە دەرباری‌سەفەوی ترازاو بەرەو کوردستان بەڕێ‌کەوت. کاتێ گەیشتە ئەوێ هەلۆخان لە مێژبوو کوڕە بەڕێزەکەی نەدیتبوو، وەکو ڕوحی خۆی لێی‌نزیك بوو،و بەوپەڕی ئاسوودەیی‌یەوە ڕایان دەبوارد. خان ئەحمەدخان کەوتبووە سەر ئەو نیازە باوکی بگرێت و بۆ دەرباری ئەسفەهانی بنێرێ. خۆی لە پیاوماقوولان و گەورەپیاوان نزیك خستەوەو دەرووی خۆشەویستی‌و میهرەبانیی بۆ خستنە سەرپشت. هەریەکەیانی بە پێی پلەوپایەی خۆی بە خەلاتی گرانبەهاو ڕێزو بەزەیی زۆرەوە نرخ لێ‌دەنا، تا ڕۆژێکیان هەلۆخان کۆڕێکی بۆ کوڕەکەی ڕازاندەوە، لەو کۆڕەدا پیاوماقوولان و سەرانی سەرلەبەر هەموو کۆکردبوونەوە. خان ئەحمەد خان

سەرکارەکەی راسپارد شیرینی و نوقل و نەباتی زۆری ئەسفەهانی بۆ دانیشتوان هێنا، تا دەمیان شیرین کا. هەڵۆخان گورجی، لە کارەکە گەیشت و دڵی زۆر نارەحەت بوو. فەرمووی، بە شیرینی و فروفێل دەمی منت لە گوژاڵك تاڵ تر کرد. گوایە دەتەوێ، هەر وا بەم زمانلووسی یە چمك و داوێنی فەرمانڕەوایی یەکەم لە دەست دەرێنی؟ کار گەیشتە ناخۆشی و کیشەوبەرەو خان ئەحمەد خان کوڕەکەی بەجیٚ هێشت و لەوێ هەڵبرا، چوو سواری ئەسپەکەی بوو. لەتەك هاودەستانی دا لە دەرەوەی قەڵا گیرسایەوەو لە دژی باوکی راپەڕی و دەرووی مافی باب و فرزەندیی لە خۆی بەجاری پێوەدا. قەدەری لە دەرەوەی قەڵا بە شەرمەزاری یەوە مایەوە. ئینجا لەو گفت و بەڵێنەی بە شای دابوو، دەستەپاچە وەستاو لە دەشتی بەرینی سەرگەردانی و رووزەردی دا هەر وا دەتلایەوەو بۆ خۆیشی نەی دەزانی چی بکا...
هەڵوخانیش لەم ماوەیەدا دەرگای قەڵای داخست. ماوەی گەمارۆدانی قەڵا زۆری درێژەکێشا، لە ناکام دادایکی خان ئەحمەد خان یاساوڵ و دژدارانی قوڵلەو بورجەکانی فریوداو لە ژێرەوە لەگەڵیان دەستی تێکەڵ کردو بڕیاری دا لە نیوەشەودا دەرکەی قەڵا بکەنەوە تا خان ئەحمەدخان بێتە قەڵاوەو کاری باوکی تەواو کاو فەرمانێکی لە ئەستۆی خرابوو جێ بەجێ کا. بۆ راگەیاندنی ئەم موژدەیە مەلا یەعقووبی، کە باوەگەورەی مەلا عەباسی شیخولئیسلامە، ناردە کن خان ئەحمەدخان و بەگفت و بەڵێنی خۆش دڵی خۆش کرد. پاش ئەوەی مەلا یەعقووب گەڕایەوە بۆ ناو قەڵا، پیاوێکی سەر بە هەڵۆخان بەم کەین و بەینەی زانی و راستیی مەسەلەکەی لە خان گەیاند. هەڵۆخان یەکسەر فەرمانی بەندکردنی مەلا یەعقووبی دا. بڕیاردرا، هەر بۆ سبەینیی ئەو ڕۆژە بە

سەختــی سزا بدرێ. چون خوا وای فەرمــان لە سەربــوو، مەلا یەعقــووب ڕۆژی تەواو نەبێ، سەرلــەئێــوارە کە لەشکـری تاریکی هێـرشی هێنـایە سەر ڕۆشنایی خۆر، شاهەنشـای مانگ لەگەڵ سوپای ئەستـێــران دا هەڵیــان کردە سەر ڕوونــاکیی خۆری تاونــاك. خان ئەحمـەدخـان بە پێی تەمێی دایکی و پشت وانی خودای دادگـەر هاتە بن قەڵاکـەو بە یارمـەتیی پەیـژەی بەزەییی خوداوەنـد بەرەو قوللەکـانی قەڵا وەسـەرکـەوت. برێکی لە دڵسـۆزانی دەوڵـەت بۆ پاسـەوانیی دەرکەی قەڵاو بورج و بارۆو وارشــەکــان هەڵ بژارد. خۆیـشی هاتــە ناو سەرای دەوڵەتەوە، چووە ناو حەرەمسەراوە، لە کاتێکدا هەڵۆخانی باوکی لەسەر جێگای حەسانەوە پاڵی دابۆوە، خان ئەحمەد خان لەگـەڵ چەنـد هاوڕازێکی خۆیدا هەڵی کوتـایـە سەری و چاوی لە مافی باوك و فرزەندی پۆشیو باڵبە ستی‌کردو هەر لەو کاتەدا لەگەڵ چەند یاساولێکی ئازاو چاونەترسی‌دا ڕەوانەی ئەسفەهانی کرد. مەلا یەعقـووبیشی لە بەنـد ڕەهـاکـرد و دڵنەوایی‌یێکی زۆری کرد. پاش گەیشتنی هەڵـۆخـان بە دەربـاری سەفـەوی ڕێزێکی زۆری لێ‌نرار خرایـە ژێـر ئەوپـەڕی چاوێری‌و بەزەییی پاتشـایانەوە. لە کتێبەکەی خواڵێ خۆشبـوو مەلا محـەمـەد شەریف دا بەم شێوەیە باسی‌کراوە.
هەڵـۆخـان پاش ئەوەی گەیشتـووەتـە ئەسفـەهـان بە چەنـدین جۆر پێشــوازو بەزەی شاریــاری دڵشــاد کراوەو تا ئەو ڕۆژەی مردووە، ڕۆژگاری ژیانی بەوپەڕی ڕێزلێ گیرانەوە بە سەربردووە، بەڵام بە پێی نووسینی خوســرەو بەگی بەنی ئەردەلان. هەڵــۆخـان پاش ئەو هەمـــوو ڕێــزو دڵنــەوایی‌یـە زۆرانـەی کە ئەمـەیش ڕێ‌ورەسمی پاتشــایــانــەو ڕەوشتی خوســرەوانــەیـە بە خەڵاتێکی زۆرەوەیـان

ناردووەتەوە بۆ ولاتی خۆی و بڕیاردراوە کە هەرگیز دەست لە کاری فەرمانڕەوایی وەرنەدات و دوورەپەرێز بژی. (خودا هەر بۆ خۆی لە هەموو کاران ئاگادارترە).

## لەبارەی جیهانەوانیی خان ئەحمەد خانی کوڕی هەڵۆخان و کورتەیێك لە سەربردەی ئازایەتیو کەڵەمێردیی ئەو خودانە

چون لە ساڵی ١٠٢٠ دا خانە ئەحمەد خان بێ ئەشکەنجەو ئازار بووکـی وڵاتـی بە هەزار نازەوە لە باوەش گرت ، شنـەی خۆش و شادی بە سەرگەورەو بچووك دا هەڵیکرد، بڵیندو نەوی بە بەزەی هەمـە تەرزی ئاسـوودە بوون ، پیـاومـاقـووڵان و ژێـردەستـان سەرلـەبـەر، لە سای لوتفی بێ پایـانیـەوە ، بەوپـەڕی شانـازی گەیشتن. ماوەیێکی زۆر لە پێنـاوی کامـەرانیو خۆش گوزەرانیی خەڵکی وڵات دا تێکـۆشـا. هەریـەکـەی بە پێی پلەو پایـەی خۆی نازەکێشـا. خزم و بیـانی لەلێشـاوی دەهنـدەیی بەهـرەمەندبوون، داراو نەدارا لەبەر چاوی یەکسان و خۆشەیست بوون . تا کاتێکی کەڵـکـەڵـەی وەدەست هێنـانی وڵاتی ڕۆمی کەوتـە سەر [١٨] و بە لەشکـرێکی لە ژمـارەی ستێـران بەدەر هێـرشێکی تونـدو تیژی بردە سەر تیـرەی بڵبـاسی شەڕخـوازو هەڵی کردە سەر مەڵبـەنـدی ئەو بەدئاکارانەو ناوچەکەیانی داگیرکردو ئاڵای سەرکەوتنی هەڵ کرد [١٩]

تیرەی بلباسیش پاش بیستنی ئەم هەواڵە لە شکریکی لە ژمارەبەدەری کۆکردەوەو بە هەزار ترس و سامەوە دەستیان دایە شیر و تیر و ریسان لە خان ئەحمەد خان گرت و بەرەوبری‌یان لی‌کرد. سوپای سەرکەوتووی ئەردەلان لە ترسی ئەو میرە ولات گیرە، بە پێی ری ورەسمی زگماکی لە خوبوردوویی یەکسەر تیغی زاخاودراوی لە کالان هەل کیشاو بەوپەری بی‌باکی‌یەوە هەلیان کوتایە سەر لەشکری وەك دەریای بە جوش وخروشی بلباس و بە هیرشی مەردانەو نرکەی دلیرانە ئەو سوپا لە ژمارەبەدەرەیان بەزاندو سەرەنجام زوربەی سەروك و یەکەپیاوانی ئەو هوزە کوژران و چەندین لەو کینەلەدل و بەدبیرانە بەدیل گیران و سەرشورکران. هیندیکیش لەوانەی، لەو تەنگە و چەلەمە پرمەترسی‌یە رزگاربوون ژیانیکی سەرلەنوی‌یان وەدەست هینایەوەو بەرەو ولاتی خویان گەرانەوە.

بلباسەکان مال و کوچ و پەیرەوانی خویان کوچ پی کردو لە جیگاییکی سەخت دا ، کە لە کاتی ئەم جورە ریکەوتنانەدا پەناگایان بوو، جیگیربوون و ئەوانەی لەو شەرەدا بەزیندویتی مابوونەوە بەرەبری‌یان لە لەشکری نەبەزی ئەردەلانی یەکان کردو دەستیان بەشەرکرد .لە یەکەم هەلمەت دا چەند شیردیکی ئەردەلانیان تخیلی زەوی کرد، سەرەنجام ئەردەلانی‌یەکان هیرشیکی دلیرانەیان بردە سەریان و هیممەتیکی پیاوانەیان بو تەفروتونا کردنیان نواندو ئەو تیرە شەرخوازەیان بە جاری لەناوبردو دوایان برینەوە. بلباسەکان کە چاویان بەم حەشەوهەنگامەیە کەوت، هەر بە هەموو هەلاتن.

هەرچی دڵیرانی ئەردەڵان بوون ئەسپی تیژڕۆیان هێنایە جووڵەو دەسکەوتێکی زۆریان لە ماڵ و سامانی ئەو بەدمەزەیانە وەدەست هێناو لەوێرا ئەسپی عەزمیان تاوداو تا ئەو جێگە سەختە، خۆیانیان تێدا قاتم کردبوو ڕیشەیان شل نەکرد. چەندمار ڕۆژی گەمارۆیان دان و ڕێی هاتوچۆو کاروباریان لێبەستن تا بەم شێوەیە داوێنی دان بەخۆدا گرتن و سەبریان لەدەست بدەن و واز لە لووت بەرزی بێنن و مل کەچی قوبووڵ بکەن. ئەگەرچی دوایی، هێرشەکەیان ڕاگرت بەڵام ئەم ڕووداوە لە هەموو کانگای دڵیانەوە نەبوو. لەبەر ئەوەی ڕێگای بەوێ گەیشتنی یەکجار سەخت و تووش بوو و بواری شەڕوشۆڕیان نەبوو، لە سەروبەرنانی ئەم کارەدا سەریان سورماو لەو دەشتەدا سەرگەردان مانەوە. سەرەنجام ڕۆژێکیان کەڵەژنێکی جوانی ژیرو زیرەکی ئەو تیرەیە ئارەزووی گەشت و سەیران دەکا. دەوروبەری سوپا بێ سەنگەرو سوپەربوو. بەرێکەوت تووشی بوو بە تووشی کاربەدەستی خانەوە، لێی پرسی هۆی لێرە هەوارگرتنیان لەبەرچییەو ئەم هەموو خۆئامادە کردن و خۆسازکردنە لەبەر کێیە؟ کاربەدەستەکەلە وەڵام دا گوتی (هۆی هەوارگرتنمان لێرە ئەوەیە ڕێگاوبان نییەو ڕێڕەوەکە زۆر تەنگەبەرەو بە ئاسانی توانی لێوە دەربازبوونمان نییە. ئەو ئافرەتە شەنگە بە ئانووت و پلارێکی نازو عیشوە ئامێزەوە، بوو بە باوەشێنی بڵێسەی ئاگری توورەیی و ڕکی خان. هەر دەم وەدەست فەرمانی ئامادە بوونی لە شکری سەرکەوتووی داو چیرۆکی ئەم ژنە نیهادپاکەی لە نووکەوە بۆ سەردارانی سوپا گێرایەوە. سەردارانی سوپایش دەسبەجێ دەستیان لە گیانی خۆیان شوشت و دەستیان بە

قلفی توندوتۆلی فەزلی خوداوەندی دوو جیهانەوە گرت و لاوانی خەنجەربەدەست بە تێخی ئاودارەوە چاکی ئازایەتی‌یان لێ‌هەڵ کردو دەستیان دایە شیرو رم و بە یارمەتیی خودای بێ هاوتا روویان کردە سەر لوتکەی چیاکان و لە نشێوانەوە بەرەو هەورازان هەڵ کشین و دەرووی شەڕوشۆڕیان لە رووی دژمنان هاویشتە سەر گازی پشت. ئەم تیرە چارەبەدە ئەم هەنگامەیەیان دیت دەسبەجێ دەستیان بە شەڕ کردو بە تەقەکردن و گابەردگلۆرکردنەوەوە تێ‌هەڵچوون و ئەو دلێرە رۆستەم ئاکارانە بە تیخ و تیرو تەورەوە خۆیان گەیاندە سەنگەرە بەسامەکانیان و نیرو مێیان لە تێخ کێشان[20] و پاشماوەی ماڵ و سامانیان بوو بە دەسکەوتی ئەو سوپا سەرکەوتووەو لەشکری زاڵ بوو بە دیل و یەخسیرێکی زۆرەوە، لەوە زێتر پێوەنە چوو بە سەرکەوتن و زاڵ بوونەوە گەڕایەوە[21] . فەرمانڕەوایانی سابلاخ و مەراغەو ئەو ناوچانە بە بیستنی ئەم سەرکەوتنانە بێ چەندوچوون بە دیاری‌و پێشکێشی نایابەوە دەستەونەزەر روویان لــــــە بارەگای کردو ئەوپەڕی لە خۆبردن و خزمەتگوزاری خۆیان نواند. سەرکاری خانی ئەو ناوچە بەدەست هێندراوانەی یەکە بە یەکە بەرەوڕووی فەرمان ڕەوا دڵسۆزەکانی دەوڵەت کردەوە. پاش دوایی‌هاتنی کاروباری خان لەو ناوە، بە سەربەرزی‌یەوە لە رێگای کۆیەو هەریرەوە بەرەو ڕەواندزو عیمادی‌یە دای‌کێشا چەند کەسێ لە کوڕانی بارام بەگ کوڕی سورخاب بەگ کە پێشتر باسمان کردن و لەسەردەمی حوکمڕانیی باوکی‌دا فەرمانڕەوایی ڕەواندزو عیمادی‌یەیان پێ‌سپێردرابووو بە هۆی ناسازیی رۆژگارو چارەنووسی پەروەردگارەوە لە فەرمانڕەوایی کەوتبوون و پەست و

سەرشۆڕ ببوون، بە بەزەیی و نوازشتی خوسرەوانەیەوە کۆی کردنەوەو دوو سێ کەسێکی لە سەرۆکەکانیان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی جێگرکرد. لە ئاکامی بارانی بەزەییەوە چیمەنی دوواڕۆژیان گەشەی کردو لە سای لێشاوی چاوێرییەوەی تەلاری بە شان وشکۆیان ئاوەدان بۆوە. هەروەها ڕەواندزی بە قەرەحەسەن بەگ و خۆشناوی بە خالید بەگ و عیمادییەی بە عوسمان بەگ سپاردو لەسەر تەختی حوکمڕانیی چەسپاندن و ژەنگی پەستی و خواریی لە ئاوێنەی دەولەتیان سڕییەوە.

لەبەر ئەوەی حەسەن بەگ لە ڕووی شۆخ و شەنگی و دلێرییەوەو لە ئاکارپەسندی و فەزڵ و کەماڵ و ڕەوەشتی مەردایەتی و ئازایەتیدا لە سەرووی ئەوانی دیکەوە بوو، خەڵات کراو بە سەرکردەی ئەو هۆزو تیرەیە هەڵ بژێردراو بە گەورەیی خۆی فەرمانڕەواو سەرلەبەری ئەو بنەماڵەیەی خەڵات کردو تا ئیمرۆکەیش کە ساڵی ۱۲٦۲ی کۆچییە فەرمانڕەوایانی ڕەواندز وەچەی ئەون. دەگێڕنەوە، تیرەی حەمەرەشید بەگی وەکیل بە ڕەچەڵەك، لە چەند سەرێکەوە ، دەچێتەوە سەر خالید بەگی میری خۆشناو [٢٢] لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خان ئەحمەد خان دا هێندێکیان هاتوونە کوردستان [٢٣] و بە پلەی وەکیلی سەربەرزکراون. پاش ئەوەی خان ئەحمەد خان کاروباری ناوچەی بلباسەتی و ڕەواندز و عیمادییەی سەروبەرناو ئاسوودەو سەرسووك بوو ، بڕیاریدا هەڵ کاتە سەر تیرەی داسنی و خالیدی. کاتێ گەیشتە نزیکی وڵاتی ئەم تیرەو هۆزانە یەکسەر لەم هەڵکردنە سەرە ئاگادار بوون و زۆر پیاوانەو بەو پەڕی ئازایەتی و دلێرییەوە هۆزەکانی خۆیان خڕکردەوەو بڕیاری

شەریان دا. هونەروەرانی ئەردەڵان وەك سەمەندەر[٢٤] بەرەو ئاگر هەڵیان کوتاو ریزیان تێك وپێك شکاندن و لە یەکەم هەڵمەت دا بنەرەتی بوون و توانیانیان لە بێخ و بنیچەوە لەبەریەك هەڵتەکاندن و هەرچیەیە کیشیان رزگاربوون بەم لاو بەولای ولات دا ئاوارەبوون و پەرت وبلاوبوونەوە . یەك سەڵە فانی مەیدانی ئازایەتی بە یەغبالی روونەوە شەووروژی وەدووی داسنی و خالیدی کەوتن و دیل و بەرزەولاخ و سامانیکی زۆرو زەوەندیان لێ وەدەست هێنان و زاڵ بوون و بەسەریان دا سەرکەوتن. هەر لەو شوێنەوە خان هەمەکارانی بەرەو کۆیەو هەریر ناردو خۆیشی بە سەرکەوتنەوە بەرەو مووسڵ چووو ئاوازەی هاتنی لەشکری بە گوێی فەرمانرەوای مووسڵ گەیشت .ئەویش کە بەمەی زانی پەشوکا. نەیتوانی بەرەوبەری لێبکا، ناچار بۆ حەلەب هەڵات. پیاوماقووڵان و سەرۆکانی مووسڵ بە دەس ودیاریەکی زۆرو گرانباییەوە چوون بۆ خزمەتی ئەو میرە ولات گیرەو سەری گوێبەفەرمانیو مل کەچیان بۆ دانەواندو خانیش زۆری ریزلێ گرتن و یەکە یەکەیانی بە خەلاتی گران بایی خەلات کردو سەری بلیندکردن و لەتەك فەرمانرەوای تازەیان دا گەرانەوە بۆ جێی خۆیان.

دەس ودایەرەی خانسی سەرکەوتوو بێ هیچ کۆسپ و شەروشۆری، بێ هیچ بگرەوبەردەیێ ناوچەکەی بە پێوقەدەمی رازاندەوەو بە دیدەنیو زیارەتی یونس پێغەمبەر شەرفمەندو بەهرەدار بوو. نامەی سەرکەوتنی بە هەموو لایەك دا بلاوکردەوەو خۆیشی لەو مەلبەندەدا چل رۆژی مایەوە. پاشان فەرمانی بۆ خەڵکی مووسڵ دەرکرد. کە کارگەران و دەس وپێوەندانی خۆیان بنێرن خەڵەو

خەرمانی حەسەن ئاباد بکوتن و دانەویلەکەی خرکەنەوە. کە لەو ڕۆژانەدا سەربازە دلیرەکان، پاش ڕیکردنیکی زۆرو ماندوبوون خۆیان و ئەسپ و ولاغەکانیان پشوویکی چاك بدەن و تیکرا سەرئاسوودە بن. ئەوجا فەرمانی بە میرزاو نووسیارانی دا، ڕووداوی ئەم سەرکەوتنەو ڕاستیی ئازایەتیو بویریی لەشکری ئەردەلان بە دوورودریژی لە دەرباری ئەسفەهان ڕاگەیینن، سەرەنجام ئەحمەد خان لە لایەن دەرباری ئەسفەهانەوە بە پشتوینی گەوهەردارو ئەسپی ڕەسەن و چەك و زینی زیرین خەلات کراو دنەدرا، بەغدا داگیرکا. خان ئەحمەد خانیش پاش سەروبەرکردنی باری ئەو ناوچانەی بە دەستی هینابوون، لەشکری کردەسەر ناوچەی کەرکووك و قەلاکەی. هەرچی تیرەو هۆزی ئەو ناوە هەبوون سەرلەبەری خستنە ژیر قەلەمرەوی خۆی، تا گەیشتە دەوروبەری بەغدا. بەغدا ئەگەرچی شاریکی یەکجار ئاوەدانەو قەلایەکەی زۆر سەخت و دژوارەو نیشتەنییەکانی لەوپەری توان و ئامادەییدان، بەلام گرتنی لەسەردەمی هیچ کەلەپاتشاییکی تاجداری ئازاو گەرناس دا سەری نەگرتووەو هەرگیز ملی بۆ کەس نەداوە. ئەوەندە هەیە، لەو سەروبەندەدا، چونکە دەبدەبەی ئازایەتیو کەلەمیردیی ئەو کەلەمیرە بەرگویی پیرو لاو کەوتبوو، خەلکی بەغدا ویرای ئەو هەموو توان و خۆتەیارو ئامادەکردنە ترس وسامیکی لەکیش بەدەری ئەو خودانە خوسرەونەژادەیان چووبووە دلەوەو هەرچەندیان دەکردو دەکراند، زاتیان نەدەکرد بەرەنگاریبن و لیی ڕاسین. هەروەکو لە سەرەتاوە بە هەزار ترس و دلەلەرزەوە هیرشیکیان برد، بەلام زۆری نەبرد وازیان هیناو ملیریك کەوتنیان دا.

بەپێی نووسینی مەلا محەمەد شەریف، دەرویش محەمەدبەگی سوباشی بەغدایی، لە دڵی خۆیدا مەیلی ملکەچیی هەبووە، لەبەر ئەوە، ئەم رێک کەوتنە بوو بە هۆی دڵ بەهێزکردنی سەربازانی ئەردەڵان و پاڵپشتی بۆ سوپاکەی‌و بەم جۆرە چوونە ناو قەڵای بەغداوە. لەبەر ئەوەی کە خەڵکەکە حەزیان لە شەڕ نەبووو شەڕکردنیان لە بەرژەوەندی خۆیان نەدەزانی‌و سەرپێچی‌یان بە مایەی سەرلێ‌شێوان و لەناوچوونی خۆیان دەزانی بۆ رێک کەوتن هاتنە پێشەوە. کەتخوداو خاوەن پلەوپایەکان و گەورەپیاوان بە دەس ودیاری‌یەکی زۆرو گرانبایی‌یەوە هاتنە خزمەت و گوێ‌بەفەرمانی‌و مل کەچیی خۆیان لە راستی دەربری. پاش رەزامەندیی هەردوولاو شەڕو شۆڕکوژانەوە والیی (دارالسلام) بە خزمەتی جەنابی خان گەیشت و تانوپۆی دڵسۆزی‌و یەکدڵی خۆیان لێک رایەڵ کردو چەندین ئەسپی کەحێلەی رەسەنی عەرەبی‌و کەلوپەلێکی زۆری گرانبایی‌و چەندین جۆر دەست ودیاری‌یان پێشکێش بە خزمەتی کرد. ئیتر بەم جۆرە سەرکێشی‌و یاخیتی بە گوێ‌فەرمانی‌ومل کەچی گەراو ئاشتی جێگای ناکۆکی‌و کێشەوبەرەی گرتەوە.

هەر بۆ سبەینێی ئەو رۆژە میری بەختەوەر بە خۆشی‌و شان وشکۆو دەبدەبەو سەنسەنەوە تەشریفی گەیشتە (دارالسلام)ی بەغداو ئەو سەرزەوی‌یە پیرۆزەی بە فەری پی‌وقەدەمی خۆی شەرەفمەند کرد. لەو کاتەدا وەزیری بەغدایش چەندین پێشکێشی شایانی بۆ خزمەتی هێناو لەگەڵ ئەمیران و بەرپرسیارانی دەوڵەتیش دا کەوتنە چاک وخۆشی‌کردنێکی کەم وکوڕ. پاش چەند رۆژێ کە

دەستی لە کاروباری بەغدا بەتاڵ بووو بە هەموو ئامانجێکی خۆی گەیشت، بەرەو ئەردەڵان گەرایەوەو پیرو ولاوی بە پیرو قەدەمی پیرۆزی شادمان و دڵخۆش کرد. مێژوونووسان ماوەی ئەم سەفەرەیان بە حەوت ساڵ لەقەڵەم داوە. هەرکە دەنگ وباسی گرتنی بەغدا بە شاعەباس گەیشت، شا لەوبنەماڵەیە بەژن وژن خوازی نزیك بوونەوەی بە مایەی شانازیو شان وشکۆ بەرزبوونەوەی خۆی زانیوسەرلەنوێ بە دەس ودیاریی گرانبایی و خەڵات و نوازشت دەربرینی دڵسۆزانە پایەو نرخی هێندەی دیکە بەرزکردەوە. ئەویش بەوپەڕی توانیەوە فەرمانڕەوایی، بە ئارەزووی خۆی، لە وڵاتی پشتاوپشت بۆبەجێماوی‌دا بەڕێوەدەبرد، تا ئەو ڕۆژەی کە شاعەباس فەرمانی خودای بەجێهێناو بە پێی گوتەی خودای گەورە «كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والاكرام» گیانی بە بەهەشتی بەرین شاد بووو شا سەفی جێگای ئەوی گرتەوە.

شاسەفیش هەرلەسەرئەو ڕەوشت و ڕێورەسمەی باوکی لەسەری دەرۆیشت لەگەڵ خان ئەحمەد خان دا مایەوە. هەروەها سورخاب بەگی کوڕی‌خان ئەحمەدخان کە گەوهەرێ‌بوو لەسەدەفی زەڕین کولاهـ دەرچووبووو لە باوەشی شاعەباس دا گەورە ببوو لەسەر یاسای کۆنی باوکی خزمەت و هاودەمیی شاسەفیشی لە ئەستۆگرتبوو. شاسەفی چونکە نیشانەی زیرەکیو زانایی تێدا بەدی دەکرد دڵی لێی کرمێ بووو کەڵکەڵەی لەناوبردنیی کەوتە کەللەوە، تا ڕۆژێ شاوێردی خانی لوڕ کە پێشتر باسمان کرد، (بەیارمەتیی عومەر بەگی کەلهوڕ لەشکری کردە سەر تەیمورخانی مامی خان ئەحمەد خان و نێوان هەردووبنەماڵەکە لە نوێ‌ژەنەوە تووشی کێشەر

دووبەرەکی بوونەوە). شاویردی خان چونکە رك و کینەی کۆنی لەدلـدا هەبوو، لەم سەردەمەدا هاتە خزمەتی شاسەفی، پاش وتوویژیکی دوورودریژ لە هەموو بابەتی مەسەلەکەی خستە دەستی شاویردی خانەوەو داوای راوتەگبیری لی کرد. ئەو بەدبەختە بەدناکارە، کە هیشتا تالاوی شمشیری ئاوداری دلیرانی ئەردەلانی لەزاردا مابوو، پیی گوت، سورخاب بەگ لاویکی ناکارپەسندەو تا بلیی پیاوەو خاوەن ئەقل و ئاوەزە، چەندی بفەرمووی ژیرو وشیارە ، سەرباری ئەمەیش باووباپیرانی دەستی دەسەلاتیان لە زوربەی ولات و ناوچەکاندا درژیژبووەو خویان بە سەروەرو خودان زانیوە، تەنانەت ئەگەر خوی بە خاوەن هەق وماف بزانی بەندوباریکی لەگەل سەلتەنەت و خیلافەت دا بوویەتی، هەقیەتی و بەجی یە. لەبەر ئەوە دەبی بەهەر نرخی بی تازووەو دەرفەت لەدەست نەچووە، بەلاویتی لەناوببری. ئەم ئەفسانەیەی شاویردی خان چوو بە میشکی شاوەو دەسبەجی فەرمانی چاوهەلکولینی داو میرغەزەو بی سیودوو چاویان هەلکولی و پیشانی شایان دا. پاش چەندماوەیی ئەم خەبەرە شورمە گەیشتە خان ئەحمەد خان، پەنا بەخوا خان ئەحمەد خان لە ژیان بیزار بووو بە دەم ئاخ ونوخ و نالەو فیغانەوە ئارام ونوقرەی لی برابووو خەوی لەچاو نەدەکەوت و لە وەسفی ئەو نووری چاوەی‌دا ئەم چەند بەیتەی گوتووە:

بی تو ئەی گیانی جیهان بەم دلی خویناوی‌یەوە چ بکەم! لەناو
بی‌چاویی تو ئەی چاوی دنیا بین چ بکەم!
بی گوناهـ چاویان هەلکولیت.
کویرا ییم دایی بلی سنی بیچارە چ بکەم؟

سەرەنجــام بە نەخــوشی سەوداو ماخــوڵان گرفتــاربــووو ماوەی ساڵــێــکــی رەبــەق، سەرەرای هەزار داودەرمــان و پزیشك و پزیشك کـــــــــاری هیــچ چارەســەرێکی نەبــوو. تەنــانــەت کار بەرادەیێ گەیشت ناچار کوت وسندمیان کرد. دەگێرنەوە، ئیسماعیل بەگی عنیـایـەتـولـلا بەگ کە لەو سەردەمـەدا بەپلەو پایـەی وەزیـری گەیشتبــوو بە راوتــەگبیــری جوانی. لەو ماوەیـەدا خان لەکـوت و زنجیردرابوو،ئەو کاروباری ولاتی‌دەگێــراو هیــچ کەم وکـووریـیەك نەدەکەوتە کاریەوە. تا پاش ساڵێك بە یارمەتیی خودای گەورە خانی مەزن چاك بووەو بەخوهاتەوە. شاعیران مێژووی نەخوش کەوتنی خانیان بەحیسابی نەبجەد بەم تاکە شیعرە تومارکردووە: « در غلط گشت ابله و مجنون »[٢٥].

پاش ئەوەی لەم بی هوشیـیە بەهوش هاتەوە جارێکی دی دلی بو کارەساتی کورەکەی بەجوش هاتەوە، سەرەنجام ، ناچار سەرپێچیی لەشا سەفی کردو لە گەل سولتانی روم دا رێك کەوت و لە ئێران دەستی بەتالان و برو کردو هەرچی یەکی لەو تالانە وەگیردەکەوت دەی دایـە هاوسـەنگـەرانی خوی. خان ئەحمـەد خان کرمـاشــان و هەمـــەدان و گەرووس و ورمـیو سەنـقــەری گشــت خــستــە سەر قەلـەمرەوی ولاتـەکـەیو هەرچی ناوچـەکـانی دەوروبەریش بوون سەرلەبەری تالان کردن[٢٦]. هەرکە ئەم هەواڵە بەشا سەفی گەیشت، زاڵ خان و سیـاوەش خان کە هەردووکیـان لەشـاوە نزیـك بوون، کران بە سەرکردەی سوپایەك لە هەڵمەت و نەبەردا وەك شەپولی جەیحوون و لە بێ شوماری دا لە پێکورە و مێرۆ زووتر بوو بو لە ناوبردنی شەری خان ئەحمەدخان. خان ئەحمەد خان بەبیستنی ئەم

هەواڵـە بەجـاری ڕێگـای سەرپێچیی گرتـەبەرو لەشکـری خۆی خرکردەوەو خەبەری لەشکرکێشیی شای ئێرانی ڕاگەیاندە دەرباری سوڵتانی عوسمانیو داوای کۆمەگ و یارمەتیی کرد. لە لایەن پاتشای ڕۆمــەوە مەنــووچـەر خانێکی بە یاریـمەوە هات. پاش ڕێگـاوبـان بڕینێکی دووروودرێـژو چەنـدین قۆنـاخ هەردوولا لە کن دەریاچەی مەریـوان کە هەمیشـە شوێنی شەڕو لێکـدانی ئازایـانی ئێران و ڕۆم بوو، دەگــژیــەك ڕاچــوون. ئەو دوو لەشکـرە گەورە و گرانـە بە تونـدوتیـژی خرۆشـان و بانگی « ان زلـزلـە السـاعـة لشیء عظیم» بەرگوێ کەوت و شێرانی بێشەی ڕك وکین دەستیان دایە شیروتیرو هەڵیان کوتایە سەر یەکتر. لە یەکەم هێرشدا بێ گونا هێکی زۆر لە هەردوولا سەریـان تێداچووو سوپـای قزڵبـاش شکستیـان هێنـاو هەڵاتن. ئێـرانیـیەکـان کە دیتیـان سوپـای دژمن لە پشتیـانـەوەیـەو زۆنگـاوو زەمـەنـدی مەریـوان لەپێشیانەوەیەو خۆ لە ڕم و شمشێری پاڵـەوانــانـی مەیـدانی شەڕبــواردن کاریکی لەکێش بەدەرەو ڕێی هەڵاتنیان نییـەو لەو تێداچـوونە ناتوانن خویان ڕزگارکەن، نا چار بەتەگبیری زاڵ خانی سەردار دەستیان لەگیانی خویان هەل گرت و شمشێــری کین و تۆڵــەیـان لە کالان دەرکێشـاو هەڵیـان کردە سەر سوپای خان ئەحمەد خان و لەشکری ڕۆم. لەبەر ئەوەی سەرکەوتن بەدەست خودای گەورەیە ، شنەبای سەرکەوتن ئالای ئێرانییەکانی شەکـانـدەوەو سوپـای ڕۆم و لەشکـری خان ئەحمـەد خان ویـل و سەرگــەردانی هەڵـدێـری پەرێشـانی بوون و هێنـدیکیـان بە هەزار فروفێڵ سەری خۆیـان ڕزگـارکـرد. سەرەنجـام لەشکـری ڕۆم بە سەرشـکـاوی گەڕایــەوەو خان ئەحـمــەد خانیش لەگــەل برێ لە

خەڵکی کوردستان رەوانەی موسڵ بوون و هەر لەو ساڵەدا فەرمانی خودای بەجێ هێنا.

هەڵبەست

حەیف بۆ لاویی ئەو شێرە پیـــاوە
بۆ زۆری بازوو و بۆ دەست وبردی
ئێستایش نەم زانی ئایینی ئەم گێتی‌یە چی‌یە؟
کــەسی بە نەمـری تـێدا نەژیـــا.

بەراستی میرێکی ئازاو دلێرو دڵ وریاو خودانێکی بە دادو دەس بڵاو بوو. بە ئاکاری جوان رازاوەو بە رەوشتی پەسند ناسرابوو. تا بڵێی پیاوێکی بەسەلیقە بوو. دەگێرنەوە: جل وبەرگی کوردەواری کە یەکێ لە جل وبـەرگی پیـاوانـەیـە، داهێنانی دەستی ئەوە. دەڵێن یەکێ لە جوڵاکانی ئەسفەهان پارچە شاڵێکی پێشکێش بە سەرکاری پاتشـــا کردبـوو، چون خان ئەحمـەد خان لەو شوێنـەدا حازربـوو دایـانێ ئەویش بە سەلیقـەی خۆی کوردەواری‌یـانـە هەڵی دوورێ‌و لەبەری کردو هاتە خزمەتی شاو هەزار جاریان ئافەرین لێ کرد[٧]

## سلێمان خانی کوڕی میر عەلەمەددین خانی کوڕی تەیموورخان و چەند لاپەڕەیێ لە دەنگوباسی

پاش نەمانی خان ئەحمەد خان سالی ١٠٤٦ك سلێمان خان هاتە سەر تەختی فەرمانرەوایی. سلێمان فەرمانرەوایەکی دەهندەو دەریادڵ و خۆش ئاکاربوو. لە ئازایەتیو دلێریدا بێهاوتابوو. لە کاروباری سەرۆکایەتیو گەورەییدا خاوەن ڕاو تەگبیری خۆی بوو. لەگەڵ هەموو خەڵکی وڵات دا هەریەکە بەپێی پلەوپایەی خۆی دڵی ڕادەگرتن و لەگەڵ ژێردەستانیدا زۆر چاك بوو. مەیلی زاناو خوێندەواری زۆر بوو. بەشی زۆری کاتی بە خوداپەرستییەوە بەسەردەبرد. دەگێرنەوە: میرعەلەمەددین خان کوڕی تەیمورخان لە سەردەمی فەرمانرەوایی خان ئەحمەد خانی کوڕی هەڵۆخان دا کە ئامۆزای یەکتر بوون پەنای وەبەر سوڵتان موڕادی ڕۆم بردووە. کاتێ ڕۆژی خۆی هات هیچ کارێکی ئەوتۆی ڕانەپەڕاندو لەدەرباری سوڵتانی ڕۆم دا دنیای ڕۆشنی بەجێ هێشت. سلێمان خانی کوڕی، ماوەیێ لەخزمەتی خان ئەحمەد خان دا گوزەرانی کرد چونکە لە زۆربەی شەڕوشۆڕەکانی خانە ئەحمەد خان دا ئازایەتی و کەڵەمێردایەتیو پیاوەتیی نواندبووو نیشانەی گەورەییو مەزنایەتیی لە ڕەنگ وڕوودا بەدی کردبوو، هەر لەبەر ئەمە لێی پرینگایەوەو ویستی سا بە هەر دەك و دەهۆیە بێ لەناوی بەرێ. سلێمان خان کە سوێسەی ئەوەی کرد خان ئەحمەد خان چ

نیازێکی خراپی لەدڵ دایە، لە ناکاو ڕووی لە دەرباری شا سەفی کردو ماوەیی لەوێ بەهەزار ناخۆشی وەختی بەسەربرد. تا شا سەفی بە نیازی گوێڕاکێشان و مل کەچ کردنی ڕۆمی‌یان کە لە ئیرەوان بوون، ،لــە پێتــەختــەوە بەرەو ئەو ناوچــەیــە جمی. لە کاتی گەمــارۆدانی دژمن و شەڕوشــۆڕدا سلێمــان خان بە تەنهـا ئەسپی ئازایەتیی‌تاوداو هەڵی‌کردە سەر ئیرەوان و چەند کەسێکی لە ئازایانی ڕۆم سەرپەڕاندو لە خاکی سەرشۆڕی‌و خواری‌دا گەوزاندنی‌و پاتشا بەمە زۆری ڕێزلێ‌ناو پلەوپایەی بەرزکردەوە.

پاش مەرگی خان ئەحمەد خان لە لایەن دەرباری ئەسفەهانەوە خەڵاتی فەرمـانـڕەوایی ئەردەڵانی پێ سپێـردراوەو بەرەو ویـلایـەت چووەو بە فەرمانی پاتشا قەڵاکانی زەڵم و پاڵنگانی وێران کردووەو لە سەنـەنـدەج کەئـەو سەردەمە گونـدێ بوو بە ناوی سینەو جێگای تیرەی کەفش زەرینە بووەو ئەم تیرەیەش بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر تووس و نەوزەرو [٢٩] ئێستایش ژمارەییکی زۆر لە نەوەونەوێرەی‌ئەم بنەماڵەیە ماونەوەو لەوپەڕی چەرمەسەری ڕۆژگاردان.

سلێمـان لەم شوێنـەدا بنـاغەی چەندین خان ومان و مزگەوت و فێـرگـەی لێ‌داوەو شارەکـە ڕەنگ و ڕووی شارستانێتیی تێ گەڕاوەو لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ پێتەختی والی‌یە مەزن و پایەدارەکانی ئەردەڵانە.

چون جێگــای ئاوەدانی‌یــەکــە لە شوێنــەکــانی دەوروبــەری بڵنیـدتـرەوە، ئاوبـۆڕاکێشـانی کارێکی هاسـان نەبـووە، سەرەنجام ئاوێکیــان کە ئێستـا بە ئاوی پل.بەنــد بە ناووبسانگـە بە شێـوەی وشتـرگـەروو سەریـان خستووەو ئاویان گەیاندووەتە شارەکە. دوای فەرمانڕەوایی ئەو ، ئاوەڕۆکەی خراپ بووە. تا حەسەن عەلی خان

له سالی ۱۱۲۱دا، هەربــەو شێــوەیــەو لەو ڕێگــەیــەوە ئاوەکــەی سەرخستــووەو گەیانــدوویــەتیــە نێــوەنــدی فەرمــانــڕەوایی یەکەی. زۆربــەی لەم ئاوە ئاو دەخــۆنــەوە. پــاش چەنــد ساڵی بەســەر تێپــەڕبــوونی فەرمــانــڕەوایی سلێمــان خان دا سوڵتــان موراد[*] خونکاری ڕۆم، بە لەشکــرێکی گەورەو گرانــەوە، بۆ داگیــرکردنی بەغدا بزووت و توانی ئەو قەڵای وەك ئێرەمە لە دەست ئێرانی‌یەکان دەربێنێتــەوە. پاش ئەم سەرکــەوتنــە خوســرەو پاشای وەزیر ئەعزەم بە لەشکــرێکی گەورەوە هەڵی‌کــوتــایــە سەر قەڵــەمــڕەوی وڵاتــەکــەی خوسرەو پاشا پاش چەند قوناخێ گەیشتە سەر سنوورەکانی ئێران و ڕۆم و لەگــەڵ لەشکــری قزلپــاش دا بەشــەڕهــاتن و لەو شەڕانــەدا سەرکــەوت. دوای ئەم شەڕە ناوچــەکــانــی زەڵــم و شارەزوورو شارباژێر و قەرەداخی خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی و لەو سەردەمەوە ئەو ناوچانە، تا ئێستا بە بەشێ لە وڵاتی ڕۆم دادەنرێن.

ئیتــر بەمــە سلێمــان خان بە فەرمــانــڕەوایی کوردستان و دەوروبــەری داکــەوت و ماوەی ۲۲ســاڵ بە فەرمــانــڕەوایی یەوە[۳۱] خەریــك بوو، بەڵام لەبــەر ئەوەی کە سەرسنــوورەکــانی بە دەست ڕۆمــەوەبــوون و سلێمــان خان توانستی ئەوەی نەبــوو بەرەنگــاریــان بێتەوە، شا سەفی لێی بەگومان کەوت، بۆ ئەسفەهانێی بانگ کردو بەوێی هێشتەوەو نەیهێشت جارێکی دیکە بۆ کوردستان بگەڕێتەوە، هەر لەوێ مایــەوە. تا فەرمــانــی خودای بەجێ‌هێنــا. بە قســەی مەلامحــەمــەدی، لابــردنی سلێمــان خان لە سەردەمی شاعــەبــاسی دووەم دا بووە[۳۲] (خودا هەر خۆی ئاگادارە).

# کەلب عەلی کوڕی سلێمان خان

پاش لابردنی سلێمان خان مرید وەیس سولطان کە فەرمانرەوای کەلهوڕ بووو پایەی سەرپەرشتیکردنی ناوچەی ئەردەلانیشیان پێسپاردبوو، نەی هێشت بیانی پێ باوێتە نێو وڵاتی ئەردەلان. ئەم مریدوەیسە بۆ کەلب عەلی خانی کوڕی سلێمان خان تێکەوت و کەوتە تکاوتکاکاری فەرمانرەوایی‌کەی باوباپیری پێ بسپێرنەوە. سەربارەت بەوە کە مریدوەیس لە دەرباری سەفەویدا خاوەن ڕێزو پلەوپایەی بەرزبووو لەم لایەنەوە لە پێشتربوو، ئەم بۆ تێ کەوتنەی سەری گرت و کەلب عەلی لە ساڵی ١٠٦٨دا فەرمانرەوایی کوردستانیان پێ سپاردو لەلایەن دەربارەوە بە خەڵاتێکی زۆرو فەرمانی حوکمرانیی ئەیالەتی کوردستانەوە بەرەو وڵاتەکەی گەڕایەوەو چووە سەر تەختی حوکمرانی کەلب عەلی خان پیاوێکی دڵ چاك و ڕاستگۆو سینەچاك بوو. لاوێکی بێ ڕك وکینەبوو. مرۆڤێکی بەبەزەییو بەوەفا بوو. میرێکی خووڕەوشت جوان و میهرەبان بوو. فەرمانرەوایێکی دڵسۆزو دەم ودووشیرین بووو لە زمان لووسیو قسەخۆشیو دەوڵەت زۆریو شان وشەوکەت فرەییدا لە هەموو فەرمانرەوایان لەپێشتر بووو(٣٣)لە ڕوویی گەنجینەو نەختینەو زێروزیودا لەناو وڵات دا بە ناووبانگ بوو.

بەلام سەرەڕای ئەم هەموو سەروەت وسامان و شان وشكوو هەیبەت وهـــووتـــە لە بەدەیبی‌و دلاوایی‌و دەسبـــلاوی‌دا لاوازو بی دەست وبـــردبـــوو و دەرووی دەسبـلاویی لەرووی كەس هەرگیز نەدەكـردەوە. ئەمیش لە رەفتـار و ئاكـاری پاشایان نایەو ناوەشێتەوەو ئاكـــاریكی پەسنـــد نی‌یـــەو ری‌ورەسمیكی ناشیرین و دزیوە. لـە سەرەتـای فەرمـانرەوایی كەلب عەلی خانەوە حوكوومەتی مەریوانی بە فەرمـــانی بە خوســـرەوخـانی برای سپـاردو ناوچـەی سەقزی بە زوراوی كوری‌و ناوچـــەی هەورامـــانیشی بە سانـەكـانی خوی داو میرەوەیسیشی كرد بە هەمەكارەی پالنگان و سەفی خانی سولتانیشی كرد بە فەرمـانـرەوای جوانـرو و محـەمـەد سولتانی گەلباخی‌و هەموو پیاوە گەورەو ماقوولەكانی دیكەش لە خزمەتی‌دا كاروباری دیوانیان بەریـــوەدەبـــرد و بەو پەری ریـك وپیكی‌و دلپـاكی‌و دەسپاكی‌و بەك زمانی‌بەوە ئەركی سەرشانی خویان بەجی دەهێنا. كاتیكی خەلكی كوردستـــان لە شا یاخی‌بـــوون و دەرگـای سەرپیچی‌و یاخیگـەری‌و بی‌فەرمانی‌یان لەدژ بەرپرسیارانی دەولەت خستە سەرگازی پشت ، بە دیاردیی دەرباری ئەسفەهان كەلب عەلی خان بو گوی راكیشـانی ئەو كومـەلـە یاخی‌یـە بەخـوكەوت و لەشكریكی گەورەوگرانی بەرەو جیگای مەبەست بەری‌خست . هوزی یاخی‌بوو سەریكیان بزواندو لە پیشان هەروگیفەو لاف وگەزافیكی زوریان بەبادا ، پاش سووكە شەریـك ئالای سەركـەوتنی كەلب عەلی خان شەكـایـەوە. كاتیكی نیشانەی شكستیان لی بەدیاركەوت دەستیان لە بەرەنگاربوون هەل كرت وریی هەلاتن و قووچاندنیان بەبەركرت . ئەو سەروەرە پاش كوی راكیشـانی ئەم هوزە ناوچـەكـەی داكیـركـردو لە ریك خستنی

ناوچەکەدا کۆششێکی زۆری بەخەرج دا. پاشان بەیارمەتیی خودای بەدادو بە دەست هێنانی سەرکەوتنەوە گەڕایەوە بۆمەرکەزی ئەیالەتەکەی خۆی. کارامەیی و لیزانی و ڕەنگیی لە کن شا دەنگی دایەوەو بە قەدرزانین و نوازشتی زۆر، بەرانبەر بەم سەرکەوتنە، سەربەرز بوو. کەلب عەلی خان لەماوەی ٢٢ساڵ دا بەوپەڕی سەربەخۆیی‌یەوە لە کوردستان حوکمرانیی بەسەربردووە. تا ڕۆژی خۆی هاتووەو گیانی پاکی بەرەو بەهەشت ڕۆیشتووە.[٣٤]

## فەرمانڕەوایی خان ئەحمەد خانی دووەم و لەدەست دانی فەرمانڕەوایی لەبەر بێ‌ئەزموونی و لێ‌نەزانی

کاتێ کەلب عەلی خان لە دنیای ناپایەدار بەرەو کۆشك و سەرای نەمری ڕەختی کۆچی هەڵبەست خان ئەحمەد خانی دووەمی کوڕی لە جێی دانیشت. وامەشهوورە هێند دەسبڵاوو سەخی تەبع بووە، هەرچی سەروەت و سامانێکی باوکی وەختیخۆی کوی

کردبووه، ئەو بێ ئاوەزە لە ماوەدایێکی زۆر کورت دا سەرلەبەری بەفیرۆداوە. سەخاوەت و دەهەندەیی هەرچەندە ئاکارو رەوشتی میرو سەروەرانە بەڵام ئەم میرە هەرگیز ئەو دەسبڵاوییەی لەجێی خۆیدا بەکار نەدەهێناو زۆر بێجێ بوو. چاوی لە ڕێ ورەسمی گەورەیی پۆشیبوو و خۆی لە پێداویستی پلەوپایەی میرایەتی گێل کردبوو. زوربەی کاتی بە ڕابواردن و لەبێ ئاگایی‌دا بەسەردەبردو هەمیشە خەریکی هاونشینی سەرسەری‌و هیچ و پووچ و لەگاماں بوو. ئەوی خۆی بە پیاو دەزانی لێی دوورکەوتەوەو کەسی وای بەدەورەوە نەما بونی پیاوەتی‌و گەورەیی‌یێکی لێبێ ،بەڵام ویرای ئەوەش لە دەسبڵاوی‌و بەخشندەیی‌دا وێنەی نەبوو. لە نێو خەڵك دا بە ناوی خانە زەرینە بەناوبانگ بوو. لەبەر ئەوەی بە کاروباری فەرمانرەوایی‌یەکەوەی کەمتر خەریك بوو، خوسرەوخانی مامی‌بە دەرفەتی زانی، بەهرەی لە بارودۆخی بشێوی وڵات و لەخۆڕایی سامان بەفیرۆدانی خان ئەحمەد خانی دووەم وەرگرت و بە تۆمەتی یاخی‌بوون لێی خست و خۆی لە جێی بوو بە فەرمانرەوا هەرکە فەرمانی فەرمانرەوایی وەرگرت هەر بۆ شەوێ لەمەریوانەوە چوو بۆ سنەو، دەمەوبەیانیکی زوو گەیشتە ئەیالەت و دەسبەجێ خان ئەحمەد خانی گرت و بە کۆت و وزنجیرەوە بۆ ئەسفەهانی بەڕێکردو خۆی بوو بە فەرمانرەوای وڵات.

# خوسرەوخانی کوڕی سلێمـــان خان

کاتێ لە سالی ١٠٨٩ ی ك دا خوســـرەو خان چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، بە ئازارو ئەشکەنجەدان و ستەمکاری گیانی خەلکی هێنـــایـــە کونـــەلـــووتیـــان و دەرووی هەمـــوو بڕیـــوو گوزەران و بەڕێـــوەچـــوونێکی لە هەژارو دەستـــەوســـانـــان پێوەداو بناغەی زولم و زۆری دامـەزارنـدو چەسپـانـد. بانگی دستدرێژیو ستەمکاریی بە گوێی ژێـــردەستـــان دا ڕاهێشت و سامـانێکی، خان ئەحمـەد خانی برازای لە سەروبـــەنـــدی فەرمـانـرەواییدا بە خەلکی کوردستـانی بەخشیـــوو، بە شەق و تێهـــەلـــدان و ڕیســـواکـــردن و هەزاران چەرمەســەری، لێیســەندنەوە. بەدئاکاریو بەدزمانیی بە ئەندازەیی گەیاند درندە بە درندەیی خوی نەیگەیشتووەتێ. گەورەو بچووك گیـانیـان هاتـە کونـەلـووتیـان. ناچـار سکالاو گلەوگازنیان بردە بەر دەربـــاری ســەفـــەوی. خوسـرەو خانیش نەیکـردە نامـەردی لیـان وەدەست هات و بە زمـان لووسیو هەزار فرت فێـل و دەك ودەهـر. ئەو خەلکەی لە دەستی چووبوون بو شکات، دل دایەوەو بە درو دەلەسە هەلی فریواندن و لەگەل قورچییەکی دەولەت دا گەڕاندنیەوە بو جێگـــای خویـــان. هێشتـــا چەنـد ڕوژی بە سەر ڕووداوەکـەدا تێنـەپـەڕیـوو، وردوباریك گەڕایەوە سەر دوخی جارانیو دەستی کردەوە بە زولم وزورو سەرلـەنـوێ ژێـردەستانی وەزالەهێناو نەکرێ

ستەم و زۆرداریی لە ولات بەردایەوەو بلێسەی گەیشتە حەلحەلەی ئاسمـان. خەلکـە بێچـارەکـە دووبارە، ناچار روویان لە دەرباری ئەسفـەهـان کردەوەو پەنـایـان وەبـەر دەرگای شاسلێمان بردو کەوتنە لێپارانەوەی. شایش بە بیانوویەکەوە خوسرەو خانی بۆ ئەسفەهان بانگکرد. کاتێ بە خزمەتی گەیشت زۆر بە توندی گلەیی لێکردو هەرچی زولم و زۆرو بەدرەفتارییەکی کردبوو بە روویدا دایەوە. خوسـرەوخـان کەوتـە عوزرهێنـانـەوە، دەیویست بە سوێنـدو درۆودەلەسەو فیشالن و.. شا دڵ نەرم کاو لە کردەوەکـانی ببـوورێ. شا زۆری لێ توورە ببـووو ئـەورۆژە بەرەڵلایکرد، بۆ ئەوەی سبەینێ لە مەسـەلـەکـە بکـۆڵێتـەوە. شکـات کەرەکـان وایـان زانی خوسرەوخان جارێکـی دیکـە دیســان شا فریــودەداو وەك جاران دەچێتــەوە سەر کاروبـاری فەرمـانرەوایی خۆیو ئەمانیش هیچیان لە هیچ. لەبەر ئەوە خۆیـان لە نەخـۆشـخـانــەی شا قایم کردو لەوێ مانیـان گرت.

خوسـرەوخـان کە ئەم خەبـەرەی بیست توورە بوو. لە کاتێـك دا شا بۆ سەیـروسـەفاو راووشکار چووبوی، خوسرەوخان هەلیهێنا، فەرمانی بە پیـاوەکـانی خۆی دا، خەلکـەکـەی بێنـە لا. ئەوانیش هەلیـان کردە سەریـان لەقـوشخـانـەو لەوێ تێـك گیـران، سەرەنجـام کار بە شەر گەیشـت و لە هەردوو لا خەلـکـێکی زۆر برایـنــداربــوون و چەنــد کەسێـکـیش لە دەست وپێــوەنــدانی شا براینــداربــوو و گیــران.

پاش گەرانــەوەی شاو خەبــەرپێ گــەیشـتـنـی، فەرمــانی کوشتنی خوسرەوخان بەجێهێند را.

## دانانی تەیمـــوورخـــانی ئاجورلـــوو
## بەجێ نشینی والی لە ئەیالەتی کوردستان

پاش کوژرانی خوسـرەوخـان، شا سلێمان خانی سەفەوی تەیموور خانی ئاجورلـووی لە تەك سکـالاکەراندا، لە سالی ١٠٩٣ ی ك دا بە پلەی سەرپەرشتکار رەوانەی ئەیالەتی ئەردەلان کرد.

تەیمـــوور خانی ئاجـــورلـــور رێگـــای رەفتـــارچـــاکی لەگـەڵ پیـاومـاقـوولانی ولاتـەکـەدا گرتـەبەرو هەموو خەڵکی ناوچەکەی لە خوی دڵخـــوش و رازی کرد. رۆژگـاری بە هەزاران چاکـە لەگـەڵ خەڵکی کوردستـــان دا بە سەربـــرد. ماوەی شەش ساڵ بە خوشی‌و نوازشتـەوە لەگـەڵ خەڵکی ولاتـداو پیـاومـاقوولان و مەزنان دا زۆر دۆستانە جوولایەوەو گەردێ چی‌یە لە بێزاری‌و نیگەرانی لەو پیاوەوە . لەرووی کەسێ نەڵیشت و خەڵکـەکـە ئاســوودەو سەرســووك رۆژگاری خۆیان بەسەربرد. لە پاشان لابرا.

## خان ئەحمەد خانی دووەم
## بۆجاری دووەم

پاش ئەوەی تەیمـــوورخــــانی ئاجـــورلـــوو شەش ساڵی بە پلەی سەرپەرشتکاری کوردستان بەسەربرد و ئالای نێوان تەبایی‌و رەفتار چاکـیـــی لەگـەڵ چاك و خراپ دا هەڵ کرد، شای سەفـەوی داکیـرکـردنی فەرمـانرەوایی‌یەکی لە بنەماڵەی ئەردەلان کە میراتگری

فەرمانرەوایی کوردستانن و ئەوان زیندوو کەرەوەی ئەم ئاورگەن بەدژی ڕێورەسمی پاتشایان زانی [٣٤] خان ئەحمەدخانی دووبارە بەوپەری ڕێزەوە گەراندەوە سەرفەرمانرەوایی ئەیالەتی کوردستان و [٣٥]خان ئەحمەد خانی دووەم پاش جێگیر بوون و دامەزران و فەرمانرەوایی بە دەستەوەگرتن دووبارە ملی لە رابواردن و کەمتەرخەمی نایەوەو زۆری گوێ بە کاروبـاری ولات نەداو زۆربەی کاتی بە راووشکارو خانووبەرە دروست کردنی بێ سوودو نامەحکەم بە سەربرد، تەنانەت لەم بارەوە هێندەی چاوتر ووکانی وچانی بە خۆی نەدەدا.دەگێرنەوە کە زیاد لە سێ‌صەت کەس لە پیاوماقوولان وگەورەو مەزنانی ئەیالەتی کوردستانی کردبوو بە بازەوان و خوسرەو بەگی، کە یەکێ بوو لەو بنەمالەیەو هەمیشە بریکاربوو، کرد بەمیرشکارو بێ لێ بران خەریکی راووشکار بوو. ناوبەناویش حەزی لە گوڵ چاندن دەکردو بەم کارەوە خۆی خەریك دەکرد. بەم جۆرە پێنج سالی دیکەی لە ئەردەلان فەرمانرەوایی کرد، تا شا سولتان حوسەینی سەفەوی لە سالی ١١٠٥ ی‌ك دا هاتە سەر تەختی پاتشایەتیی ئیران و خان ئەحمەد خانی دووەمی لابردو محەمەد خانی کوری خوسرەو خانی، کە لە ئەسفەهان دادەنیشت کرد بە فەرمانرەوای ئەیالەتی کوردستان و بۆ دامەزراندن و چەسپاندنی زۆر تێکۆشا.

## فەرمانڕەوایی محەمەد خـــانی کوڕی خوسرەو خان و بەرەنگاربوونی لەگەڵ لەشکری بابان دا

پاش ئەوەی شا سولتان حوسەینی سەفەوی بوو بە شای ئێران، میـرنـشـیـنی کوردستـــانی ئەردەڵانی بە محــەمــەدخـــانی کوڕی خوسـرەوخـانی ئەردەڵان سپـارد. لە سەردەمی فەرمـانـڕەوایی ئەودا سلێمان پاشای بابان[٣٦] لەبەر سپاو لەشکرو زێرو سەروەت و سامان زۆری لە خۆبایی‌بووو لەشکرێکی لەژمارەی ستێران زێتر پێکەوەناو لە ولاتـی ڕۆم و ئێـران دەســتـی بە تالان و برۆ کردو دەنــگـی یاخیَگـەری‌و سەرپـێـچیی بە گوێی خەلکی هەردوو دەولـەت ڕاگـەیـانـد. لە پێشـان لەشکرێکی زۆر گەورەوگـرانی دژی والیی بەغـدا ئامـادەکـرد. پاش شەڕوشـۆرێکی زۆر والیی بەغدا بڕیاری داگیـرکـردنی میـرنشینی ئەردەڵانی داو بەو سوپـاو لەشکرەوە بەسەر سنـوورەکـانی ئەردەڵانی‌دا داو یەکـەم هەنگاو هەوارمان و مەریوان و سەقزی داگیرکرد. تەمر خان بەگی کوڕی زۆراب سولتانی کوڕی کەلب عەلی‌خـان کە والیی سەقـزو سیـاکـۆ بووو هەروەها ئیبراهیم کوڕی میـر ئەسـکـەنـدەری کە گەورەی مەریـوان بوو کوشت.

سەرەنجـام، هەرکـە دەنگـوبـاسی هێرشی سلێمـان پاشـا بۆ سەر میرنشینی ئەردەڵان بە شاسـولتـان حوسـەین گەیشت، لەو ڕووداوە دڵگیربووو بۆ لەناوبردنی ئاژاوەکەی سلێمان پاشا یەکسەر عەباس قولیخـانی قاجـاری کرد بە سەرداری سوپـاییکی گەورەوگـران و بۆ یارمـەتیی سوپـای ئەردەلانی نارد. هەرکـە لەشکـری قزلبـاش و[٣٧] لەشکـرەکـەی ئەردەڵان گەیشتنـە مەریـوان. سلێمـان پاشـای بابـان بەوپـەڕی ئازایـەتیو دلێـرییـەوە هەلیکـوتایە سەر دژمن. لە ڕۆژی نۆیەمی «محرم الحرام»ی سالی ۱۱۱۱ ی‌ك دا شەڕ گەرم بڕوو هەر لە سبـەینیٚوە تا ئێـوارە بەوپـەڕی گەرمییـەوە دربـژەی کێشا، بەلام هیـچ لایـەکیـان بەسـەر ئەولاکـەی ترا زاڵ نەبـوو. بۆ سبـەینی کە ڕێکـەوتی دەیـەمی مانگی «محـرم الحـرام»ی سالی ۱۳۱۰ بوو دووبـارە شەڕەکـە هەڵگیـرسایـەوەو وەکـو نەرەشێر دوو لەشکـر هەڵیـان کردە سەریـەك. سلێمـان پاشـا لە ئەسپـەکـەی هاتە خوارو بەوپەڕی مەردایەتییەوە ملی لە شەڕ ناو زۆر سوارچاکی ناوداری گلاندو لە ناوبرد. بەلام سەرکەوتن چونکە بەدەست خودا خۆیەتی، نەك هێـزی بازووی ئازاو دلێـران، شنـەی زاڵ بوونی لەشکـری عەباس قولیخان هەڵیکردو ئەوان سەرکەوتن و لەشکرەکەی سلێمان پاشـا بەزیو زۆر لە سەرکـردەکـانی برینـدارکـران و کوژران و هێنـدێکیشیـان بەدیـل گیـران. ئەوەی ماشـەوە بە هەزار شەرەشـەق گیانیان قوتارکردو خۆیان گەیاندەوە قەلەمرەوی دەولەتی عوسمانی.

قاسم سولتانی هەورامی دوای شەڕەکە، سەبارەت بە دژمنایەتیو ڕکـەبـەرییـەکی پێشتـر لەگـەلە بنەماڵەی ئەردەلان دا هەی بوو، لە ڕووی ناپـاکییـەوە بە سەرداری قزلبـاشـەکـانی گوت: سوپـای

ئەردەڵان لە کانگای دڵەوە لەگەڵ بابانەکان دا شەریان نەکردو لەبەر زۆر هۆ لە ژێرەوە دەستیان تێکەڵ بووەو هەرگیز پربەدڵ شەریان نەکردووە.

عەباس قولیخانی قاجار، سەرداری سوپاکە، کە بە زیاد ئۆغلو بەنــاووبـانـگە بوو، بروای بەو درۆودەلـەسـەو دەم هەڵبـەستانـەی قاسم سوڵتان کردو لە رکان مووی رەپ بوو، سەری زور کەسی بێ تاوانی لە موسوڵمانانی سنە پەراندو منارەیێکی لە کەللەسەریان هەڵچنیو کەللەی قاسم خانی وەك بەیداخ لە سەر منارەکە چەقاند. هەرچیەکی تۆوکەی هەر ئەوە دەدووریەوە.

لەو کاتــەدا کە شەر لە نێــوان ئێــران و رۆم دا بەردەوام بوو، حوسەین پاشای والیی بەغدا بۆ تێوان چاك کردنی هەردوو وڵات بۆ کەرکووك. سلێمان پاشای بابان کە لە هەردوو دەوڵەت یاخی بیوو پاش وتوویژ لەگەڵ والیی بەغدا چارەنووسی خۆی لەوەدا دیت، کە عوزر بۆ دەرباری عوسمانی بێنێتەوەو لێیان نزیك کەوێتەوە. پاش ئەم رووداوە دەرباری ئەسفەهانیش عەباس قولیخانی لە سەر کار لابـردو حوسـەین خانی لوریـان کرد بە سپـاسـالاری لەشکـرەکـە. سەرداری لور هەرکە پێی نایە خاکی شارەزوور بە سەروپۆتەڵاکی ناوچــەکــەی دا داو کەوتــە زوڵـم وزۆرو راوەرووت کردنـیــان و زەوی‌وزاری هۆزی بڵباسی هەموو داگیرکردو هەرچیەکی لە دژی بوون ومــابــوونــەوە تا ناوچـەی ئاکـۆو قەنـدیلی هەڵبـرین. پاش جێبەجێکردنی کاروبار سەرکەوتووانە بۆ وڵات گەرایەوەو هەزاران ئافەرین کرا. ئەنجا پاش ئەم کەین وبەینە جیهانگیر سولتانی کوری کەلـب عەلـی‌خــانی ئەردەڵان، کە هەمیشــە بۆ تێــك تەپــانــدنی

دام ودەزگای دەوڵەتی محەمەد خانی نیهادپاك لە پاریزدابوو، لەگەڵ
خوسرەوخان کەوتە عوزرهێنانەوە، دەیویست بە سوێندو درۆودەلەسە
شا دڵ نەرم کاو لە کردەوەکانی ببووری. شا زۆری لێ توورە ببوو
. ئەو رۆژە بەرەڵلای کرد، بۆ ئەوەی سبەینێ لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە.
شکات کەرەکان وایان زانی خوسرەوخان جارێکی دیکە دیسان شا
فریودەداو وەك جاران دەچێتەوە سەر کاروباری فەرمانرەوایی خۆیو
ئەمانیش هیچیان لە هیچ. لەبەر ئەوە خۆیان لە نەخۆشخانەی شا
قایم کردو لەوێ مانیان گرت. خوسرەوخان کە ئەم خەبەرەی بیست
توورە بوو. لە کاتێك دا شا بۆ سەیر وسەفاو راووشکار چووبوو،
خوسرەوخان هەڵیهێنا، فەرمانی بە پیاوەکانی خۆی دا، خەڵکەکەی
بێتە لا. ئەوانیش هەڵیان کردە سەریسان و لە لەقوشخانەو لەوێ
تێك گیران، سەرەنجام کار بە شەر گەیشت و لە هەردوو لا خەڵکێکی
زۆر بریندار بوون و چەند کەسێکیش لە دەست وپێوەندانی شا
بریندار بوون و گیران. پاش گەرانەوەی شاو خەبەرپێگەیشتنی،
فەرمانی کوشتنی خوسرەوخان بەجێهێندرا.
محەمەدخان ڕێگای دوور ودرێژی ئەسفەهانی گرتەبەرو لەوێ بە هەر
فروفێڵ و پەلپ و بیانوویێك بوو محەمەد خانی هەڵفراندو لە
فەرمانرەوایی ئەیالەتی ئەردەڵانی خست.

# فەرمانڕەوایی محەمەد خانی گورجی لە سنە

پاش ئەوەی بە دووزمانی پیاوخراپان محەمەد خانی والی لەپلەو پایەی بەرزەوە سەرەوژێر بووەو سووك و ریسوا بوو، لە سالی ١١١٣ ی ك دا شا حوسەینی سەفەوی محەمەد خانی گورجی پاش ئەوەی گەیشتە مەرکەزی ئەیالەتەکەی دەستی بە بنیات نانی کاروان سەراو مزگەوت کردو چاکی ئاوەدان کردنەوەی ولاتە کەی لێ هەلٚ کردو ئەمن وئاسایشی چەسپاندو ژێردەستانی کامەران و ئاسوودەکرد. بە فەرمانی شاحوسەین لە پالٚ بازارە کۆنەکەی دا، کە ئەمرۆلە شوێنەکەی دا ئاسەواری نەماوە، کاروانسەرایەکی دوو نهۆمی، کە زەوی یەکەی هی مەلا عەبدولکەریمی قازی بوو، دروست کرد. کاروانسەراکە بە هەردوو نهۆمەکەوەی بریتی بوو لە شەست ژوورو چاوخان. سەبارەت بەوە کە کاروانسەراکە لە سەر ئەو زەوی یە دروست کرابوو، کاروباری سەرپەرشتکردن و چاودێری یەکەی بە جەنابی قازی سپێردرا، خودای لێ رازی بێ. قازی، سالانە، دەرامەت و دەسکەوتی خۆی و کاروانسەراکەی، بە پێی حیساب وەردەگرت و دەرامەتێکی لەو دەرامەتە بە ناوی هەقی مولکانەوە بۆ خۆی لێ گل دەدایەوەو هەرچیشی لێ دەمایەوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی تەکیەو مزگەوت و خانووبەرە خەرج دەکرد. محەمەد خان لەبەر ئەوەی

فەرمانرەوایی ئەیالەتەکەی ماوەی سێ ساڵ بەدەستەوە بوو، بەدخواو دووزمانی لێ وەکنە کەوتن و لە کن شایان بۆ تێ چاند کە لە مەزەبی دوازدە ئیمامی وەرگەراوەو بووە بە سوونی مەزەب و مەزەبی شافیعی بە مایەی رزگاری لە دنیاو قیامەت داوەتە قەڵەم. شا بەم خەبەرە زۆر دڵتەنگ و نیگەران بووو یەکسەر لە فەرمانرەوایی کوردستانی لابرد.

## فەرمانرەوایی حەسەن عەلی خانی کوڕی محەمەد مونمین خانی ئیعتیمادوددەولە

پاش لابرانی محەممەد خانی گورجی شا سوڵتان حوسەینی سەفەوی حەسەن عەلی خانی کوڕی محەمەد مونمین خانی ئیعتیمادوددەولەی کرد بە والیی ئەردەڵان و والیی تازە چوو بۆ مەرکەزی ئەیالەت. هەرکە گەیشتە ئەیالەتەکە کەوتە پەرەوبرەوپێدانی مەزەبی دوازدە ئیمامیو لەپێناوی بە زۆر شیعەیەتی سەپاندندا ئازاری خەڵکەکەی زۆر دەدا. لە ئاکامی ئەم رەفتارەی خەڵکەکە زۆریان رك لێ بوەو سەرلەبەریان لەسەر ئەوە گیرسانەوە لەکار بخرێ و هەموو یەکیان گرت و لە دژی ئالای بێزاری یان لێ هەڵ کردو زۆری نەخایاند لەناکاو شەربەتی مەرگی نۆشی. ئەم پیاوە لە ساڵی ١١١٦ ی ك دا بوو بە فەرمانرەوای کوردستان و لە ساڵی ١١١٨ ی ك دا مرد.

دەگێرنەوە، ڕۆژێکیان بۆ گەشت وگوزارو سەیران چووبووبۆ شاخەکانی ئاوییەر [٣٨]، لە گەڕانەوەدا ڕێی کەوتە سەر مەرقەدی پیرێ کە ئەمرۆ ناوی بە پیرعومەر ڕۆیشتووە، لە مجێورەکانی مەرقەدەکەی دەپرسێ: ئەم مەرقەدە هی چ زاتێکە؟ مجێورەکان لە وەرامدا، دەڵێن: ئەمە مەقامی سەیید عەبدوسسەمەد ناوێکە لە کوڕانی ئیمام مووسای کازم. ئەویێ ئەقڵە کە ئەم قسەیە دەبیێ، دەست بە جنێودان دەکا، دەڵێ: ئەم مەرقەدە مەرقەدی پیاوێکی گەورەی ئایینی نی یە، ئەمە گڵکۆی کابرایەکە بە ناوی پیرعومەرەوە ئیتر لەو هەڵ دەبڕێ، بەرەو شار دەگەڕێتەوە. هێشتا نەگەیشتبووە قەراخ شار، لەپڕ زریکەیێکی کردو کەوت. دایکی بە عەلەداوان پێی گەیشت، بەڵام چ ببینێ پیاوە لە یەکبینە دەیگوت: پیرعومەر لە بن دەستی دام. ئیتر دەسبەجێ گیانی دەرچوو. ئەم پیاوە کوردستانی بە جارێ لە کۆت و زنجیر ڕەهاکردو لە لانکی سەرسووکیو ڕەحەتیدا هێوراند.

ئەوەی شایانی باسە، هێندێ کەس لەو بڕوایەدان کە ئەو مەقامە گڵکۆی کوڕی ئیمام مووسای کازمە کە بە ئیمام عەبدوسسەمەد ناووبانگی دەرکردووە. هێندێ کەسی تر بڕوایان وایە کە مەقامی پاکی عومەری کوڕی عەلی‌یە، هەزار درووودیان لە سەر بێ. خودا خۆی لە هەموو شتێ ئاگادارە. خوالێخۆشبوو ئەمانوڵڵاخانی والیی کوردستان گیانی بە بەهەشت شادبێ، لە مەقامی ئەو مەزنەدا مزگەوت و بارەگایێکی بە شکۆی دروست کردو مەرقەدەکەی تازە کردەوەو حەوشەکەیشی فرەوان تر کردەوە. ئێستا ژمارەیێکی زۆر فەقێو مەلا لە ژێر سێبەری بارەگای ئەو مەزنەدا شەوو ڕۆژ بە خوێندن و دەرزوتەوەرەوە سەرگەرمن.

## فەرمانڕەوایی حوسەین عەلی بەگی کوڕەکەی تری ئیعتیمادودەولە

کاتێ حەسەن عەلیخان کۆچی دوایی کرد حوسەین عەلیخانی برای لە جێگـەی دانیشت. ئەمیش بە هۆی دەمـارکـرژیی مەزەبی‌یـەوە لە دژ خەڵکی کوردستـان ڕاوەستـا. خەڵکی کوردستـانیش ملیـان بۆ نەداو سەریـان بۆ شۆڕنـەکرد. سەرەنجام کارێکی وایان کرد کە لە لابرد نی‌دا سەرکەوتن و دەریان کرد. پاش ئەم ڕووداوە ماوەی هەژدە مانگ کەیخوسرەو بەگ بە پلەی سەرپەرشتکار لە جێی داندراو کاروباری ئەیالەتەکەی پێ سپێردرا.

## عەباس قولیخان

پاشی لابـردنی بێگـانـە، عەبـاس قولیخـانی کوڕی محـەمـەد خان کوڕی خوسـرەو خانی بەنی‌ئـەردەڵان کە ماوەیێـك لە دام ودەزگـای سەڵتـەنـەتی سەفـەوی‌دا کاروبـاری گەورەی پێ سپێـردرابـوو بە فەرمـان ڕەوایی ئەیالەتی کوردستان داندرا. ئەم ذاتە لەو سەردەمەدا کە پلەوپـایـەی تەواو بەرز بـوەوەو لەسـەردەمێك دا کە میر وەیسی ئەفغانی یاخی بـوو و ئاژاوەکـەی کوڕەکەی عەبدوڵلاخان لە قەندەهار و هەرات هەڵگیـرسـابـوو لەگـەڵ سەردارێکی تردا لەشکـرێکیان بردە سەر ئەو سنـوورانـەو لە شەڕوشۆڕدا ئەو پەڕی ئازایەتی و گەرناسی و مەردایەتیی نوانـدبـوو لەم ڕووەوە خزمـەتێکی شایـانی بەجێ‌هێنابـوو و بـوو بە جێی‌ئـافـەرین و پێـوەنـازینی‌شـا. عـەبـاس قولیخـان لە ساڵی

١١٢٢ی‌ك دا، بەرەو ئەیـالـەتی كوردستـان بەری كەوت. بە پێی نووسینی خوسرەو بەگ رووداوەكەی مورادوەیس لە ناوچەی قەندەهار و ئەو ئازایـەتی‌یـەی ئەو میـرە كەلەمێردە نواندبووی، لەو كاتەدا بووە، كە عەبـاس قولیخان فەرمانڕەوای ئەیالەتی كوردستان بووە. بەلام هەر ئەم قسـەیـەی یەكـەمیـان لەڕاست دەچێ. سەبـارەت بەوەی خەلكی كوردستـانی ئەردەلان ماوەیـەك بوو لە ژێـر زولم وزۆر وستـەمی فەرمـان ڕەواكـانی بێگـانـەدا بوون و لە ئەمن و ئاسایش بێ‌بەش بوون ،لـە تەهی دلـەوە پێشوازیان لە هاتنی كردو لەسای فەرمان ڕەوایی ئەودا زۆر سەرسـووك و ئاسـوودە بوون و كاروباری خەلكەكە سەبارەت بە بشێویی ڕۆژگار گۆج ببوو بەلام سەرلەنوێ بە گەر كەوتەوەو ڕەحەت بوون.

عەبـاس قولیخان ماوەی حەوت سال بەوپـەڕی سەربەخۆیی‌یەوە فەرمـان ڕەوایی‌كـرد، تا ئەوڕۆژەی میـروەیسی ئەفغـانی لە ناوچـەی قەنـدەهـار و هەرات و خوراسـان دا ملی لە سەرپێچی نا. شا سولتـان حوسەینی سەفەوی بۆ لەناوبردنی ئاژاوەو بشێویی بە كە داوای لە عەبـاس قولیخـان كرد لە شكـری لە دلاوەران و ئازایـانی ئەردەلان خركـتـەوەو لە ڕێگـای ڕەبـەوە خۆی بگـەیێنێتـە سوپاكەی. لەشكری ئەردەلان كاتی گەیشتە تاران بریارد را دەست لەم سەفەرە هەل گرن و كەڕانـەوە بۆ كوردستـان. ئەو ڕووداوە بوو بە مایـەی دلگیـریی شاو بیـروبـڕوای لەبارەی عەباس قولیخانەوە گۆڕا. عەباس قولیخان عەلی قولیـخـانـی كوڕی زۆراب سولتـان، كە لە سورەوتـورەی كەلب عەلـیـخـانـی والـی بوو، بەوە تاوانـبـاركـرد، كە ئەو بووە بە هوی پاشگـەزبـوونـەوەی لەشكـری ئەردەلان لە كومەك كردن بە سوپای شا

حوسەینی سەفەوی . لەم بارەوە وای دەربری کە عەلی قولیخانی کوری زۆراب خان لە بنـەوە لەگـەڵ خەلـك دا دەستـی تیکـەڵ کردووەو پیاوماقوولانی لەشکرەکەی فریوداوەو لەو خزمەتە پەشیمان بووەتەوە . ئەم قسەیە لە دڵی شا چەسپی و بڕوای بەوە هێنا کە عەلی قولیخان پیاوێکی دەسرەو بەدەسەڵاتە . لەبەر ئەوە فەرمانی فەرمانڕەوایی بۆ دەرهێنا

## عەلی قولیخان

چون لە ساڵی ۱۱۲۹ ی ك دا عەلی قولیخـان بی یارمـەتی و دەسگیـری خەلـك چووە سەر تەختی حوکمـڕانـی باووبـاپیـرانی خەلکـەکەی لەم چارەنـووسـە ئەزەلیـیە سەرسـام کردو دنیا هەمووی لەم کارە واقیان وڕما . دەڵـێـن زۆربـەی کاتـی خۆی لە دیـی شەخـلەی سەر بە ناوچـەی خورخورە لەو پەڕی دەسکورتی و بی چارەیی دا بەسەر بردووە . ئەم پیاوە سەرەڕای ئەوەی لە باریـك دا بوو خیـری پی دەشیـاو جێی بەزەیی بوو هەرگیـز پەنـای بۆ هیـچ کەسی نەبـردووەو دەستی لە هیـچ لایـەك پان نەکـردوتـەوە . تەنـانـەت لە بی چـارەیی دا بە رادەییـك گەیشتبـوو، خەلکی شەخلە بەزەیی یان پیدا دەهاتەوەو هەمیشە دنەیان دەدا بۆ ئەوەی ژیـان و گوزەرانـیـکـی چاتـر بۆ خۆی دابین بکـا . ئەویش وەڵامی ڕاستـەقینـەی خەلکـەکـەی دەدایـەوە ، دەی کوت ، خودای گەورە هێند توانایە بیەوی لە شەخلەیش پلەوپایەی بەرزی پی دەبەخشی و گەورەی دەکا .

بەپێی نووسینی مەلا محەمەد شەریف، دەروێش محەمەدبەگی سوباشی بەغدایی، لە دڵی خۆیدا مەیلی ملکەچیی هەبووە، لەبەر ئەوە، ئەم رێـك کەوتنە بوو بە هۆی دڵ بەهێزکردنی سەربازانی ئەردەڵان و پاڵپشتیی بۆ سوپاکەیو بەم جۆرە چوونە ناو قەڵای بەغداوە. لەبەر ئەوەی کە خەڵکەکە حەزیان لە شەڕ نەبوو شەڕکردنیان لە بەرژەوەندی خۆیان نەدەزانیو سەرپێچییان بە مایەی سەرلێشێوان وٴ لەناوچوونی خۆیان دەزانی بۆ رێك کەوتن هاتنە پێشەوە. کەتخوداو خاوەن پلەوپایەکان و گەورەپیاوان بە دەس ودیارییەکی زۆرو گرانبایییەوە هاتنە خزمەت و گوێبەفەرمانیو مل کەچیی خۆیان لە راستی دەربری. پاش رەزامەندیی هەردوولاو شەڕو شۆڕکوژانەوە والیی (دارالسلام) بە خزمەتی جەنابی خان گەیشت و تانوپۆی دڵسۆزیو یەکدڵی خۆیان لێك رایەڵ کردو چەندین ئەسپی کەحێلەی رەسەنی عەرەبیو کەلوپەلێکی زۆری گرانباییو چەندین جۆر دەست ودیارییان پێشکێش بە خزمەتی کرد. ئیتر بەم جۆرە سەرکێشیو یاخیتی بە گوێفەرمانیومل کەچی گەڕاو ئاشتی جێگای ناکۆکیو کێشەوبەرەی گرتەوە.

هەر بۆ سبەینێی ئەو رۆژە میری بەختەوەر بە خۆشیو شان وشکۆو دەبدەبەو سەنسەنەوە تەشریفی گەیشتە (دارالسلام)ی بەغداو ئەو سەرزەوییە پیرۆزەی بە فەری پێوقەدەمی خۆی شەرەفمەند کرد. لەو کاتەدا وەزیری بەغدایش چەندین پێشکێشی شایانی بۆ خزمەتی هێناو لەگەڵ ئەمیران و بەرپرسیارانی دەوڵەتیش دا کەوتنە چاك وخۆشیکردنێکی گەرم وگوڕ. پاش چەند رۆژێ کە

سەرەتاوە. هیچ لایەکیان بە سەر هیچ لایەکیان دا سەرنەکەوت.
سەرەنجام بە لوتفی پەروەردگاری داوەر ئەردەڵانی‌یەکان سەرکەوتن و ئاڵای سەرکەوتنیان بەرزکردەوە(نصرمن الله وفتح قریب)و هۆزی لورو بەختیاری تووشی شکانێکی پیس هاتن و بە سەرشکاوی‌و زەرەروزیارێکی زۆرەوە هەڵاتن. ئازاو دلێرانی ئەردەڵانی نەیان کردە نامەردی دوایان کەوتن، بە بۆنەی سەختی‌و دژواریی شوێنەکەیانەوە سەرلەنوێ خۆیان کۆکردەوەو جارێکی تر لە دژ لەشکری ئەردەڵان راپەڕین. ئازایانی کورد بەوپەڕی لەخۆبوردنەوە وەك نەرەشێر هەڵیان کردە سەر لورو[٣٩] بەختیاری‌و رێگای هەڵاتنیان لێ‌گرتن و ژمارەییکی زۆریان لێ‌کوشتن. سەرەنجام هیچ چارەیەکیان بەدەستەوە نەما لە ئەمان خواستن بەولاوەو سەرکردەو گەورەکانیان بە خەڵات و پیشکێشی گرانبایی‌یەوە هاتن بۆخزمەتی عەلی قولیخان و رێی مل کەچی‌و گوێ‌بەفەرمانی‌یان گرتەبەر. عەلی قولیخانیش فەرمان رەوای لورستانی لەگەڵ سەرەك هۆزو پیاوماقوولانی لوردا، لەتەك چەند نەفەرێ لە خەڵکی کوردستان نارد بۆ دەرباری سەفەوی بە ناوی عەلی‌قولیخانەوە لە شاپارانەوەو بە پێی واتەی قورئانی پیرۆز(والکاظمین الغیظ والعافین عن الناس)داوای لێ بوردنیان کردو شایش بەخشینی‌و تکاکەی عەلی قولیخانی قوبوول کردو لورەکانی بەخەڵاتی گرانبایی‌یەوە ناردەوە بۆ ولاتی خۆیان. عەلی قولیخان پاش ئەوەی بۆ کوردستان گەرایەوە لەبەر توندوتیژیی ئاکاری‌و زمان پیسی خۆی زۆربەی پیاوماقوولان و ناسراوانی ئەردەڵان لەگەڵ دەروێش بەگ و حوسەین بەگە مامۆیی دەستیان تێکەڵ کردو لە دژی وەستان. عەلی قولیخان توانی بەرەنگاربوونیانی لە خۆی‌دا نەدەبینی،

ناچار هەلات و ڕووی کردە قەلای پالنگان و لەوێ جێگیر بووو داوای یارمەتی و پشتگیریی لە خانە پاشای بابان کرد، خانە پاشایش ڕۆستەم بەگی جافی (٤) لەگەل هۆزەکەی دا بە یارمەتی یەوە ناردو هەردوولا بڕیاریان دا شەڕ بکەن. بڕێ خێرخواو خوداناس کەوتنە نێوانیانەوە، سەرەنجام هەردوولا ڕێك کەوتنەوە. ئەم ڕێك کەوتنە زۆری نەخایاند، خەلك و خواو ڕدین سپی ئوردستان لە تاو توندوتیژی و زمانپیسی عەلی قولیخان گیانیان گەیشتە کونەلووتیان و لە فەرمانڕەوایی یان خست.

# عەباس قولیخان بۆ جاری دووەم

چۆن لە سالی ١١٣٢ ی ك دا خەلکی سنە لە عەلی قولیخان دلیان ڕەنجاو لە فەرمانڕەوایی یان خست، عەباس قولیخانی کوری محەمەد خانیان دووبارە بە فەرمانڕەوای ولات دانایەوە.

هەروەها عەلی قولیخانیش فەرمانڕەوایی سەقزی پی سپێردرا، تا ئەو کاتەی ئەفغانی یەکان و ئوزبەگەکان لە ولاتی ئێران دا دەستیان بە دەستدرێژی کردو زۆربەی ناوچەکانی سەر بەقەلەمڕەوی سەفەوی یان داگیرکرد. لەم سەروبەندەدا، لە عەلی قولیخان داواکرا بە سوپای ئەردەلانەوە بەرەنگاری سوپای ئەفغان بێ. بەلام لەبەر ئەوەی دەسەلاتی ئەفغانی یەکان تەواو پەرەی سەندبووو زۆربەی

قەلاوقـەلایچـەی ئەوولاتـەیان بە زۆر هێنابووە ژێر دەسەلاتی خۆیان و لەشکـــرێکی زۆریـان پێـك هێنـابـوو، عەبـاس قولیخـان و ئازایـانی ئەردەلان، سەرەڕای ژمـارەزۆریـیـان، دەستیـان لەگیـانی خۆیـان شوشتبـووو زۆر مەردانـەیش هاتبـوونـە بەر مەیدان، نەیان توانی هیچ کاری جێبـەجێبکـەن و هیچیـان بۆنەکـرا ناچـار گەڕانـەوە بۆ ولاتی خۆیان و بوون بە قەشمەر ارو بەرتیزوتەشەری چاك وخراپ کەوتن .
لەم سەروبەندەدا ئەفغانی یەکان پتریان پێ داگرت و دایانە سەرەڕۆیی و بەجـاری ئێـرانیـان داگیـرکـردو شا شولتـان حوسـەینیـان لە تێغی بێ دادی کێشـاو کوشتیـان و لە ولانی فـارس و عیراق و خۆراسان دا بوون بەفـەرمـانـرەوا. سەرۆکـەکـانی سوپاوپاشا عوسمانی یەکان کە لەسەر سنـوورە کانی ئێـرانەوە نزیك بوون و بەدەسەلات بوون، لە دەرباری عوسمـانیـیـان ڕاگـەیـانـد، کە ئێـران بە جاری وێـران بووەو بێشـەو بێشـەلانی بووە بەلانـەی ئوزبـەگ وئـەفغـان. ئەگـەر بێت و لەلایـەن دەولـەتی عوسمـانییـەوە ڕێ بدرێ ئەوانیش ئەوناوچانەی لە خۆیانەوە نزیکن لە ئێـران داگیـردەکـەن سولتـانی عوسمـانی داوخـوازەکەیانی پەسنـدکـردن و دنـەیدان ئازووە داگیـریان کەن. ئەوانیش یەکسەر بە لەشکـرێکی زۆرەوە پەلامـاری قەلاو قەلایچـەکـانی ئێـرانیـان داو هەموویان داگیرکرد. سەر لەشکرێکی بەناووبانگی ناوچەی ئەرزەرۆم قەلایچەکانی یەریڤان و شیروان و مووش و وان و هەموو ناوچەکانی ئازربایجانی، تا مەراغەو ئەمسە داگیرکرد. پاشاکانی بابان و عیراقی عەرەب سوودیـان لەم هەلـە وەگیـرکـەوت. ناوچـەی ئەردەلان و کرمـاشـان و هەمـەدان و بروجەردو نهاوەندو گەڕووسیان لە ماوە یێکی کورت دا داگیـرکـردو فەرمانرەوای خویانیان لەسەر قوتکردنەوە. خەنە

ئەحمەد پاشای بابان لە سالی ١١٣٦ ی ك دا هەلیکردە سەر ئەردەلان و داگیری کردو بوو بە فەرمانرەوای. عەبباس قولیخانیش لەم شەرو ئاژاوانەدا کوژرا. زوری نەبرد، ئەحمەد پاشا کرماشانی گرت و بوو بە فەرمانرەوای ئەوی. لەوسەرو بەندەدا کەئیران داگیرکرا بوو، پاشاکانی عوسمانی گەماروی هەمەدانیان داوگرتیان. پاش گرتنی تالانیان کردو زوربەی دانیشتووانیان کوشت و ژن و مندالەکانیان بە دیل بردن، بەلام چون ریگەی دیلەکانی هەمەدان لە ئەردەلانەوە تیدەپەری مەلاعەبدولکەریمی قازی چ بەبەها، چ بە تکا لییەوەرگرتنەوەو رەوانەی ولاتی خویان کردنەوە. لەبەر ئەوەی کە دەولەتی سەفەوی بەرەوکزیو کەنەفتیو نەمان دەچووینەفغانییەکان لە خوراسانەوە تا فارس و رەی و عیراق ئیرانیان داگیرکرد. رووسەکانیش ئەیالەتی مازەندەرانیان داگیرکرد. عوسمانی یش روژاوای ئیرانیان خستە ژیر فەرمانرەوایی خویانەوە. خانە پاشای بابان کە سەر بە دەرباری عوسمانی بوو، پاش وەدەست هینانی ناوچەی سنە، مەلاعەبدولکەریمی قازی بو راگەیاندنی موژدەی سەرکەوتنەکانیو وەدەست هینانی مووچەو یارمەتی بو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت وخانووو بەرەکانیسنە، رەوانەی دەرباری سولتانی عوسمانیکرد. مەلاعەبدولکەریم کە گەیشتە دەرباری سولتان پەیامی خانە پاشای راگەیاندیو دەرباریش مەلای ناوبراوی بە خەلاتی زور وزەوەندەوە سەر بلیند کردو بەوپەری نوازشتەوە کردی بە مفتیی کوردستان و گەرایەوە بو ولاتی خوی. لە سالی ١١٣٨ ی ك دا لەو جیگایەی کە ئیستا باخیکەو نموونەی بەهەشتی بەرینەو نزیکی کوشك و تەلاری مەرکەزی ئیرنشینەو بە فیردەوس بەناوبانگە، قوتابخانەییکی بنیات

ناو لە مەودایێکی کورت دا پاشای بابان هەر کەم وکووڕی یێکی هەی بوو، تەواوی کردو هێندەی دیکەی وەسەرناو منارەیێکی جوانی لێ دروست کرد. تا سەردەمی فەرمان ڕەوایی پرشنازیی ئەمانوللاخانیش هەر مابوو و من بۆ خۆشم دیتم. ئەمانوللاخان لەبەر ئەوەی بوونی ئەم منارەو ئاسەوارەی بە مایەی سەرشۆڕیی ئەردەلانەکان دەزانی وێران و خاپووری کردو داری بەسەر بەردیەوە نەهێشت.

چون دەولەتی نادرشا لە ڕۆژهەلاتی ئێرانەوە ئەستێرەی پرشنگی داو شاتاماسبیش کە لەو سەر وبەندەدا نیوی کەوتبووە نێونیوانەوە، نادر قولی ئەمەی بە هەل زانی و کردی بە بیانوو و دەسپێچك بۆ خۆی و توانی ئێران لە چەنگالی بیانی ڕزگارکاو بە لەشکرێکەوە بەرەنگاری پاشا عوسمانی یەکان کە کرماشان و سنەو هەمەدان وکوردستانیان داگیرکردبوو بۆوەو پاش شەڕوشۆڕی عوسمانی و بابان بەزین و هەلاتن و لەشکرەکەی نادرشا سەرکەوت [۱]. زۆربەی پیاوماقوولانی کوردستان لەو شەڕەدا کوژران و لەناوچوون و بەشێکیشیان لە کۆت وزنجیردران. خوسرەو بەگی مونشی و مەلا عەبدولکەریمی قازی لە ناو کوژراوەکان دا بوون و هەروەها محەمەد عەلی بەگی وەکیلیش لەناو لەکۆت و زنجیردراوەکان دا بوو. لە سالی ۱۱۳۲ی ك دا لەشکری پیرۆزی نادر شا هاتە ناو سنەوە. نادر شا محەمەد قولی بەگی وەکیلی، کە لە نیو بەندکراوەکان دا بوو. بانگ کردو لێی پرسی: کەسی لە بنەمالەی ئەردەلان ماوە شیاوی فەرمانڕەوایی بی، تا پلەو پایەی فەرمان ڕەوایی باو وباپیرانی پی بسپێردری؟ محەمەد قولی بەگ سوبحان وێردی خانی کوڕی محەمەد بەگی دەست نیشان کرد، گوتی: هەر ئەو دەتوانی ئەم کاروبارە لە ئەستوی خوی بگری. نادر

شایش نێوبراوی کرد بەفەرمان ڕەوای کوردستان و ئەیالەتەکەی پێ سپارد.

## سوبحان وێردی خان

سوبحان وێردی خانی بەهەشتی پێش وەی عوسمانیەکان ناوچەکانی

ئێران داگیرکەن، لە ناوچەی ئەسفەندئاباد خەریکی بەڕێوەبردنی

موڵکەکانی باووباپیری بوو، بەلام لە سەروبەندی حوکمرانیی عوسمانییەکان دا، حوکمرانیی ئیسفەندئاباد و[42] گەرووس وخەمسەی لە ئێران، لە لایەن عوسمانییەکانەوە پێ سپێردراو نازناوی سوبحان ویردی پاشای پێ بەخشراو لەو سێ ناوچەیەدا بوو بە فەرمانڕەوا.

بە فەرمانڕەوای کوردستان و ئەیالەتەو گەیشتە پلەوپایەی خۆی سەرسنوورەکانی قایم کردو دای مەزراندنەوە، هەڵی کردە سەر ئازربایجانیش، ئەوێشی وەدەست هێناو ئەمن و ئاسایشی تێدا چەسپاند. لەو ناوچەیە زۆر نەمایەوە، ڕووی کردە خوراسان. شا تاماسبیش کە کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی کیشوەرگیری و لە دڵەوە دەی ویست هەر خۆی یەکە سواری مەیدان بێ، بە نەما ی وەدەست هێنانی ناوچەکانی ئازربایجان، ڕووی لە ناوچەکە کرد، بەڵام لەبەر بێ سەروبەری و کەم تەدبیری، پاش ئەوەی لەگەڵ عوسمانییەکان دا بەشەڕهات، هیچی بە هیچ نەکردو ناچار

لەگەڵیان دا ڕێككەوت و ئەو شوێنانەی گرتبوویانەوە، کەوتنەوە دەست عوسمانی‌یەکان. لەو سەردەمەدا خالید پاشای بابان، برای خانە پاشا بە لە شکــرەکــەیــەوە هەڵی‌کــردە سەر ئەردەڵان و داگیــری‌کــردو لە ساڵی ١١٤٤ی ك دا حوکمرانیی ئەو ناوچەیەی گرتەدەست. سوبحان وێردی خان پاش دوو ساڵ لە فەرمانڕەواییی خۆی شاردەوەو بە ماڵ و سامانەوە هەڵات بۆ تاران، بۆ چاوەڕوانــی‌کــردنــی نادرشا. نادر شا پاش ئەوەی هەراتی گرت بە پەلــە ڕووی‌کــردە ناوچــەی ئازربــایجــان و عیراق و لە ڕێگــا زۆربـــەی ناوچـــەکـــانی ئێـــرانی بە دەستی توانــای لە دژمنــان خاوێن کردەوەو زۆربەی یاخی‌یەکانی کوشت و لە ناوداو بۆیەکجاری دوواییی بە دەســدرێــژیی عوســمــانی‌یــەکــانی سەرسنــوورەکانی هێنا.
سوبحان وێردی خانیش بە کۆمەگی لەشکری نادرشا بەسەر لەشکری بابــان دا بووو لە جێی باووبــاپیــرانی سەقام گیــر بوو. کاتێ لەشکری نادر شا گەیشتە هەمەدان، حاجی مستەفا بەگی ئەشتەرانی‌و نەزەر عەلی بەگی، کە لە پیــاومــاقووڵانی بوون، بە شوێن سوبحان وێردی خان دا نارد. بەگەیشتنی‌ئەم دوو زاتــە بە سنــە، چوونــەلای سوبحــان وێــردی خان، سوبحان وێردی داوای لێبوردنی کردو گوتی ئەیالەتی ئەردەڵان بە هۆی‌خۆســەپــانــدنی پاشاکانــەوە تێــك چووەو هەموو خانووبەرەوە کۆشــك و تەلارەکانی سنــە پیــوستیــان بە چاك کردن هەیــە. لەبەر ئەوە نای‌پـــەرژێ بکـــەوێتـــە تەك لەشکــری نادر شا. نادر شایش عوزری قوبــوڵ کردو ڕێی‌دا هەرلەئەیالەتــەکەی بمێنێتــەوە. بەلام زۆری بری لە خەڵــکــی کوردســتــانــی ئەردەڵان بۆ شکـــات کردن لە دەست سوبحــان وێــردی خان چوون بۆ دەرباری نادر شاو بەڵێنی دیاری‌یەکی

زۆریان دایەو ئەویش سوبحان وێردی خانی بۆ لەسەر فەرمان ڕەوایی لابردن.

## فەرمانڕەوایی مستەفاخان

بە پێی قسەی خوسرەو بەگ، مستەفا خان کوڕی محەممەد خانە، بەڵام لە دووتوێی نووسینەکانی مە لا محەممەد شەریف وامان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە نەتیژەی محەممەد خان کوڕی عەباس قولیخانە هەر چۆنێ بێ سوبحان وێردی خان بە گزی وفزێی هێندێ لە خەلکی کوردستان لە فەرمان ڕەوایی خراو مستەفا خانی لە جێ داندراو عەلی بەگیش کە یەکێ بوو لە پیاوچاکانی نادر شا بە ناوی بریکارەوە داندرا. فەرمان ڕەوای تازە تابلێی بێ ئەقل و گەمژەو نەکارەو کەم زان بوو و هەرگیز سەری لەحوکمڕانی و کاروبار ڕاپەڕاندن دەرنەدەچوو، هێشتا چل ڕۆژ بە سەر فەرمان ڕەوایی یەکەی داتێنەپەڕیبوو، مەحموودی سارایی بە سێ سەت سوارێکەوە هەلیکوتایە سەر سنە. مستەفا خان بە دەستی خالی ئەیالەتەکەی بۆ چۆل کردو هەلات [٤٣]. لەو ڕۆژگارەدا کە نادر شا سەرگەرمی داگیرکردنی بەغداو ناوچەکانی دەوروبەری بوو، خەبەری سەرکێشی و یاخی بوونی محەممەد خانی بلووچیی لە شیراز بیست. پاش ئەوەی کاروباری بەغدای سەروبەرنا، بە نیازی گوێ ڕاکێشانی محەممەد خانەوە لە ڕێی عیراقەوە ڕووی کردە ناوچەی فارس و بلووچستان. نادر شا دوای ئەوەی لە سنووری بلووچستان گەڕایەوەو هاتە مەیدانی مەحموودی سارایی یەوە ڕووی کردە ناوچەی

ئەردەلان . کاتێ گەیشتە ئەوێ داوای کرد ئەو مستەفا خانە بێ غیرەتەی بێننە بەردەست. کاتێ هێنایان ، یەکسەر فەرمانی دەرکرد، لە سەر یان دا ، لەو ساڵەدا سوبحان وێردی خان بۆ جاری سێیەم کرایەوە بە فەرمانڕەوای کوردستان . ئەوەی شیاوی باسە سوبحان وێردی خان لەم شەڕەدا لەناو لەشکرەکەی نادر شادا بوو. چون مستەفا خان بە شیری نادری کوژرا، سوبحان وێردی خان کرا بە فەرمانڕەوا. بە بۆنەی ئاژاوەو ئاشووبەوە وڵات وا وێران ببوو. - جارێ داری بەسەر بەردیەوە نەمابوو. بووجەی دەوڵەت بەجارێ کز ببوو و بەشی هیچی نەدەکرد. بەم جۆرە وڵات بەجارێ وێران ببوو. سوبحان وێردی خان باس و هەواڵی ئەم بشێوی و بێ سەروبەرییەی وڵاتی سەرلەبەر لە رادەی مەرکەزی دەوڵەت راگەیاندو توانی بودجەی ئەیالەتەکە بگەێنێتە رادەی حەوت هەزار تمەن . جگە لە مووچەی خۆی و پیاوە گەورەکانی کوردستان . ئیتر بەم شێوەیە خەلکەکە حەسانەوەو بژیوو گوزەرانیان خۆش بوو. سوبحان وێردی خان بەم رەنگە، بەوپەڕی سەربەخۆیی و شان وشکۆوە فەرمانڕوایی کرد. لەم سەردەمەدا خان ئەحمەد خانی کوڕیشی لەگەڵ برێ لە گەورەپیاوانی کوردستانی ئەردەلان ، وەك ئەللا وێردی بەگ و حەسەن بەگی میر ئەسکەندەری و پێنج صەد کەسی تر لە ئازاو دلێرانی بەناووبانگی کوردستان لە نێو ئەو لەشکرەدا بوون ، کە نادر بۆ گرتنی هیندستانی بەرێ کرد. لە ساڵی ۱۱٥۲ ی ك دا گەڕانەوە. چون خان ئەحمەد خان لەو سەفەرەدا پیاوەتی ومیرخاسیی زۆری نواندبوو شێرانە کوشتارێکی زۆری لە دژمن کردبوو خزمەتێکی زۆری کردبوو، نادرشا کردی بە جێگری فەرمانڕەوای کوردستان و لەگەڵ شەریف خان وچەند میرێکی دیکەدا بۆ ئەردڵانی ناردنەوە.

نادر داوای‌کرد سوبحـان ویـردی خان بێنن بۆ ئەسفـەهـان، چونکە ژنـەکـەی بەیـارمتـە لە ئەسفـەهان بوو. لەسەرەتای بورجی قەوسەوە تا سەرەتای حەمەل لەوی مایەوە. پاش جێژنی نەورۆز بەرێ‌کەوت . لەو کاتەدا کەنادرشا لە سەفەری تورکستان دەگەڕایەوە زیاتر لە صەت هەزار سەربـازی لە دەور خر ببـوەوە، ئەشـرەفی مازەندەران گەیشتە خزمەتیو زۆری پێشـوازلیکرد. نادر شا، حاجی سەیفەددین خان و [٤٤] محەممەد حوسەین خانی کە لە گەورە پیاوان بوون، بەپلەوپایەی ڕوکنوددەولەی سەر بلێنـدکـردن و ئەوانیش لە قسـەی دەرنـەدەچـوون. ئەوسەردەمـە کەنــادر شا لە قەزوین بوو خان ئەحمـەدخــان جێگـری باوکی بوو، هەستی‌کرد خەڵکەکە لەتاو ڕفتارخراپیی گیانیان هاتۆتە کونەلووتیان وبە جارێ لێی وەڕەز بوون. لە ترسی ئەوەی نەوەکـا باوکی سەرلـەنـوێ بۆ وڵات بگەڕێتەوەو سزای‌بداو سەرکۆنەی‌کا ، ئەمری بەخەڵکی ئەردەڵان کرد، بچنـە دەربـاری شا، شکـات لە سوبحـان ویـردی خانی باوکی بکـەن، بڵێن، سوبحـان ویـردی خان پارەیێکی زۆری لە خەزێنـەی ئەیـالـەت بەنـاوی خۆیـەوە دەرکردووە. ئەوانیش بەدیاریو پێشکێشی گەورەوگرانەوە چون بۆ دەرباری شا، بۆ شکات. شکات کەرەکان لە ئەمیندارو وەزیرو حسابگرو دەفتەردارو سەرلەشکران پێك هاتبوون.
پاش ئەوەی گەیشتنـە ئۆردووی گەورەی شا کە لە زنجـان وسوڵتـانی‌یە هەڵی‌دابوو، مەسەلەکەیان لەشا ڕاگەیاند، بەڵام لەبەر ئەوەی سوبحان ویــردی خان بڕوایێ کراوی شابــوو زۆری‌گـوێ بە درۆودە لە سەی خەڵکی سنـە نەداو لەوبـابـەتـەوە هیچی وای نەفەرموو. خان ئەحمەد خانیش لەراستیی کارەکــە گەیشت، ئومێــدبــڕ بوو. پاش ماوەیێ لە دەربارەوە ئیزن درا بەرەو ویلایەتی ئەردەڵان بەرێ‌کەوت وگەڕایەوە.

خان ئەحمـەد خان لەگـەرانـەوەدا فەرمـانی پێ کـرا، دە هەزار خەروار ئالیك و ئازووخەلە ناوچەی ئەردەلان کۆکاتەوەو لە هاروون ئابادوکرند بۆ کەڵـەکـا . لـە کاتێکـدا نادر شا لە ساڵی ١١٥٤ی ك دا بۆ داغستـان دەچـوو سوبحـان ویـردی خان داوای لێ کرد رێگـەی بدا بۆ سنـە بگـەرێتـەوە. خان ئەحمەد خانی کوریشی لەگەڵ نادر شادا نارد بروا بۆ داغستـان هەروەهـا چوار هەزار سواری لە ئۆزبەگ، بە سەرکردایەتیی عاشوور خان خستە ژێر فەرمانەدی سوبحان ویردی خانەوە. لە کاتی پێویست دا سوودیان لێ وەرگرێ، بەتایبەت. بۆ تەمێی بلباسەکان کە یاخی ببـون . خـانی مەزن پاش ئەوەی گەیشتە کوردستانی ئەردەلان لەتـەك لەشکـرەکـەدا کە راسپێـردرابـوو، بۆ ناوچـەی بلبـاسـەکـان چێ هەڵی کـردە سەر ئەو ناوچـەیـەو بەراست و چەپـدا تێ کـەوت . گـرۆی سەرپێچی کەران بەجـارێ تێـك وپێـك شکـان و بە سەرکزیەوە بەڵێنی خەرج وباج دانیان داو دیاری وپێشکێشی زۆریان بۆ خزمەت شا هێنا. سوبحان ویردی خانیش بە سەرکەوتنەوە بۆ وڵات گەریەوە.

محەمەد قولی بەگی وەکیلیش کە جاران کاربـە دەستێکی بەرچـاوی ئەیـالـەتی ئەردەلان بوو، سێ مانـگ پاش گەرانەوەی سوبحان ویردی خان بۆ سنـە ناردرابـوو داغستـان بۆخزمـەت نادر شا. کاتێ شا دیتی زۆری چوو بە دڵەوە.

نادرشا سوبحان ویـردی خانی داواکـردەوە خان ئەحمەد خانی کوری کەلـە سەردەمی داگیـرکردنی داغستان دا ئازایەتییەکی زۆری نوواندبوو قەڵای ئای مەکی[٤٥] کـە ماوەی دوو ساڵ لەشکـری نادر شا گەمـارۆی دابـوو بۆنەگیـرا بوو، کرد بەفـەرمـان رەوای ئەردەلان و محـەمەد قولی بەگیشی کرد بە بریکار.

## خان ئەحمەد خانی سێیەم

کاتێ خان ئەحمەد خانی سێیەم بە فەرمانڕەوایی ئەیالەتی ئەردەلان سەربلیند کرا[٤٦] ئاکار و ڕەفتاری خۆی گۆڕی و ئەیالەتی سنەی بە خێر وخۆشی ڕازاندەوەو خەڵکی وڵاتەکە هەموو دڵیان خۆش بوو لە نارەحەتی ڕزگاربوون . لە پێناوی وڵات پاریزی و ژێردەست دڵدانەوەدا زۆر تێ کۆشاو ڕەنجێکی فرەی بەخەرج دا .
بۆ لەناوبردنی پیاوخراپ و دزودرۆزن هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دا . زۆری نەبرد قات وقڕێکی قورس وگران لە وڵاتەکە کەوتەوە . قات وقڕەکە هێند سەخت لەکێش بەدەر بوو نانێ بە گیانێ نەدەکردرا .
خانێ ئەحمەد خان بۆ چارەسەرکردنی ئەم قات و قڕ نەهامەتی یە ئازووخەیێك کە بۆ ئالیك وئالفی لەشکری نادر شا خرکرا بۆوە ، بەسەر خەڵکی کوردستانیدا بەشی یەوە کە بەشکو خەڵکەکە لەم تەنگانەو ڕۆژڕەشی بە ڕزگاریانێ هەر لەبەر پەریشانی وڵات و خەڵکەکە کە بەجاری برستی لێ بڕابوو، خان ئەحمەد خان دەستی بۆ عەمارەکانی شایش درێژکرد . گەنم وجۆیەکی زۆری بەسەر خەڵکەکەدا بەشی یەوەو ڕازی کردن . بەڵام پاش ئەم کردەوەیە ترس و سامی شای لێ نیشت ، بۆ کۆمەگە خوازی ڕووی لەو وڵاتی ڕۆم کر د .
لە ڕێگا ظاهیر بەگی جافی لێ ڕاپەڕی ، بەڵام خان ئەحمەد خان لەسەر ئەم کردەوەیەی لەسەری داو کوشتنی خالید پاشای بابانیش پاش ئەوەی بەم هاتنەی خان ئەحمەد زانی ، بە پیریەوەهاتو زۆری پێشوازلێ کردو دەرووی دۆستایەتی و یەکێتی لەڕوو کردەوە . خان ئەحمەد خان پاش

ئەوەی چەنـد رۆژێ لە مەڵبـەنـدی بابـان دا مایـەیـەوە، بەرەو مووسـڵ بەرێکـەوت. فەرمانڕەوای مووسـڵ بە هەمـوو خۆبـەزل زانین و ملهـوڕی‌یـەوە بەرەنگـاری‌بووەرگاکانی قەڵای مووسڵی لێ‌گارەداو بەم جۆرە داوی ئاشتی‌یان لەنێوان دا پساو کۆری شەڕیان گەرم کرد.
خان کە ئەم ڕووداوەی دیت تـووڕە بوو لەگەڵ سەربازاکانی‌دا هەڵیان کوتـایـە سەر قەڵاکـەی مووسڵ و داگیریان کرد. پاش داگیرکردنی قەڵا فەرمـانــڕەواکـەشیـان گرت و بەچـارەنـووسیان‌گەیـانـدولە شیـریـان کێشـا. ئـەنجـا خان ئەحمـەد خان لە ناوچەی مووسڵـەوە بۆ دیار بە کرو حەڵـەب بەرێ کەوت هەرچی کاربـەدەستـانی ئەو ناوچـانـە هەبـوون ، هەموو بە پیر بەوە هاتن موزریان بۆ هێنایەوەو پیرۆزبایی‌یان لێ کردو بەم شێـوەیـە خۆی بە دەربـاری سولتـانی عوسمـانی گەیـانـد سولتـان مەحمـوودی سولتـانی عوسمـانی هاتنی خان ئەحمـەد خانی بەهـەل زانی، سەدری ئەعزەم و وەزیران و گەورەی دیوان بەرەو پیر نارد. پاش چاوپێ کەوتن بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازیان لێ‌کرد.
شایـانی باسـە، پاش ئەوەی خان ئەحمـەد خان ئەیـالەتی ئەردەڵانی بەجێ‌هێشت مەنوچەر بەگی ئەردەڵان، باپیری خوسرەو بەگ، خاوەنی کتێبی «تاریخ اکراد» لەبەر بەناوسالداچوون و ئەزموون زۆری کرا بە یاریکاری فەرمانڕەوای ئەردەڵان.
هەرکـە نادر شا بەم ڕووداوەی زانی داوای مەنـوچـە ربـەگی کردو بارودۆخـی ئەو ناوەی لێ‌پـرسی، ئەویش دەنـگ و باسی قات وقـڕ و هەژاری و پەرێشـانیی خەڵکـەکـەی بە دووروودرێـژی ڕاگـەیـاندێ و بە ڕاوتـەگبیـری ئەو، دووبـارە سوبحان وێردی خان گەڕایەوە بۆ ناوچەی کوردستانی ئەردەڵان.

خەڵکی ناوچەی ئەردەڵان کە لە ترسی شەڕ و شۆڕێکی لە پاش ڕۆیشتنی خان ئەحمەد خان کەوتبووەوە ولاتی بەجاری گرتبووەوە لەدەست زۆرداری و ستەمکاریی نادر شا کە هەر یەکە بە لایەکدا بلاوەی لێ‌کردبوو و لە ولات هەلاتبوون، هەموو گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان و لە سای بەزەی فەرمانڕەوای تازەدا حەسانەوەو سەرئاسوودەبوون.

دەربارى سوڵتانی عوسمانی لەشکرێکی گەورەی خستە تەك خان ئەحمەد خان و ئەرکی بەگژئێراندچوونی لە ئەستۆ خرا. لە ڕێگای ئەرزەڕۆمەوە بەرەو ئێران بەڕێ کەوت. نادر شایش بۆ بەرەنگاربوونی خان ئەحمەد خان خۆی تەیارو ئامادەکرد. پاش شەڕێکی گەورە خان ئەحمەد خان لەشکرەکەی ڕۆمی شکاندو تاتوانی ڕاوەدووی‌نان، بەلام خان ئەحمەد خان هەر وازی نەهێنا، دوو سێ جاری دیکە بە لەشکرێکی گەورەوە لەگەڵ سەرکردە ناودارەکانی عوسمانی‌دا، لە ڕێی مووسڵ و بەغداوە بۆ داگیرکردنی سنە، هاتە ناوچەکەوە. بەلام هیچ سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا، پاش چەند شەڕ و تێك گیرانێ، کە لە هەموویان دا شکستی‌دەهێنا، ناوچەکەی بەجێ‌دەهێشت و دەگەڕایەوە بۆ ناوچەی ڕۆم.

ئەم بارودۆخە هەر بەو ڕەنگە مایەوە، تا نادر شا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی‌دا ڕێك کەوت و بەم شێوەیە سوڵتان بۆ بەژەوەندی هەردوو دەوڵەت، هێنای کردی بە والیی ئەدرنە، ئیتر بەم جۆرە خان ئەحمەد خان دەستی لەو ناوچەیە پچڕاو خەڵکی ناوچەکە بۆخۆیان ئاسوودەسەر بوون و ئەویش لە ئەدرنە فەرمانی خودای بەجێ‌هێنا.

وەك دەگێڕنەوە: خان ئەحمەد خان کاتێ لە ولاتی ڕۆم بووە،

نامەیێ، ڕاسپاردەییکی بۆ ناوچەی سنە هەبوایە، ئەو کەسە دەهاتە ماڵی حاجی عەلی کەلانتەر کە باپیرەگەورەی نووسیاری ئەم کتێبەیە، پاش ئەوەی کاروباری خانی بەجێ‌دەهێنا دەگەڕایەوە بۆ وڵاتی ڕۆم. پاش مردنی خان ئەحمەد خان هەرچی‌یەکی بە میرات لێ‌بەجێ مابوو سوڵتانی ڕۆم نرخی لێ‌ناو بە زیادەوە بۆی بە نەخت قەرساندو ناردی بۆ لای والیی بەغدا، بە سەر میراتگرەکانی‌دا بەش کرێ. سوبحان ویردی خانیش مەلا ڕەحیم ناوێکی نارد، چوو ئەم ئەمانەتەی وەرگرت و هێنای بۆ سوبحان ویردی خان.

لەو ماوەیەدا کە نادر شا خەریکی بەغداگرتن بوو دایەکزی و تێك شکا. بە هۆی ئەم شکستەوە هەر هات و بەرەو کزی چووو تا هەمەدان خۆی نەگرتەوە. چل ڕۆژ لە هەمەدان مایەوە. هەرچی لەشکری پەراگەندەی هەبوو سەرلەنوێ لەوێ لێی خڕ بوونەوە. لەشکری زۆربەی وڵاتی داوا کرد. لەشکری ئەردەلانیش بە سەرکردایەتی حەسەن عەلی سوڵتان کوڕی عەباس قولیخانی والیو محەمەد سەعید سوڵتان، بە هەموو پێداویستێکی شەڕەوە تێکەڵ بە لەشکری نادر شا بوو. لەم نێوانەدا مەلیك حوسەین بەگی کەلانتەر کە سەرپەرشتکاری ئازووخەی شا بوو نەی‌توانی بگاتە لەشکرەکەی نادرشا، ناچار هەڵات، بەڵام دووبارە لە بەردەع گەیشتەوە ئەردووی شا. هۆی بە ئۆردووی شا نەگەیشتنیو دوواکەوتنی ئازووخەی خستە ئەستۆی سوبحان ویردی خان و دەست و پێوەندانی. نادر شا لەم کردەوەیە دڵی ڕەنجاو سوبحان ویردی خانی لە سەرکار لاداو مەولا ویردی خانی قاجاری قەزوێنیی بە ناوی سەرپەرشتکاری ناوچەی سنە داناو سوبحان ویردی خانیشی بە ناوی بێگلەر بەگیی تارانەوە دانا.

# زابتیی مەولا ویردی خان

پاش ئەوەی مەولا ویــردی خان هاتــە سەر کار بە بۆنـەی ویـرانیی وڵات وپــەرش و بڵاوبـــوونـــەوەو هەڵاتنی گەورەو پیـاوماقـووڵان و ژێـردەستـەو بێچـارانەوە دەسەڵاتێکی ئەوتۆی لە خۆیدا بەدی نەکرد، ناچـار دەستی لە ویـلایـەت کێشـایەوەو بایی پووشکەیەك هەقی بەسەر کاروباری ماڵ وسامانەوە نەبوو. پاشان کە مەسەلەکە بۆ نادر شا ڕوون بۆوە، پاش شەش مانگ لە سەر کار لابراو بۆ جاری شەشەم سوبحان ویردی خان بۆوە بە والیی ویلایەت. بەڵام فەرمانڕەواییی ئەم جارەی لە سێ چوار مانگ زیاتر درێژەی نەکێشاو بە هۆی سەلیم پاشای بابانەوە کە ڕووی لە ڕۆم وەرگێـرابـــووو لە سای بەزەی نادریدا گیـراسـابـۆوە، فەرمـــانـــڕەوایی ئەردەڵان بە حەســـەن عەلی سوڵتـان کوڕی عەبـاس قولیخان کە بە لەشکری ئەردەڵانەوە لە سوپای نادر شادا بوو بەخشرا.

# هەسەن عەلی خان کوڕی
# عەبباس قولیخان

چون حەسەن عەلی خان بە پلەی ئەیالەت سەرفراز بوو بە پایەی میرێتی سەر بلێندکرا وڕێگای باووباپیرانی پێشینی خۆی گرتەبەرو لەگەڵ گەورەو سەردارانی هەموو لایەکدا شێوەی خۆش ڕەفتاریی لەپێش گرت و ژێردەستانی بە هاتنی شادو دڵخۆش کرد.

لەم سەروبەندەدا لە لایەن دەربارەوە فەرمان دەرچوو کە بە زووترین کات محەمەد قولی بەگی وەکیل خۆی بگەیێنێتە مەرکەزی دەوڵەت لە ئەسفەهان . محەمەد قولی بەگی وەکیل هەرکە گەیشتە دەربار، پێش ئەو عەبدولڵا سولتانی بەرازو [٤٧] عەلی قولیخانی لێلاخی‌و چەند کەسێکی تر لە باوەڕپێکراوانی ئەیالەتی ئەردەڵان خۆیان گەیاندبووە ئەسفەهان ، هەرچی خراپە لەدژ محەمەد قولی بەگی وەکیل لە دەربار بگەیێنن. پێشتر چەندی لە ئەیالەتەوە بۆ تێچەندرابوو، ئەمیش هێندەی دیکەی بۆ هاویشتە سەر.

نادر شایش پاش ئەوەی سەرکۆنەو ڕیسوای‌کرد بە تاوانی دەسپیسی‌و ڕەفتارخواری لەگەڵ خەڵکی ئەیالەت دا کۆت و زنجیرکراو بۆ گوێ‌ڕاکێشانی پێنج هەزار تمەنیشی [٤٨] لێ ساندرا. ئەنجا لەگەڵ یاساوڵ و باجگرەکان دا گەڕاندرایەوە بۆ ئەیالەتی ئەردەڵان. پاش ئەشکەنجەو ئازاردانێکی زۆر بە هەزار دەردی سەری ئینجا هەزار تمەنیان لێ‌هەڵوەراند. هەر لەوێ هەردوو چاویشیان هەڵ کوڵی‌و

یاسـاوڵ و باجگـرەکـانیش گەڕانـەوە بۆ ئەسفـەهـان . نادر شا هەر بەم تاوانـە، لەدوای ساڵی حەسـەن عەلیخـانی لە فەرمـانـڕەوایی ئەیالەتی ئەردەڵان خست. لە ساڵی ١١٥٠ی ك دا سەرلەنوێ سوبحان وێردی خان کرایەوە بە فەرمانڕەوای ئەیالەتی سنەو بەم جۆرە گەڕایەوە بۆ شاری سنـە. هەروەهـا بەحیـا قولی بەگی ئەشتـەرانیو مورتـەزا قولی بەگی زەنگەنەو قاسم خانی

سەرحەد بەگی ئەفشاریشی لەگەڵ دا ناردرانە سنە بۆوەگرتنی پاشماوەی ئەو خەرج وبـاجـەی کە لەسـەر محـەمـەد قولی بەگە بوو بـەماڵ دەبوو بیدائەوە پاش ئەوە گەیشتە سـنـە هەمـوو تونـدوتیـژیو جەز رەوەبـەکیـان بەکارهێنا، بەڵام، ئەوەی راستی بێ، تاکە دینارێکیان لێوەگیرنـەکەوت نادر شا داوای باجگـرەکـانی کرد بێن بۆ ئەوێ. ئەو بێچارانە لە ترسی ئەو ستەمکارە، ناچـار هەڵاتن بۆ وڵاتی عوسمـانی. سوبحـان وێردی خان دووبارە لە فەرمانڕەوایی خراو محەمەد ڕەزا بەگی گورجیی لە جێ کرا بە بەرپرسیار.

## زابتیی محەمەد ڕەزا بەگی گورجی

محەمەد ڕەزا بەگی گورجی پیاوێکی تا بڵێی بەدخووو هەرزەوێژو هەڵەوەر و دەمپیس و بەدرابوو. گەورەو بچووك لە بەدنیهادیو خوێنڕێژیو ناپاکیی ئەم پیاوە گیانیان هاتبووە کونەلووتیان. خەڵکەکە ناچار لای نادر شا شکاتیان لێکردو هەموو بەدرەفتاریو نائاکارییەکانیان لە کن شا گێڕایەوە. نادریش بۆ بەدەنگ هەژارو دەستەوسانانەوە چوون و بەزەیی بەژێردەستاندا هاتەوەو ئاواکردنەوەی تەیالەتەکە، بۆجاری هەشتەم سوبحان وێردی خانی کردەوە بە فەرمانڕەوای ئەردەڵان و محەمەد ڕەزا بەگی گورجی لە بەرپرسیاری خرا.

## میرنشینیی سوبحان وێردی خان بۆ جاری هەشتەم

«چنین است رسم سرای سپنج
گهی شادی آرد گهی دردو رنج»
بەکوردی:
ڕێ وڕەسمی ڕۆژگار ئاوهایە
گاشادی دێنێ گا دەردو ڕەنج

چون سوبحان وێردی خان بە فەرمانی نادری بۆجاری هەشتەم پلەوپایەی فەرمانڕەوایی پێ بەخشرایەوە بڕیاری دا خەریکی ماڵ و

سامان خرکردنەوە بێو خەڵکێکی زۆریش لە دەوری خۆی کۆکاتەوە. بەڵام سەبارەت بە وێرانیی ویلایەت و هەژاری خەڵکەکە، هەرچەندی بیرلێکردەوەو هەرچەندی کردو کۆشا نەیتوانی دیناری خرکاتەوە.

لەم سەروبەندەدا ئەوخەبەرەیش بڵاوبووەوە کە چوار هەزار لە سوارانی ئەفغانی‌یەکان بە ناوی داواکردنی پاشماوەی باجی ویلایەتی سنەوەو وەرگرتەوەی گوێ ڕاکێشانەی محەمەد قولی بەگ بەتەمان بێنە سەر ویلایەتی سنە. ژێردەستەو هەژار، بگرە گەورەو ناودارو خانانیش تێك را دەستیان لە گیانیان شۆردو بریاریان دا هەموو هەڵێن. بەڵام ئەوە بوو لە ساڵی ١١٦٠ ی ك دا خەبەری کوژرانی نادرشا گەیشت و خەڵکەکە نەختێ هێورینەوەو سەرسووك بوون. هەر لەم ماوەیەدا کەلە کوردستان کاربەدەست بوون، کەوتنە تاڵان وبڕوو هەرچی سوبحان وێردی خانیش بوو بە تەگبیرێکی چاك سەرۆکەکانی یەکە یەکە بانگ کردە لای خۆیو ڕایگەیاندنێ کە لە دەوروکەناری ویلایەت چەند تیرەو هۆزێکی بەدەسەڵات هەن دەیانەوێ دەست درێژی‌یان لێ بکەن، بەڵام بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەمان ئەم خەبەرەمان تا ئێستا لە نادر شا شاردبۆوە. بەڵام ئێستا کە هەواڵی مردنی نادر شا بەرگوێی هەموو لایەك کەوتوتەوە، نامەیێکی زۆریان بۆ ناردووم ئیزنیان بدەم تاڵانیان کەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێوە هیچ خراپەیەکتان لێنەوەشاوەتەوەو لە چاکە زیاتر چیدیکەتان لێنەبیندراوە، داوخوازی‌یەکانیانم ڕەت کردوتەوەو ئێستایش بەرژەوەندی ئێوە لەوەدا دەبینم، تا زووە، پێش گەیشتنی ئەوان چارەسەرێکی خۆتان بکەن و بەهەر نرخێ بێ خۆتان بگەیێننە ناوچەیێکی تر.

ئەفغانی‌یەکان کە بەم خەبەرەیان زانی زۆر نارەحەت

بوون، لێیان دا ڕۆیشتن، تاهەمەدان نەوەستان. هەمەدانیان تالآن کردو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

بەپێی ئەو ئاژاوەو هەراو بگرەو بەردەیەی سەرانسەری ئێرانی داگرتبوو، کوردستانیش کەوتە گێژاوی ئاژاوەوەو دووبەرەکی لەناو خەڵکەکەدا تەشەنەی کرد.

لە کاتێکدا سوبحان وێردی خان بۆ یارمەتیو کۆمەگە کردنی ئیبراهیم شا خۆی گەیاندە لەشکرەکەی حەسەن عەلی خان لە ساڵی ۱۱٦۱ی ك دا خۆی بە فەرمانڕەوای کوردستان لەقەڵەم دا، بەڵام جەعفەر سوڵتان و محەمەد عەلی سوڵتانی بانە بە یارمەتیی سوبحان وێردی خانەوە هاتن و گەڕاندیانەوە بۆ سەر فەرمانڕەوایی سنە، زۆری نەخایاند، دووبارە حەسەن عەلی خان لە ساڵی ۱۱٦۲ی ك دا فەرمانڕەوایی سنەی گرتەوە دەست و سوبحان وێردی خان ناچار لەتەك خێزانەکەیدا ڕووی کردە هەمەدان و لەوێ دامەزرا چونکە زانی گەورەیی و سەرۆکایەتی تەنها هەر بە دەستی خودایە، نەك بە شان و شەوکەت. ئیتر دەورو خولی حوکمڕانیی نەداو ماوەی پێنج ساڵی لەو وڵاتە بەسەربرد، تا بە ڕەحمەتی خودا گەیشت و لەوێوە تەرمەکەیان هەڵگرت، بردیان بۆ چیای شەیدا[٤٩] کە شوێنێکە لە خاکی ئیلاق و نەزەرگەی دوو شەهیدە، لەوێ ناشتیان. ئەم قسەیەی باسمان کرد قسەی مەلا محەمەد شەریفە. بەڵام بە پێی بیروبڕوای خوسرەو بەگی موسەنیف کە نووسیویە، بۆیەکەم جار لە ساڵی ۱۱٦۱ی ك دا سوبحان وێردی خان لە فەرمانڕەوایی خراو حەسەن عەلی خانی لە جێ دانرا. سوبحان وێردی خان چوو بۆ هەمەدان و هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کرد. پاش شەش مانگ تەرمەکەیان هەڵگرت و بۆ ئەو

شوێنەیان برد کە باسمان کردو لەوێ نێژرا، بەڵام بەندەی کەمینە لەگەڵ ڕای یەکــەم دام. چونکـە ئەنکم یەکێ بووە لەوانـەی کە لە باوەشی ئەو بنەمـاڵـە بەرزەدا پێگەییوەو هاوسـەری والیی بلیند نژاد، خوسرەوخانی باوکی ئەمانوڵڵاخان بوو، گۆڕیان پڕ بێ لە نوور، دەربارەی سەردەمی منـداڵیی خۆی، بە تایبـەت لەو سەروبـەنـدەدا، کە بنەمـاڵـەکەیان لە هەمەدان بوو، زۆری سەرگوزەشتە بۆ دەگێرامەوە، لەو سەرگوزەشتانە وام بۆ دەرکـەوت کە ماوەی مانـەوەی سوبحان وێردی خان لە هەمەدان پێنج سـاڵ بووە. خودا هەر خۆی دەزانێ.

## حەسەن عەلی خان

چون خواڵیخـۆشبـوو سوبحان وێردی خان دەستی لە فەرمانڕەوایی هەڵـگـرت، حەسـەن عەلی خان بوو بەجێـگـری و کاروبـاری فەرمـانـڕەوایی بە سەر بەخۆیی بەڕێوەبردو دامەزرا. سەبارەت بەمە کە زیـاد لە دە هەزار کەسی گوێبـەفـەرمـانی لە تیرەو هۆزەکانی ئەفغان و ئۆزبـەگ و قزڵـبـاش و کولیـایـی و کورد لە ژێـر فەرمـان دا بوون دەسـەلاتێکی چاکی هەبـووەو بەمـە ناوچـەی کوردستـانی ئەردەلان بووژاویـەوە. بەڵام ئەم میـرە وردە وردە فیـزی زل بووو کەوتـە سەر لەئـاسمان سوین و بانگی (اناربکم الاعلی)ی بە گوێیدوورو نزیکدا هەڵداو دەسدرێژیی لە هەموو ناوچەکان کردو دەرگای تالان وبرۆی لە ڕووی دەرودراوسێ یانیدا خستـە سەرپشت. لەم سەروبـەندەدا میهر

عەلی خان ، کە لەگەڵ تیرەی زەندی‌یەدا دراوسێتی‌یان هەبوو هەمیشە لەبەر نێوان ناکۆکی یان لەنارەحەتی دابوون و نەشی‌دەتوانی هیچ بەربەرەکانی‌یەکیان بکا ، ناچار رووی لە کوردستان کردو داوای یارمەتیی لە حەسەن عەلی خان کرد .

حەسەن عەلی خان لەبەر ئەوەی توانست و دەسەلاتی لە خۆیدا دەبینی بە هاواری میهر عەلی خانەوە هات و بریاری دا زەندی‌یەکان لە کۆڵ کاتەوە . سوپایەکی لە ئەردەلانی‌یەکان و تیرەو هۆزی ئۆزبەگ و ئەفغان خرکردەوەو خۆی بۆ شەر ئامادەو تەیار کرد . کاتێ گەیشتە ناوچەی زەندی‌یەکان ، کەریم خان و شێخ عەلی خان و ئەسکەندەر خان ، لە تیرەی زەندی‌یە ، لە شکرێکی گەورەیان ساز کرد بوو ، بەرەنگاری لەشکرەکەی حەسەن عەلی خان بوون و لە نزیك مەلایر هەردوو لەشکر بە یەك گەیشتن و تێك گیران . ئەم دوو لەشکرە لە سالی ۱۱٦۲ی ك دا بەگژیەکدا چوون . ئازاو دلێرانی هەردوولا پاش ریزبوون و سان پێ‌دران هەڵیان کردە سەریەك و زۆر ئازایانە شەریان کرد . سەرەنجام زۆر لە ناسراوانی زەنگەنەو زەند بە شیر و نیزە کوژران . دوای شەرێکی گەرم و خویناوی بە یارمەتیی خودای گەورە شنەبای سەرکەوتن هەڵی‌کردو پاشماوەی زەندی‌یەکان ناچار هەلاتن و تالانێکی زۆریان لێ وەدەست هات .

حەسەن عەلی خان پاش ئەم سەرکەوتنە پیر وزە گەرایەوە بو ناوچەکەی سەر بە میهر عەلی خان و ناوبراوی کرد بە حوکمرانی ئەوی . خەلکی ناوچەکەیش بە دیاریی قورس و خەلاتی گرانبایی‌و شایانەوە حەسەن عەلی خانیان بەری‌کردو گەرایەوە بو کوردستان زوری نەخایاند حەسەن عەلی خان و ئیمام قولیخانی زەنگەنە نیوانیان

تێك چووو کار گەیشتە رادەیەك بەگژیەکدا چوون و دەستیان لەیەك دایە شیر وتیر. چیرۆکی رووداوەکەیش بەم جۆرەیە: پاش کوژرانی نادر شا، عەلی شاو ئیبراهیم شای برازای هەر کاو ناکاوێ سەریان بەرز دەکردەوەو داوای فەرمانرەوایی‌یان دەکرد. بەڵام زۆری نەبرد بنەوبارگەیان پێچرایەوەو لەناوچوون. تەنانەت کار بە ئەندازەیێ گەیشتبوو هەر خاوەن دەسەڵاتێ لە لایەکەوە لەشکرێکی بۆخۆی پێکەوە دەناو دەسەڵاتێکی پەیدادەکردو داوای فەرمانرەوایی دەکرد. یەك لەوان ئیمام قولی خانی زەنگەنە بوو کە لە ناوچەی کرماشان لەشکرێکی گەورەو گرانی لە خێڵ وهۆزەکانی زەنگەنەو کەڵهورو گۆران و هێندێ تیرەو تایفەکانی کرماشان پێك هێناو بە جەزایرچی‌و زەنبوورەك دارو تۆپخانەو ئاتەشخانەی زۆر وزەوەندەوە چەکدارکردو هاتە ناوناوانە وەو دای لە تەپڵی خۆنوێنی. جارێ هەر لە سەرەتاوە دەسدرێژی‌یەکی چاکی کردە سەر گوندو دێهاتەکانی ناوچەی ئەردەڵان. لە ناوچەیەکدا کە بیلاوەری پێ‌دەڵێن و دراوسێی کرماشانە، بە ئیشارەتی ئەو، بریکارو سەرکارەکانی دەستیان دایە خراپکاری‌و بە نارەوایی کەوتنە ئازارو ئەشکەنجەدانی خەڵکی ناوچەکە. حەسەنعەلی خان بە ناوی دۆستایەتی‌و دراوسێتی‌یەوە چەند جارێکی گلەیی لێ‌کردو ئەم خراپکاری‌یانەی بە چاودا دایەوە، بەڵام بێ‌هوودە بوو. پاشان ئیمام قولیخان بۆ ئازایی‌نواندن و رك دەربرین بەو لەشکرە گەورەو گرانەوە رووی کردە ناوچەی بیلاوەرو لە ژێر سمی ئەسپەکانیدا پلیشاندیەوە. ئەم کردەوەیەی ئیمام قولیخان حەسەن عەلی خانی توورە کردو لەکوردستانەوە زۆر بە پەلە. بە لەشکرێکەوە بەرێ‌کەوت و بەرانبەریان وەستا. لە بیلاوەر(بیلوار) هەردوو لەشکرەکە بە یەك گەیشتن. شێرانی‌و

ئەردەڵان لە سەربازانی ئیمام قولیخان دە وەك ڕێوی دەهاتنە پێش چاو، شێرانەو پشت بە خودای گەورە ڕوهاتن و ئەو لەشکرە گەورەوگرانەیان لە یەکەم هێرش دا بەزانـدو زۆربـەیان کوشتن و بە دیل گرتن. ئیمام قولیخـانیش بە هەزار ئەم سەرو ئەوسـەر گیـانی خۆی ڕزگـارکردو هەر هێندەی پێکرا لەگەڵ برێ لە هاوڕێکانیدا هەڵ بێ. هەرچی تۆپخانەو زەمبـوورەك خانـەو خەیمـەو خەرگـای هەبـوو بە دەست لەشکـری سەرکـەوتـووی ئەردەڵان کەوت. حەسـەن عەلـی خان دوای دابـەش کردنی دەسکـەوت بەسـەر لەشکـرەکـەی‌دا بۆ هەر یەکـە لە کرمـاشـان و مەلایـرو سونقـورو گوڵپـایـەگـان و بروجـەردو کەزازو فەرهـان و زۆربـەی ناوچـەکـانی عیـراق فەرمـانـرەوایـەکی دانـاو بە سەرکـەوتن و سەربـەرزی‌یەوە گەڕایەوە بۆ ئەردەڵان. لە ئاخرونۆخری ئەو سالـەدا دەولـەتی عوسمـانی سلێمـان پاشای بابانی لە فەرمانرەوایی خست و سەلیم پاشـای لە جێ دانـا. سلێمان پاشا پەنای وەبەر حەسەن عەلی خان بردو داوای یارمەتیی لێ کردو ماوەیەکیش لە سنە مایەوە. لەم ماوەیـەدا سەلیم پاشـای بابـانیش ناچار دەستی دەوستایەتیی بۆ حەسەن عەلی خان درێـژکـردو بە نامەیێ ڕای‌گەیاندێ کە چ ئەم چ سلێمان پاشا فەرمـانـرەوایێ هیـچ لە کارەکـە ناگـۆڕێ‌وئەوان هاوسێی یەکن و هەر کامێکیـان لەسـەر تەختی فەرمـانرەوایی بێ، ئەوەی پێویستە دەستی پێوە بگیـرێ‌و لەنگـەری ڕاگیرێ دۆستایەتیی ئەردەڵانە، واتە: یارمەتی‌دانی سلێمـان پاشـاو ڕوولە ئێمـە (واتـە سەلیم پاشـا) وەرگێـران کارێکی پێـویـست نی‌یە، بەڵکو نێوانچاك کردنەوەی هەردوولا ئەرکی سەرشانی بەرێـزیـانـە. پاش گەیشتنی نوێنـەری پاشـاو خوێندنەوەی نامەکەی. حەسـەن عەلی خان بەوپـەری بێ‌پـەروایی‌یەوە وەلامی دایەوە، گوتی.

سەبارەت بەوە سلێمان پاشا پەنای وەبەر ئێمە هێناوە، دالدەدان و یارمەتی دانی بە ئەرکی سەرشانی خۆمان دەزانین. پاش ئەوە نوێنەری سەلیم پاشا گەڕایەوەو لەناوەرۆکی وەلامی فەرمانڕەوای ئەردەلان گەیشت کارەکەی لە والیی بەغدا ڕاگەیاندو داوای چارەسەری لێ کرد. والیی بەغدایش نامەیکی بە یەکێ لە پیاوماقوولانی بەغدادا نارد بۆ کن حەسەن عەلی خان و ڕای گەیاندێ کە ویلایەتی بابان بەشێکە لە قەلەمڕەوی دەولەتی عوسمانیو دانان و لابردنی پاشایانی بابان بە دەست سولتان و والییەکانی عوسمانییەو لەم بارەوە سلێمان پاشا دژمنی ئیمەیەو سەلیم پاشا ئیمە خۆمان داممان ناوە. وەکو زانیومانە سلێمان پاشا بە ناوی دۆستایەتیو دراوسێتییەوە نامەی بۆ ناردوون، یارمەتیو کۆمەگی بدەن، بەلام یارمەتیدان و کۆمەگ کردنی لایەك و ڕووووەرگێران لە لایەکەیتر و بە کەم زانینی ڕاوەستێنن، تا دلێنابین کە ئێوەی بەڕێزو دۆست بێ لایەنن.

بەلام هەر کارێکی بە پێچەوانەی ئەمە بکرێ، ڕێگای دژمنایەتیگرتنەو ئەوسا ناچارین پشت لە دۆستایەتی بکەین و لەشکرێکی گەورەوگران لەگەلٚ کەهیەمان دا بنێرین بۆ گومەگ و یارمەتیدانی سەلیم پاشاو فەرمانی داگیرکردنی ناوچەکەتانی بدەینێو ئیتر بە یەکجاری چاو لە دۆستایەتیو نێوان خۆشی بپۆشین. لەبەر ئەوەی خودای گەورە ڕای لەسەر تێداچوون و شکانی حەسەن عەلی خان بووو شکستی ئەم کەلە پیاوەی لە ئاوێنەی چارەنووس دا نووسیبوو، هەرگیز بە گوێی دەمڕاست و ڕیش سپییەکانی نەکرد، زۆر بە توندیی وەلام دایەوە. نوێنەری والیی بەغدایش بە ترس و لەرزەوە گەڕایەوە. والیی بەغدایش زۆر نیگەران و ناڕەحەت بوو،

فەرمانی دا، کەهیەی بە لەشکرێکەوە کە لە عەشایەری عەرەب و بەنگیچەری و حەشەم ئاغاسیی حاکمی مووسڵ و عوسمان پاشای کۆیێ و قوچ پاشای حاکمی حەریر پێك هاتبوو ناردە یارمەتیی سەلیم پاشاوو بەجێ هێنانی داگیرکردنی ناوچەی ئەردەڵان و لەناوبردنی حەسەن عەلی خانی پێ سپارد.

لەشکری فەرمان پێکراو کە بریتیبوو لە بیست هەزار کەس لە ولاتی خۆیانەوە بەرێکەوتن، خۆیان گەیاندە لەشکری سەلیم پاشای بابان و روویان کردە کوردستانی ئەردەڵان. حەسەن عەلی خانیش کە ئەم خەبەرەی بیست بە هەزار کەسەوە بەرەنگاریان بوو. سەلیم پاشا جارێکی تریش، بۆبیانووبڕین، فەرهاد ی کوری ناردبۆلای حەسەن عەلی داوای کرد دەرووی ئاشتیو نێوان خۆشی بخەنە سەرپشت و داوای دۆستایەتیی لێ کرد. حەسەن عەلی خان پاش ئەوەی فەرهادخان گەیشتە سنەو نامەکەی راگەیاندێ، پیاوماقوولان و گەورەو مەزنانی سنەی خرکردەوەو لەم بارەوە داوای راوتەگبیری لێ کردن. مەلا مستەفای شێخ الاسلام و ئیبراهیم بەگی وەکیل وایان بە چاك زانی هەمیشە دۆست بن و نێوانیان خۆش بێو ئاشت بن و گوتی: ئەم دوو کەسە هەرگیز دەست لە دەوڵەتی عوسمانی بەرنادەن و بەرژەوەندی ئێمەیش لەوەدایە کە هەرگیز رێورەسمی هاوسێتیو دۆستایەتی نەشێوێنین و لەم رووەوە وا چاکە هەمیشە بێ لایەن بین. هەرچی عەبدوڵڵا سوڵتانی بەراز بوو کە زاوای حەسەن عەلی خان بوو، لەگەڵ حوسەین ناوێکدا بەم شێوەیە بیریان دەکردەوە: مادامێکی سلێمان پاشا لە دەوڵەتی عوسمانی رووی وەرگێراوەو پەنای وەبەر والیی کوردستان بردووە، کارێکی زۆر نەنگە بۆ ئەم بنەماڵەیە، ئەو پیاوە نائومێد بکرێو

لەگەڵ دژمنەکەیدا دۆستایەتی بگرێ . خان لەشکرێکی گەورەوگرانی هەیەو نابێ گوێ بە چاووڕاوو بانگەشە بداو بۆیارمەتیو کۆمەگە کردنی سلێمان پاشا دەبێ درێغی نەکا .

خوسرەوخانی کوڕی خان ئەحمەد خان و جەعفەر سوڵتان و سەرلەبەری ناودارانی کوردستان ڕای ئیبراهیم بەگ و مەلا مستەفایان پێ پەسند بووو قسەکانی ئەمانیان بە ڕاست تر زانی . حەسەن عەلی خان لەبەر لووت بەرزیی خۆی ، وێڕای ئەوەی کە لە سەرەتای حوکمڕانییەوەی سەلیم پاشا وەك لەمەوپێش باسمان کرد ، لە سوپای ئیبراهیم شادا بووو بیووبە هۆی بەتەختی فەرمانڕەوایی گیاندنی ، ئامۆژگاریەکەی عەبدوڵڵا سوڵتانی بە ڕاست زانیو وەڵامی فەرهاد خانی دایەوەو بڕیاری دا هەڵکوتێتە سەر دژمن .

هەڵبەست

گفتم که خطا کردی و تدبیر نه این بود
گفت چه توان کرد که تقدیر چنین بود
گوتم هەڵەت کردو تەگبیر ئەمە نەبوو
گوتت چ دەتوانرێ بکرێ کە چارەنووس وا بوو .

سەلیم پاشا پاش گەیشتنی کوڕەکەیو بیستنەوەی ئەو هەواڵە لەگەڵ سەرانی سوپاو پاشاکان دا ڕوویان کردە مەریوان . لەولاوە حەسەن عەلی خانیش لەتەك محەمەد ئەمین خانی گەڕووسیدا بەرەو مەیدانی شەڕ جمین . لە کەنار دەشتی مەریوان هەردوو لەشکر تێك گیران و ئازاو دلێرانی هەردوو لا هێرشی مەردانەی خۆیان بردە سەر یەکتر . لە

چریسکەی نووکە نێزەیان گوناى شێران وەك زەعفەران هەلگەرابوو و لە پرشنگی تێنی شێران زراوی زۆرداران بوو بە ئاوولە بریقەی شمشێری ئازاو بەجەرگەکان جگەری مەریخ بوو بە کەباب، لە گزنگی رۆژەوە تا زەردەپەر ئاگری شەر هەر لە گر و بڵێسەساندنداببوو و هالاوی ئەم شەرە خەرمان سووتێنی گیانی دلێران بوو. سەرەنجام ئالای توان و دەسەلاتی ئەردەلانی یەکان کەچ بووو بە ناخوایشت هەلاتن و سلێمان پاشایش کە مایەی ئەم ئاژاوەیە بوو لەگەل چەند دەست و پێوەندێکی دا ناچار بۆی دەرچوون. حەسەن عەلی خانیش لەمانگی رەمەزانی پیرۆزی سالی ١١٦١ی ك دا لە کردەوەکانی پەشیمان بۆوەو گەیشتە سنە. هەر لەو کاتەدا کە بۆسنە هات، کەهیە لەگەل پاشاکانی دیکەدا دوای کەوتن و ئەویش کە بیستی بەرەو ناوچەی لێلاخ هەلات. پاشاکانیش لە کەمێز[٥٠] هەلویستێکیان بۆ کردو لەشکرەکەشیان هەلیان کوتایە سەر ئەو ولاتەو بە جاری تالانیان کردو بەوپەری بێ بەزەیی یەوە شالاوی زۆرداری و ستەمیان بردە سەر موسولمانان و ئەرمەنی و[٥١] جوولەکەو هاوەی سیازدە رۆژی رەبەق ئەم مەینەتی و چەرمەسەری یە درێژەی کێشاو مال و سامانی زوربەی خەلکی کوردستان سەرلەبەر بە تالان و برۆچووو بەشی زۆری بنەمالە دەسرۆو دەولەمەندەکانی ولات مال و مندالی خۆیان بو سلێمانی و کۆیەو حەریر نارد. پاشی ماوەیێك خۆشیان وردە وردە گەرانەوە بۆ ولاتی خۆیان. حەسەن عەلی خان پاش گەرانەوەی پاشا، خۆشی گەرایەوە بۆ شاری سنەو بە کۆمەگی خوسرە بەگە و میهر عەلی سولتان و نەجەف قولی بەگە کە لە گەورە پیاوانی کوردستان بوون کەوتنە بیر و تەلاشەوە بۆ ئاواکردنەوەی ولات. کاتێ حەسەن عەلی خان لەگەل لەشکری بابان و

رۆم دا له جەنگـەی شەڕدا بوو ئیبـراهیم بەگی وەکیـل پشتی له وەلی نیعمەتـەکـەی کردو له دژی ڕاوەستاو له لەشکرەکەی پچڕاو بووە هۆی شکـان و هەڵاتنی لەشکـری حەسـەن عەلی خان و پێوەنـدیی لەگەڵ دژمنـەکـانی گرت . کاتێ لەشکـری بابان ئەردەڵانی گرت ، ئەویش له تەکیاندا گەڕایەوە بۆ ئەیالەت و لەوێوە رووی کردە ناوچەی ڕەاونسەر و دێهاتی ئەو ناوچەیەو له دێی ئەڵەك قەڵایێکی قایمی ڕۆناو ئەوێی کردە حەشـارگـەی خۆی و پاڵنگان و بیلاوەریشی خستە ژێر دەستی خۆیەوەو ئاڵای سەرکێشی و یاخی بوونی هەڵکردو دەرووی سپلەیی و نان کوێریی خستـە سەرگـازی پشت و ئەوانـەی له ئاشـووبـەی بابانـەکـان دا له کوردستـان هەڵاتبـوون و ماڵ و سامـانیـان شاردبـۆوە ، لەتـەکی دا ڕێـك کەوتن و یەکیـان گرت ، تا ئەوەی ، بە ڕای کەریم خان و شێخ عەلی خانی زەند ، دەرفەتیان هێناو لەگەڵ تیرەو هۆزەکانی خۆیان و عەشـایـەری کرمـاشـان و زەنگەنەدا کە بیست هەزار کەسێ دەبوون له سواران به نیـازی تۆڵـەسەندن ، ڕوویان کردە ئەردەڵان و بریاریادن دا داری به سەر بەردیـەوە نەیـەڵـن . حەسـەن عەلی خان به بیستنی ئەم خەبەرە زۆر زیزو دڵ زویر بوو ، چونکە توانی بەربەرەکانیی له خۆی دا نەدەبینیی و کاروباری له ڕەنگ و بۆ کەوتبوو و بە جارێ شیرازەی هەموو شتێ تێك چووبوو و چارەسەری لەوەدا بەدی دەکرد تازووە دەمراست و ردێن سپی یەکان ڕاوێژێکی بۆ بکەن . پاشر وتوویژ و ڕاوێژ و لیکۆڵینەوە نیوەدیر :

## دانیشتن و گوتیان و هەڵستان

مەسڵەحـەتی کاریـان لەوەدا بینی ، خەڵـکـەکـە سەرلەبەر بە هەژارو

دەستەوسان و چاك و خراپەوە لەخزمەت قوتبی عاریفین شێخ محەمەدی وەسیمدا بۆ هەورامان کۆچ بکەن و خویشی لەوێ بمینێتەوە بەرەنگاری دژمن بێ. سەرەنجام مەلا مستەفای شێخ الاسلام لەگەڵ نەجەف قولی بەگ دا چوون بۆ لەشکرگاکەی کەریم خان و پەرێشانیی بارودۆخی کوردستانیان بۆ روون کردەوەو باسی دەسدرێژی و تالان وبڕۆی خەڵکی کوردستان لە لایەن بابسان و رۆمەوە بە دوورودرێژی تێ گەیاندو نێوانیان چاك کردن و ئاشتی و دۆستایەتی و نێوان کوکی یان خستە نێوانیانەوەو بریاریان دا خوشکی حەسەن عەلی خان بدرێ بە کەریم خان، تا دژایەتی و دژمنایەتی بە خزمایەتی و دۆستایەتی بشکێتەوەو ژێردەستەو هەژاران لە مەینەتیی لەشکرکێشی ئاسودە بین و ئەگەر هات و هەردوو لا بە مەسڵەحەتیان زانی، ئەوە لەم سەرێشەوە خوشکی کەریم خان بدرێ بە حەسەن عەلی خان و بەمە ئاشتی و دۆستایەتی و نێوان تەبایی ریشە داکوتێ و بن چەسپ بێ. پاش راوێژکردن شێخ محەمەد وەسیم لەگەڵ خەڵکی تردا چوو بۆ هەورامان و نەجەف قولی بەگ بەرەو سوپای کەریم خان دای کێشا.

پاشان ، دوای ئەم داوبەزمە حەسەن عەلی خان ، یەکسەر، ماڵ و سامانی خۆی پێچایەوەو رووی کردە قەڵای قەرەتوورە. قەڵای قەرەتوورە قەڵایەکی سەخت و قایم و دژواربوو: لەوێ لیی دانیشت چاوەڕێی وەرام بوو. کاتێ گەورەپیاوان بە خزمەت کەریم خان گەیشتن و داوای رێك کەوتنیان کرد ئەویش پێش دەستی خۆی کردو سەربەندی قسەی خستە دەست خۆی، گوتی، دۆستایەتی و خزم و خوێشایەتی ئێمە لەگەڵ ئودا زۆر کەونەو هی ئەمڕۆ و دوێنێ نی یەو

خۆشەویستی و دۆستایەتیی ئەم دوو بنەماڵە بە ڕاستەقانی‌یەو لە ناو تەهی دڵەوەیەو سوبحان ویردی خان خۆی بە خزمایەتی دەمان گاتێ و ئیتر پێویستمان بە سەرلەنوێ خزمایەتی دەمەزەردکردنەوە نی‌یەوهەر چۆنێ بێ بینینی ئەیالەتی خاڵۆزەکەمان ئەرکی سەر شانمانەو دەبێ جلەو بەرەو ئەوێ شۆرکەین و هیممەتێ بۆ ڕێك خستنەوەی کاروباری ئەوێ بنوێنین. نوێنەرانی حەسەن عەلی خان داستانی ڕووداوەکە چۆن ڕووی دابوو، بە گوێرەی قبەی قاسیدە زمان لووسەکە، گەباندیانە جێگای خۆی و هەر ئەو ڕۆژە خەبەریان بە حەسەن عەلی خان دا کە زۆر نابا، هاکا کەریم خان پەیدابوو. حەسەن عەلی خان هەرکە ئەم خەبەرەی بیست، هەڵات بۆ قەڵای قەرەتورە، لەوێ خۆی شاردەوە.
هەر بۆ سبەینێ، ئەو ڕۆژە کەریم خانیش بەو قرچەی گەرمای تەمووزە گەیشتە شاری سنەو دەست کرا بە چەپاودانی سەرەوەت و سامانی ئەو موسوڵمان و جوولەکەو گاورانەی لەناو شار مابوونەوە. سلێمان پاشای بابانیش کە لە لەشکری سەلیم پاشای بابان و تورکەکان هەڵاتبوەو لە چیاو سەنگلاخەکانی پاڵنگان سەرلێ‌شێواوو سەرگەردان دەگەرا، هەرکە هەواڵی ڕۆیشتنی کەریم خانی بۆ ئەوردەڵان بیست یەکسەر هات بۆ سنەو خۆی گەباندە لەشکرەکەی. کەریم خان کە گەیشتە شار مزگەوتی گەورەی کرد بە بارەگای خۆی و مزگەوت و فێرگەکانی دیکەی هەموو کرد بە لەشکرگاو تەویلەی وڵاخەکانی. خزم و خوێشانی سوبحان ویردی خان کە لەبەر دەسکورتی و بێ دەرەتانی لەناو شاردا مابوونەوە، ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆردران. ئەو تەخت و سامانەشیان کە هەبوو، ئەویشیان بەجێ هێشت و کەرکول و بارسووك بۆی دەرچوون و خۆیان شاردەوە.

خوســـرەوخـانی کوری خان ئەحمـەد خانیش بە هیـوای ئەوەبـوو، رۆژێ بێ کاروباری ناوچەی کوردستان و ئەردەلانی پێ بسپێردری . کاتێ لەلایـەن کەریم خانـەوەو لە سەر داوای شێخ محەمەدی وەسیم و خەڵکی سنـە چوو بۆ ناوچـەی هەورامـان ، ئەمەی بەهەل زانیو وای لە قەڵەم دا کە هۆی رزگاربوونیەنیو بەو نیازەوە پشتی لە کەریم خان کردو لەوێ مایەوە .

هەروەهـا لە لایـەکی دیکـەوە خەڵـك و خواییکی رێـك وپێکی بو دڵ راکـێشـانی حەســەن عەلی خان بەری کـرد ، بەلام هیچی لەمــە وەگیـرنـەکـەوت و خەڵکەکە بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە . لەپاشان کەریم خان شێخ عەلی خانی لەتەك لەشکریکی گەورەوگران دا بۆ داگیرکردنی قەڵای قەرەتـوورە بەری خست ، بەلام لەبـەر ئەوەی قەڵاکە ئازووخەی چاکی پێ دەگەیشت و حەسەن عەلی خان لەگەڵ سێ صەت کەس دا لە پیـاومـاقـوولان خۆیان لە قەڵاکەدا حەشاردابوو و ئامادەی شەڕبوون ، تۆپ و تفـەنگی لەشکـری کەریم خان هیـچ کاریکی تێ نـەکـردن و لە ئاکـام دا بێ ئەوەی هیـچ سەرکەوتنیکیان دەسگیر بێ ، ناچار بەرەو پاش گەڕانـەوە . ئەو هیـزەیش کە گرتنی ناوچـەی هەورامان و شێخ وەسیم و خەڵکی سنـەی لە ئەستـۆ خرابـوو ، بێ هیـچ سەرکـەوتنێ هەلات و بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە . بە بیستنی ئەم هەواڵە ئاگری توورەیی کەریم خان بڵێسەی سەندو زۆربەی خانووبەرەو کۆشك و تەلارو مزگەوت و فێـرگـەکـان بەر شالاوی ئاگری ئەو توورەیی یە کەوتن و لەگەڵ زەوی دا تەخت بوون . پاشـان بەرەو گەرووس دای کێشـاو هەڵی کردە سەرماڵی محـەمـەد ئەمین خانی فەرمـانـرەوای ئەو ناوچەیەو بە خەڵکی بێچارەوە هەمـوویـانی تالان کردو چەنـد ژن و کچێکیشی لێ بە دیل گرتن .

خورشیده خانمی کچی محەمەد ئەمین خانی بە زۆر لە خۆی مارە کردو تا توانی باوکیشی فەلاقـە کرد. پاشـان گرتیو لەگـەڵ سلێمـان پاشـای بابان دا بردی بۆ عیراق،

حەســەن عەلــی خان پاش ڕۆیــشــتـنـی کەریـم خان، لە قەڵای قەرەتـووره هاتـەدەرو هات گەیشتـە سنـە. چون خەڵکی ناوچـەکـەی بەوپــەڕی پەرێشــانیــەوه دیت، پێ سیٚ‌ودوو دەستی دۆستـایـەتیو مل کەچیـی بۆ ئازاد خانی ئەفغــانی کە لەو سەرو بــەنــدەدا بەســەر ئازربـایجان رادەگەیشت، درێژکردو هەر لەو سەردەمەدا سەلیم پاشای بابــان بە هەزار کەسیکــەوه خۆی گەیــانــدە دەربــاری ئازادخـان و دیـاریـەکی زۆری پێشکێش کردو داوای فەرمـانرەوایی ئەردەلانی لێ کرد. ئازاد خانیش بەرانبــەر بەو دیـاریـە زۆرەو نیـازپیسی چاوی لە هەموو ڕێورەسمی گەورەییو ویژدان پۆشیو حسەن عەلی خانی، کە بە نیـازی دەستکـەوتنی فەرمـانـرەوایی ئاوەدان کردنـەوەی ناوچـەکەوه رووی لێ‌نابوو، گرت و بە دەست بەستراوی دای بە دەست سەلیم پاشاوە.

سەلیم پاشـا کە فەرمـانـرەوایی ویلایەتی بابانیشی بەدەستەوه بوو، حەســەن عەلی خانی ڕەوانـەی قەڵاچـوالان کردو لەوێ بەوپەڕی ڕیزو دڵ ڕاگرییەوه خرایە ژێر چاویرییەوه. تەنانەت هەر کاوێ ئارەزووی ڕاوی کردبا، بەوپەڕی سەربــەستیـیـەوه ڕاووشکـاری خۆی دەکـردو دەگـەرا. پاشـان لە ئاکـامی دوورمـانیو بۆتێ‌چـاندنو لێ‌خوێندنی بەرەی بابــان، پاش حەوت مانگی خشت، بە دەست بەســەری لە قەڵاچوالانلە سالی ١١٦٤ی ك دا بەدەستی سەلیم پاشا کوژرا.

پاش ئەو ڕووداوە سەلیم پاشا بە سەربەخۆیی فەرمانڕەوایی بابان و شارەزوورو ئەردەڵانی گرتە دەست. بە پێی کتێبەکەی خوسرەو بەگ، پاش ڕاگە یشتنی سەلیم پاشا بەسەر ناوچەی ئەردەڵان، خالید پاشای بابان دەستەوداوێنی وەزیری بەغدا بوو، داوا لە دەرباری سوڵتانی عوسمانی بکا فرمانڕەوایی بابانی بدرێتیو سەلیم پاشایش بۆ بەربەست کردنی ئەم کارە ڕووی لە ئازاد خانی ئەفغانی ناو داوای کۆمەگی لێکرد. هەر لەم سەروبەندەدا بوو، کە کەریم خانی زەند هەڵی وەدەست هێناو هەڵیکردە سەر ئەیالەتی کوردستان و شاری سنەی وێران و خاپوورکردو داری بەسەر بەردوو یەوە نەهێشت. ئیتر خەڵکی سنە کەریم خانی برای حەسەن عەلی خانیان بە فەرمانڕەوای خۆیان هەڵ بژاردو سەلیم پاشایان دەرپەڕاند. بەڵام بە پێی کتێبەکەی مەلامحەممەد شەریفی قازی وا بەدەردەکەوێ کە دوای ئەوەی سەلیم پاشا لە فەرمانڕەوایی بابان خراوە، سلێمان پاشا سەرلەنوێ بووەتەوە بە فەرمانڕەوا.

سلێمان پاشاش لە پاداشتی ئەو پیاوەتی‌یەی حەسەن عەلی خان لەگەڵی کردبووی‌و خۆی لەسەر بەکوشت دابوو داوای لە ئەمرخانی ئۆزبەگ کرد کە ئەوسا ئالای سەرکێشیی هەڵکردبوو، کەریم خانی برای بکا بە فەرمانڕەوای کوردستان. هەروەها نووسیویشیە کە سوبحان وێردی خان لە ساڵی ١١٦٤ی ک دا بە فەرمانی ئازادخان کرا بە حوکمڕانی کوردستان و جارێکی تر لەنوێژەنەوە کەریم خانیان کردەوە بە فەرمان ڕەوا. بەڵام چون مردنی سوبحان وێردی خانیان ساڵی ١١٤٧ی ک ی نووسیرە ئەمە لە ئەقڵ بەدەرە.

# فەرمانڕەوایی کەریم خانی
# کوڕی عەباسی تولیخان

کاتێ کەریم خان چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی هەناسەی وردو درشتی خەڵکەکەی چنی‌و بە هاتنی شووم و بەدوومی سەرلەبەری خەڵکی کوردستان دڵگیرو پەست بوون. ئەم فری لە فەرمانڕەوایی نەدەزانی‌و سەری لە هیچ کاروبارێکی حوکمرانی دەرنەدەکرد. وڵاتەکە بۆ بوونەی نەکارەیی‌و دەست و پل سپێتی‌و ناکارامەیی‌یەوەی بە جارێ شێواو شیرازەی هەموو شتێ تێك چووو کاروبار ڕووی لە کزی‌و لەڕو لاوازی کرد. کابرا هێند ملهوڕ بوو گوێی لە قسەو راوێژی کەس نەدەگرت. ئاژاوەو پاشاگەردانی لە سەروبەندی ئەم فەرمانڕەوایەدا بە ئەندازەیەك گەیشتبوو، وەك دەگێڕنەوە:

یەکێ لەسەر بە گەورەکانی ویلایەت بۆ دزی دەچێ، خۆی دەکوتێتەماڵێکەوە، بە ڕێکەوت، خاوەن ماڵ بە خەبەر دەبێ، ناکاتە نامەردی دەی‌گرێ‌و بۆ سبەینێ زوو، بە دەست بەستراوی بۆکن کەریم خانی دەبا. کەچی کەریم خان لە جیاتیی ئەوەی سزای دزە بدا، وردوبارێك هەردوو گوێی دەبڕێ‌و لەنێو مستی دەنێ‌و بەرەڵلای دەکا.

هەروەك لە بەرایی یەوە باسمان کرد لەو سەروەختەدا حەسەن عەلی خان و سەلیم باشا بەگژ یەکدا چووبوون، ئیبراهیم بەگی وەکیلیش لە ناوچەی پالنگان و بیلوان و ئەو دەوروبەرە، ئالای سەربەخۆیی هەلْ کردبوو. هەرکە زانی ولات بیْ خاوەنە و خەلْکەکەیش لەو پەڕی زەبوونی و پەریْشانی دان و ئەمیش لەگەلْ خانەدانی زەندی یەدا سەروساخت و بەندوباریْکی بە هیْزی هەبوو، داوای لیْ کردن، کەریم خانی فەرمانڕەوای ئەردلان لابدەن و ناوچەی کوردستان لەبەر یەك هەلْتەکیْنن. زەندی یەش یارویس خانی بەصەت سوارەوە خستە پالْ هیْزەکەی ئیبراهیم بەگ کە ئەمیش دوو صەت سواری دەبوو، ئەم هیْزە لە سەرەتای چلەی زستان دا، لەدیْی دوشان دامەزران. کەریم خانی ئەردەلانیش کە ئەم خەبەرەی بیست، بە خۆی ڕانەپەڕموو، بەرانبەر ئەم هیْزە ڕاوەستیْ. سەرماو سولْەی زستانەکەیش لە وزە بەدەربوو، ناچار لەگەلْ گەورەو پیاوماقوولانی سنەدا کۆچیان کردو چوونە ناوچەی شامیان کە سەر بە هەریْمی هەورامانە، لەویْ نیشتەجیْ بوون. کەریم خان و گەورەپیاوەکان سیْمانگەی زستانیان لەویْ بەوپەڕی ناخۆشی و تەنگانەوە بەسەربرد. لە سەرەتای بەهاردا ڕوویان کردە شارەزوورو سەریان بۆ پاشای شارەزوور دانەواندو مل کەچی بوون. وەك دەلْیْن: کەریم خان هەر لەو سالْەدا کۆچی دوایی کردووەو کوردستانی ئەردەلان بیْ فەرمانڕەوا ماوەتەوە. تا ئەو کاتەی خوسرە خانی کوڕی خان ئەحمەد خانی کوڕی سوبحان ویْردی خان لە سالْی ١١٦٥ ی ك دا سەربەخۆ ئازاد، کاروباری ئەیالەتەکەی بە دەستەوە گرت و خۆی کرد بە فەرمانڕەوای ولات. بۆ ماوەی سالْیْ دەستی یارمەتی و نوازشتی بۆ ژیْردەستان و دەستەوسانان ڕاکیْشاو بەم

جۆره کاتی بەسەربرد، بەڵام لە ساڵی ۱۱٦۰ی ك دا سەلیم پاشای بابان بە یارمەتیی ئازادخانی ئەفغانی بوو بە میری کوردستان و خوسرەوخانی لەم میراتییە بەرکەنار کرد.

لە سەروەختی فەرمانڕەوایی سەلیم پاشادا زۆربەی گەورەکانی سنە چۆن لە مەڵبەندی بابان جێنشین بوون ئەوانەی سنەیش مابوونەوە لە پیاوماقووڵ و رەمەکی، هەموو لە رەفتاری چاك و پەسندی سەلیم پاشا شادمان بوون و ئەیالەتەکە بەرە بەرە رووی لە ئاوابوونەوەو بووژانەوە کردو سەرتۆپی خەڵکەیشی بە دڵی خۆشەوە خەریکی کشتوکاڵ و شارئاواکردنەوەبوون. ئیتر بەم جۆرە سەلیم پاشا بۆ ماوەی چوار ساڵ لە ناوچەی کوردستانی سنە فەرمانڕەوایی خۆی بەڕێوەبرد، تا ئەوەی لە ساڵی ۱۱۷۰ی ك دا خوسرەو خان بە یارمەتیی حەسەن خانی قاجار میرنشینی ئەردەڵانی گرتە دەست و فەرمانڕەوایی بابانی لە ئەردەڵان لەناوبرد.

# خوسرەوخانی دووەم

خوسرەوخانی دووەم کوڕی خوالێخۆشبوو خان ئەحمەد خان و ئەوەی خوالێخۆشبوو سوبحان وێردی خانە. وێرای ئەوەی سوبحان وێردی خان منداڵی نێرینەی زۆروزەوەند بوون.[٥٢] و لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا، کە پێشتر لێی دواین، خان ئەحمەد خانی کوڕی وڵاتی بەجێهێشت و لە وڵاتی ڕۆم گیرسایەوەو لە دراوسێتی ئیمامە پاکەکان دا بۆ خۆی سەری نایەوەو دوو کوڕی لەپاش بەجێمان: یەکەمیان خوسرەو خان و دووەمیان ڕەزاقولیخان. سوبحان وێردی خان خوسرەو خانی کوڕی، کە کوڕە گەورەی بوو، هێندەی ڕۆحی خۆی خۆش دەویست. هەمیشە ژەنگ وپەلاسی خەم و پەژارەی ئاوێنەی دڵی بە دیمانەی ئەو ناودارە دەسڕیەوەو ئەوی لە چاو کوڕەکانی دیکەیدا لە سەرووی هەموانەوە ڕادەگرت و لە ڕێوڕەسمی گەورەیی و نیهادپاکیدا هەمیشە پەسنی دەداو بە باڵای هەڵ دەگوت. زۆر جار لە بەرەوڕووی کوڕەکانی دیکەیدا بە پیاوەگەورەکانی مەجلیسەکەی دەگوت، ئەم پلەوپایەیە پاش ئێمە، هەر شایانی کارامەیی و توان و ئەدەبی ئەوەو هەر خۆی دەبێ بەخاوەنی. بە هەر حاڵ، چون لە ساڵی ١١٧٠ی ك دا خوسرەو خانی کوڕی ئەحمەد خان بوو بە فەرمانڕەوا دەرووی ئاژاوە وئاشوویی لە ڕووی ئاژاو گێران

بەست و گولاڵـەی ئیقبـاڵی لە هەوری پڕ بارانی بەخشندەیی لە چیمەنی ئالرمز ووو هەویـادا ڕ ووا و پژاو ئەیـالـەت ڕەنـگ و ڕەونـەقێکی نوێی بە خۆیـەوە گرت و تەڕ و پاراوی‌یـەکی لەڕادەبەدەری لێ نیشت و گوڵشەنی هیوا لە شنەی دادپەروەری سەوز و پڕاو بوو و خونچەی هەویاو ئاوات بە بۆن وبەرامەی دەهندەیی شادمان و خەندان بوو.

جیهانی سەرلەنوێ ڕازاندەوە
غەمزەی خستە گۆنای ولاتەوە
لەفەڕ و بەرەکەتی ئەو گوڵی شادی ڕ ووا
مزگێنیی جوانیو لاوێتی بە پیران درا
بەزیندوو کردنەوەی ئایینی ڕوون
هەناسەی بوو بە هەناسەی عیسا
لە خانەی بەخشندەییی‌دا حاتەم بەرماوخۆرە
لە مەیدانی ئازایەتیی‌دا ڕۆستەم هاوسەنگەریە
لەسەر و بەندی ئەودا زۆروستەم تاسەواری نەما
بەو تازە بۆوە ڕێ‌ورەسمی خوسرەو و جەم

خەڵکی ولات بە فەڕی هاتنی شادو دڵخـۆش بوون و بەگـەورەیی بوونی پیـروزی مەجبووری گوێ‌بەفەرمانی‌بوون. سەرلەبەر لە تەپڵی شادی‌یـان داو گەردنـی مژدەیـان قوت کردەوەو ڕێـگـای (پیـر) و (مرید)ی‌یان گرتەبەر و شێوەی ڕێ‌ورەسمی باوو باپیرانیان بەیادکردەوەو ڕێگـای خۆبـەخت کردنیان لەپێناودا گرتەبەر و ئەو بنەماڵانەی لە ولات دوورکەوتبوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی فەرمانڕەوایێکی زەبردەست و توانـا بوون، هەمـوو گەڕانـەوە بو ولاتی خویـان. لەسـای بەزەی خوسـرەوی بارام ئاسـاوە گشت حەسـانـەوەو کەوتنـە ئاواکـردنـەوەی

خانــووبــەرەو ماڵ و موڵــك و كێــڵگــەو باخــاتیــان و بە تەواوی سەرناسوودەبوون و شادوشوکور ژیان.
لەبەر ئەوەی شاری سنە چەنانی بە هۆی ئاژاوەوە ویران ببووو لە رەونەق کەوتبوو، خوسرەوی سەربەست و ئازاد بەرژەوەندی لەوەدا دیت، قەڵای حەسەن ئاباد بە مەرکەزی ئەیالەتەکەی هەڵوژێری، بۆ ئەوەی بتوانێ وڵاتەکەی ئاوا کاتەوە. خەڵکی کوردستانی ئەردەڵان کە دیتیان ئەم خوسرەوە بۆ ئاواکردنەوەی وڵات سەری پێوە نی‌یەو زۆری بۆ تێ‌دەکۆشێ و رەنجێکی فرە بە خەرج دەداو زۆری بە تەنگــەوەیــە، سەرلەبەر کەمەری گوێ بەفەرمانی‌یان بۆ بەست و بە دڵ و گیانەوە خۆیان لە پێناودا بۆ خۆبەخت کردن ئامادەکرد. جگە لە محەمەدرەشید بەگی وەکیل کە دوای شکانی حەسەن عەلی خان، کە لە ناوچەی پالنگان و ئەڵەك و رەوانسەر سەربەخۆ فەرمانرەوایی دەکردو لەسەردەمی سەلیم پاشادا کوژرا، محەمەد بەگی کوری جێگای گرتەوە. کاتێ کە خوسرەوخان ئەیالەتی ئەردەڵانی بە دەستەوە گرت، دژی راوەستاو گوێی‌نەدا بە فەرمانی میهر عەلی سوڵتان و خوسرەو بەگی ئامۆزایشی لە شاری سنە. خوسرەوخانی دووەم کەوتە راوێژکردن لەگەڵ خەڵکدا. دوای وتوویژو راوێژ وایان بە چاك زانی دوو کەس لە سەرۆکەکانی ئەو بنەماڵەیە کە مایەی ئاشووب بوون لەناو ببرێن بۆ ئەوەی کاری هەمــوو لایــەك سەقــام گیــر بێ‌و سەرپێچی کەرەکــان مل کەچ کەن. بەم بریارە رۆژێ کە میهر عەلی سوڵتان وەك جاران بۆ ئیسپاتی وجود هاتبوو، فەرمانی گرتنی بە پێش قەراوڵەکانی دابووو بە فەرمانی خوسرەو خان بەند کرا. پاش گرفتاریی میهر عەلی سوڵتان برێ کەس بۆ گرتنی خوسرەو بەگی برایشی راسپێردران. خوسرەو بەگە

هێنـــد لە خۆی بایی بوو، خۆی بە ڕۆستـــەمی دەزانیو گوێی بە قەزا نەدەدا. پاش شەڕوشـۆڕی سەریـان پەڕاندو کوشتیان. دوای کوشتنی ئەو، فەرمـانی کوشتنی میهـر عەلی سولتانیشیان دەرکرد. ئیتر بەم جۆرە هەردووکیـــان بە سزای کردەوەی خۆیـــان گەیین ومـــاڵ و سامـــانیـــان سەرلـەبـەر کەوتـە دەست خوسرەوخانی دووەم. هەر لەم سەروبەندەدا ئازاد خانی ئەفغـــانی بە دوورزمـــانیی سلێمـان پاشـای بابـان کە هۆزو پەیـرەوانی لە دەوروبـەری سنە بەر شاڵاوی دەسدرێژیی خوسرەوخان کەوتبوون، بڕیاری دا سنەو قەڵای حەسەن ئاباد بگرێ. بە دوو هەزار کەسەوەڕووی کردە سنە. محەمەد ڕەشید بەگی وەکیلیش هەلی وەدەست هێناو خۆی گەیاندێ. خوسرەو خان دووای بیستنی ئەم خەبەرە سنەی بەجێ‌هێشت و ڕووی کردە قەڵای‌حـــەســـەن ئابـــاد. ئازاد خانیش لە داوێنی قەڵاکەدا لەشکری خۆی دامەزراندو چەند جارێ تێك گیران. خوسـرەوخـان بە سەر لەشکـری ئەفغـان دا زاڵ بووو محـەمەد ڕەشید بەگی وەکیـل و محـەمـەدسالح بەگە کە لە هاودەستانی ئازاد خان بوون زۆر بە جەختەوە هەوڵیان دەدا لەشکری خوسرەو خان بشکێنن. لەبەر ئەمـــە، هەر دووای هەڵاتنی ئازاد خان محـــەمـــەد سالـــح بەگە گیـراو خوسرەو خان فەرمانی دا، هەردوو چاوی هەڵ کۆڵن و بە سزای خۆی گەیشت.

ئەوەی شایـانی باسە، لەبەر ئەوەی گەمارۆدانەکە چل ڕۆژی خشتی خایـانـد، خوسـرەو خان هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ داوای یارمەتی لە شێخ عەلی خانی زەند بکا کە لە هەمەدان هەڵوێستی کردبوو. ئەویش بە لەشکـرەکـەیـەوە بە نیـازی شەڕ، ڕوویکردە سنە، بەڵام ئازاد خان هەرکـە ئەم هەواڵـەی بیست، ناچـار هەڵات و دەستی لە گرتنی قەڵاکە

هەڵ گرت. شێـخ عەلـی خانـیش دووی کـەوت. پاش هەلاتـنـی ئەفغـانی‌یـەکـان، هەرچی ماڵ و سامـانی سلێمـان پاشا هەبـوو، سەرلەبەری تالان کردو لە مەراغەوە گەڕایەوە بۆ هەمەدان.

دەگێـڕنـەوە: لە کاتی گەمـارۆدانـەکـەدا، هەموو ڕۆژێ سواری لە ئەفغـانی‌یـەکـان دەهـاتە بەرمەیدان و داوای جەنگاوەری دەکرد. هەر کەسێـکـی لە قەلاوە دەهـاتـە بەرپیـل بەشێـری ئاوداری، مەرگی پێ دەنـوشی و دەی کـوشت. تا ڕۆژێ محەمەد ئاغای جلەوداری تایبەتی خوسـرەو خان کە باپیـری ڕۆستـەم بەگی میرئاخورە، دەماری پیاوەتیی بزووت و چەك و سیلا حێکی لە تەویلەی موبارەکەدا بوو، لە خۆی داو سواری ئەسپـی تایبـەتی والـی بووو هەڵی کـردە سەر جەنگـاوەرە ئەفغـانی‌یـەکـە. هاوار لە قەلای‌یـەکـانـەوە هەڵستـابـوو کە محەمەدی جلەودار بە ئەسپ و ئەسلەحـەی خوسـرەوی ناودارەوە پشتی لە ئاغـای خۆی کردووەو لێی یاغی‌بـووە. ئەو شێـرە ئازایە هاتە مەیدانی ئەو شێرە ئەفغـانی‌یـەوەو تێغی ئازایـەتی لە کێـلان دەرکێشاو لە یەکەم هەڵمەت دا سەری پڕ لە فیـز وفیشـالی لەلـەشی جیـاکـردەوەو بەرەو قەلا گەڕایەوە، سەری دژمنی لەبـەر پێی خوسـرەوخـان دا دانا. پاش ئافەرین کران بە خەلاتی پایـەی میرئاخوریتی سەربلێندکراو لەو سەردەمەوە، تا ئێستاکە دەوڵـەتی ڕەزاقـولیخانی کوڕی خوسرەو خانی کوڕی ئەمانوللا خانی کوڕی خوسـرەوخـانی دووەمی تێـدایـە، ماوەی ۹۸ سالـە ئەم پایـەی میراخوری‌یە لە بنەماڵەی ئەوان دا ماوەتەوە.

بە پێی ئەو مێـژووەی خوسـرەو بەگ دای‌ناوە وا دەردەکەوێ محەمەد ئاغا هێشتا ئەم کارەی پێ نەسپێردرابوو، کە بە فەرمانی خوسرەو خان بۆ ئۆردووی ئازادخـان ڕەوانـەکـراو بە زمـانی ئەوەوە بە ئازادخـانی گوت

خوسـرەو خان دەفـەرمـوێ ڕاوەستانت لە داوێنی ئەم چیابە بێ سوودەو لەشکرێکی گەورەیشت لەگەڵ دا بێ، هەر هەوڵ و تەقەلایەکی بیدەی بێ‌هـوودەیـەو قەلاکـەت بۆ ناگیرێ. تا گیانم تێدا مابێ داگیرکردنی ئەم قلایـە بە ئاسانی سەرناگرێو هیچ کارێکتان پێ‌ناکرێ. ئیتر لەمە زیاتر ڕەنجی خۆت بە با مەدەو ئەو موسوڵمانانەی لە خۆتت کۆکردوونەوە لەمە پتر یان تەنگاو مەکەو نارەحەتیان مەکە. گەمارۆدانی ئەم قەلایە دەبێ بە مایـەی بەدنـاوی‌و ناوزڕانـت. سەرت شۆڕکـەو ڕێـی وڵاتی خۆت بگـرەبـەر. ئەم ئاواتـەت هەرگیـز نایـەتـەدی، بگرە بۆت دەبێ بە هۆی دەردی‌سەری‌و مەینەتی.

پاش ئەم ڕووداوەو ڕاگەیاندنی پەیامەکەی خوسرەو خان، ئازاد خان زۆر تووڕە بوو، گوتی، ئەگـەر کارەکـە وابێ، قوڕ بە سەر ئازاد. ئیتـر هەر ئەوەندەی بۆ کرا، ڕاست هەلات و ڕۆیشت. دوای ئەمە خوسرەو خان شێخ عەلی خانی نارد بۆ ئاواکردنەوەی خانوو بەرەکانی هەمەدان. شێـخ عەلـی خانیش لەوێ دەغـڵ و دان و خەرج و باجێکی زۆری خرکـردەوەو ناردی بۆ کوردستـانی ئەردەڵان. جا لەبەر ئەوەی خوسرەو خان لەم سەروبـەنـدەدا لە مەرکـەزی ئەیـالـەت دوورکـەوتبـوەوە بەڕێـوەبـردنی کاروباری سنەو قەلای حەسەن ئابادی بەرەو ڕووی ڕاوتـەدبیـری میـرزا عەبـدوڵلای وەزیر، کە باپیرە گەورەی دانەری ئەم کتێبـەیـە لە دایکـەوەو یوسف بەگە کردبـۆوە. ئەم دوو زاتەیش، بە دەست باجگـرانی زەنـدی‌یـەوە بە جارێ تەنگیان پێ‌هەڵ چنرابوو. لە نیـوە شەوێکـدا ناچـار بارو بنـەیـان پێچـایـەوەو هەلاتن بۆ ناوچـەی شارەزوورو ماڵ و منـداڵی خوسـرەو خانیـان لە قەلای حەسـەن ئابـاد بەجێ هێشت. خوسـرەوخـان هەرکـە ئەم هەواڵـەی بەرگوێ کەوت بە

پەلــە گەڕایــەوە بۆ قەڵاکــەو ماڵ و منـداڵ و پەیـرەوانی خۆی هەمـوو کۆچ دان بۆ سنـە. پاشـان قەڵای حەسـەن ئابـادی، سەبارەت بەوە کە دەبوو بە مەکۆی دژمنانی لە کاتی ئاژاوەو ئاشووب دا، وێران و خاپوور کردو لەو ڕۆژەوە تا ئیمـرۆکـە هەروا خاپـوور و وێـرانـە. لەبـەر ئەوەی کەریـم خانـی زەنـد لە دژ محـەمـەد حەسـەن خانی قاجـار ئاڵای سەربەخۆیی هەڵ کردبوو و هەولی‌دەدا سەڵتەنەتی ئێرانی دەستکەوێ، هەرچـەندە تا ماوەیێك شەڕ وشۆڕ گەرم نەبوو، بەڵام ئاخری‌یەکەی کار لە کار ترازاو شەڕ لە نێـوانیـان گەرم بووو لەشکـری زەنـدی‌یـە بەسـەر لەشکری قاجاردا زاڵ بووو محەمەد حەسەن خان خۆیشی لەو شەڕەدا شەربـەتـی شەهــادەتـی نۆشی. ئیتـر بەم جۆرە کەریم خانی زەنـد فەرمانڕەوایی سەرانسەری وڵاتی ئێرانی گرتە دەست و شاری شیرازی کرد بە پێتەختی خۆی.

لەو سەردەمـەدا سلێمـان پاشـای بابـان کەوتبـووە سەر کەڵکـەڵـەی داگیـرکـردنی ئەیـالـەتی سنـەو دەی‌ویست ئەو ناوچـەیەیش بخاتە سەر قەڵـەمـرەوی حوکمـرانیی بەبـە. یەکێ لە باوەڕپێکراوانی خۆی نارد بۆ شیـراز، ئەم خواستــەی لە کەریـم خان ڕاگـەیـانـدو بەڵێنی دایێ خزمـەتگـوزاری بێ. پاش گەیشتنی نوێنـەرەکـەی سلێمان بە خزمەت کەریــم خانـی زەنــد، کەریـم خان ئەوەی هەر لە دڵــدا مابـوو کە فەرمـانـرەوایی خوسرەو خان لە ڕاستیدا بە هاوکاریی محەمەد حەسەن خانی قاجــار دەستی کەوتبــوو، لەبــەر ئەوە خۆی لەبــەدنــاوبـوون نەبـان کردو فەرمـانـرەوایی سنەی دا بە سلێمان پاشای بابان و لە ساڵی ۱۱۷۷ی ك دا سلێمـان پاشـابـە فەرمـانی کەریم خانی‌زەنـد ناوچـەی ئەردەڵانی داگیـرکـردو پارمـەتی‌دا. هەر لەم سەردەمەدا ئەحمەد پاشا لە

ناوچـەی شارەزوور دەستی کێشرابۆوە. سلێمان پاشا ئەو ناوچەیەشی خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی، بەڵام والیی بەغدا بەم کارە ڕازی نەبوو و قوبـووڵی نەکـرد. والیی بەغدا بە لەشکرێکی گەورەوە کە بیست هەزار سەربـازی دەبـوو لە یەنگیچـەری و عەشـایەری عەرەب، بە تۆپخانەو زەمبـوورەکخـانـەوە بۆ گوێڕاکێشـانی سلێمـان پاشـا ڕووی کردە شارەزوورو ئەردەڵان. ئەمین پاشای مووسڵ و عەبدوڵڵا پاشای زەهـاویش[53] لەگـەڵ ئەم لەشکـرەدا بوون. لەشکـرەکـە سەرلـەبەرلە ناوچـەی کفـری خڕبۆوە. سلێمان پاشایش لەولاوە بە دە دوازدە هەزار سواریکـەوە لە ئازایـانی ئەردەڵان و بابـان بەرەنگـاری لەشکری عەلی پاشـای والیی بەغـدا بوو. پاش تێـك گیرانی هەردوو لەشکرەکەو شەڕ گەرم بوون، شنـەی سەرکـەوتن ئاڵای لەشکـری ڕۆمی شەکـانـدەوەو سوپـای بابـان و ئەردەڵان شکـان و هەڵاتن. زۆربـەی کەڵـە پیـاوان و دلیـران لەو شەڕەدا کوژران و بەدیـل گیـران و هەرچی‌یەکیان لەچەك و جبـەخـانـە لێوەگیـرهـات بە دەست ڕۆم کەوت. عەلی پاشا دوای ئەم شەڕ و سەرکەوتنە درەخشانە ئەحمەد پاشای برای سلێمان پاشای نارد بۆ ناوچـەی شارەزوورو فەرمـانـڕەوایی ئەو ناوچـەیـەی پێ‌سپارد. بەڵام زۆری نەخسایـانـد، سلێمـان پاشـا لەشکـری خڕکـردەوەو بە نیـازی گرتنـەوەی شارەزوور هەلیکـوتـایە سەری و ئەحمەد پاشای لەو ناوچەیە هەڵ کەندو ڕای‌فڕاندو خۆی بوو بە فەرمانڕەوای ناوچەکە.

ئەوەی شایـانی باسـە ئەو خانـەدانـە سنـەیی‌یـانـەی ماوەییکی زۆر لەمەوپیش بە هۆی ئاژاوەی ئەردەڵانەوە هانبوونە شارەزوورو بەشێکیان لە سەروەختی خوسرەو خان دا بۆجیگای خۆیان گەڕابوونەوەو لەوانەی ماشبوونەوە کوچی‌دان و بۆ وڵاتی خۆیانی گەڕاندنەوە.

سلێمان پاشای بابان عەلی خانی کوڕی بە ماڵ و منداڵەوە بە بارمتە نارد بۆ شیراز. هەروەها فەرمانڕەوایی سنەیشی بە حەسەن بەگ، کوڕەکەی دیکەی سپاردبوو. خۆیشی ماوەیێ لە سنەو ماوەیێ لە شارەزوور بەسەری‌بەرد، تا لە ساڵی ١١٧٨ی ك دا پیاوێ بە ناوی فەقێ ئیبراهیمەوە شەوێ لە شەوان خۆی گەیاندە ناوچەی شارەزوور، سلێمان پاشای بە دەم خەوەوە کوشت. پاش کوژرانی سلێمان پاشا محەمەد پاشای برای فەرمانڕەوایی شارەزووری گرتە دەست و عەلی خانی کوڕی سلێمان پاشایش بە فەرمانی کەریم خانی زەند ڕووی‌کردە ناوچەی سنەو بوو بە فەرمانڕەوای ئەوێ. بۆ ماوەی ساڵێ سا بە هەر فڕوفێڵی‌بوو گوزەراندی، بەڵام چونکە نەی‌دەتوانی بپەرژێتە سەر فەرمانڕەوایی، محەمەد ڕەشید بەگی وەکیل و میرزا عەبدوڵڵای وەزیر و میرزا صادقی مستەوفی ڕوویان لەدەرباری کەریم خانی زەند ناو داوایان لێ‌کرد لە کاری بخا. پاشان نەواب خوسرەو خان کە لە گوشەو کەنارێکی کوردستان دا دوورەپەرێز خۆی مەڵاس دابوو، لە ساڵی ١١٨٠ی ك دا کرا بە فەرمانڕەوای ئەردەڵان.

# خوسرەوخانی دووەم
# بۆ جـــــاری دووەم

چون خوسـرەو خانی دووەم بۆجاری دووەم فەرمانڕەوایی ئەیالەتی سنـەی گرتـەوە دەست ژەنـگ و پەلاسی خەم و تەم و پەژارە لە ئاوێنەی دلی پیـر و جوانی ولاتـەکـە سرایـەوە. ئەیـالـەتی کوردستان بە جۆرێ ئاوابـۆوەو بەخـۆهـاتـەوە خەڵکەکەی بە گەورەو بچووکەوە تـارادەیی سەرئاسوودەو خۆشحاڵ و شادمان بوون، لەو ڕۆژەوە دروست کرابوو سەردەمی وا خۆش و باشی بە خۆیەوە نەدیتبوو.

کەس هیــچ فەرمـانـڕەواییکی لەم فەرمانڕەوا بەفـەڕە پایـەبلینـدتـر نەدیتبـوو. لە سەر وبـەنـدی فەرمـانـڕەوایی ئەم پیاوە مەزنەدا گەوهەرو سواڵەت هاوسەنگ بوون. لە سەردەمی شان و شکۆ و هەیبەت و هووتی ئەم گەورەیەدا مراوری‌وبەرد هاوکێش بوون .

هەڵبەست

چنین خسروی در جهان کسی ندید
بدورانش با میش گرگ ئارمید
بدورش ز پس تازه شد عدل و داد
کسی از داد گستری نشانی نداد

بەکوردی:

خوسرەوی وا لە جیهان دا کەس نەیدیت
لە سەردەمی ئەودا گورگ و مەر پێکەوە دەحاوانەوە
لە سەروبەندی ئەودا دادو عەدالەت سەرلەنوێ تازە بۆوە
کەس لە دادی کیسرا ئاسەوارێکی لە بیر نەما

ئەم فەرمانرەوایە یازدە ساڵی دیکەی فەرمانرەوایی ئەیالەتی سنەی بەوپەڕی شان و شەوکەتەوەو بە سەربەخۆیی‌یەوە بەسەربرد. زۆر بە کارامەیی و لێهاتوویی‌یەوە دەپەرژایە سەر کاروباری وڵات. خانووبەرەکانی دەوروبەری سەرای حوکومەتی، کە ئێستا بە تەلاری روبە (تەپولە) بەناووبانگە، لەگەڵ گەرماوێك و مزگەوتێکی گەورەدا بە یارمەتیی ئەندازیار (فیکرەت)دروستکرد و باخ وچوارباخێ کە لە سەردەمی فەرمانرەوایانی پێش خۆیدا بە باخی مەیدان بەناووبانگ بوو وای ئاواکردەوە بەهەشت بە بەهەشتیی خۆی ئیرەیی پێ‌دەبردە. من خۆم ئەم کەمینەیە، لە سەردەمی منداڵیم دا زۆر جار بۆ گەشت وگوزار بۆ ئەم باخە[٥٤] دەچووم. بەراستی جوانیی رێگاوبان و سەکۆو شەقامەکانی و شنەبای خۆش و بۆن وبەرامەی گوڵ وگوڵزاری بەهەشتی سەرسام دەکرد. لە داوێنی گوڵ و چنارەکانی‌دا ئاوێکی سازگارو رەوان رێی‌دەکرد. لە ژێر پێی دار سەروو درەختەکانی‌دا کانیاوی رۆشن هەڵ دەقوڵان. (جنات تجري من تحتها الانهار)، بەڵام بەداخەوە ئێستاکە بە دەست رۆژگارو چەرخی چەپگەرەوە سەرەرای هەموو دەسەڵات و دەسرۆیی‌یەکی فەرمانرەوایان هەیان بووە، کوێرە ئاسەوارێکی لێ بەدی ناکرێ و وەك هەر نەشبووبێ وایە. دارو

دره‌خته‌کانی درکی ئاسایی‌یان له‌جێ نار وێ‌و گوڵ و گوڵزاره‌کانی خاشاکێ چی‌یه له جێ‌یان شین نابێ. ئه‌وه‌ی ده‌مێنێ‌و له نه‌مان نایه هه‌ر خودا خۆیه‌تی‌و به‌س (فاعتبروا یااولی الابصار).

سه‌رده‌می ئه‌و خوسره‌وه به‌ختـه‌وه‌ره به دادپه‌روه‌ری‌و ژێرده‌ست په‌روه‌ری به‌سه‌رچوو. چاك وخراپ له‌سای سایه‌چه‌وری‌یه‌وه‌ی به خۆشی به‌سه‌رده‌برد. خه‌لکی ولات به هه‌موو چین و ده‌سته‌جاتیه‌وه له سه‌رکه‌وتن و سه‌ربه‌رزی‌دا به‌رخوردار بوون و هه‌موو له مه‌ترسیی هات وچۆو سه‌فه‌ر سه‌رئاسووده‌و ره‌حه‌ت بوون و بێ ترس و په‌ژاره بۆ خۆیان لیی ده‌نووستن ده‌نگوت زه مانی ساحیب زه‌مانه. ئیتر به‌م جۆره خه‌لکه‌که ره‌حه‌ت و ئاسووده ده‌ژیان و ئه‌من و ئاسایش به‌رده‌وام بوو، تا له سالی ١١٩١ی ك دا ده‌وله‌تی عوسمانی به‌رانبه‌ر به هێرشه‌که‌ی که‌ریم خانی زه‌ند بۆ سه‌ربه‌سره، وه‌زیری به‌غدای راسپارد هێرش به‌رێته سه‌ر سنووره‌کانی ئێران. محه‌مه‌د پاشای بابانیش خۆی گه‌یانده له‌شکری وه‌زیری به‌غداو به‌لێنی دا کوردستانی ئه‌رده‌لان بگرێ. وه‌زیریش له‌شکرێکی گه‌وره‌ی له ده‌وری خۆی خرکرده‌وه‌و پاره‌یێکی چاکیشی بۆ ده‌وله‌تی عوسمانی بۆ خه‌رجی ئه‌م له‌شکره‌ی ناردبوو، دا به محه‌مه‌د پاشاو سپێردرا حوکومه‌تی ئه‌رده‌لان تێك بته‌پێنێ. محه‌مه‌د پاشا به له‌شکری رۆم و بابانه‌وه رووی‌کرده ئه‌رده‌لان و له ئه‌له‌ك و بانه‌و مه‌ریوان ده‌ستی به ده‌ستدرێژی کردو ئاگری شه‌روشۆری هه‌لایساند، هه‌رکه خوسره‌و خان به‌مه‌ی زانی نامه‌یێکی بۆ که‌ریم خان ناردو له‌م کاره‌ی به ئاگا هێناو خۆیشی هێشتا وه‌رامی نامه‌که‌ی نه‌درابووه. بێ سێ‌و دوو به‌ره‌نگاری دژمن بووو پیاوانه لییان راپه‌ری. له رێگا له‌شکرێکی که‌م له مه‌راغه‌یی‌و

گەرووسی بەپیــریــەوە هاتن و پێشــوازیــان لێ کــردو ئازایــانــە بۆ بەرەنگـاربـوون هاتــە پێشــەوە. محەمــەد پاشــای بابانیش بە لەشکرە دوارزدە هەزار کەسی یەکـەوەی هەرە ئازاو کەڵـەمێـردانی بابان و ڕۆم و یەنگی چــەری وعــەرەب، لەگـەڵ لەشکـرەکـەی خوسـرەخـان دا لەو پێـدەشتی مەریـوانە، لە نزیك زرێبار بەشەڕهاتن و شەڕەکە گەرم بوو. نەرمشێران دەست بە شیر و نێزەوە هەڵیان کردە سەر یەکتر و ڕوومەت و ڕوخســاری شێـرانی مەیدان، لەبەر بریسکەی تێخی خوێن پڕژێن وەك دارسەندەرووس، ڕەنگ ورووی ئازاو بەجەرگان لەبەر بریقەی نێزەی گیــان کێش وەك داری ئەبـەنـووس، ، پـاش شەڕوشـۆڕێکی گەورەو کوشت و کوشتارێکی زۆر هێزی مەراغ ـز گەرووس بەجارێ، پشتیان لە شەڕ کردو هەڵاتن، گەڕانـەوە بۆ وڵاتی خۆیـان، چونکـە لەشکـری ڕۆم و بابان لە مەیدانی نەبەرددائازایەتی یـەکی چاکیان نواندو لەشکری ئەردەڵانیش سەرەڕای هەمـووئـازایـەتی و لە خۆبووردنێکی لەو شەڕەدا نوانـدیان خۆیـان لەبـەر لەشکـری بابـان و ڕۆم نەگـرت و ناچار بۆی دەرچـوون. ژمـارەیێکی زۆر لە گەورەپیاوانیان کوژران و بەدیل گیران میرزا عەلی و میرزا مەهدی هەردوو کورەکەی میرزا عەبدوڵلای وەزیر و نەســرو ڵلا بەگـی، کوڕی یوسـف بەگ ومـحــەمــەد ڕەزابــەگی بەنی ئەردەڵان و ـحەمەد عەبدوڵلا مونشی لە ناو کوژراوە کان دا بوون.

میــرزا ئەحمەدی کورە گەورەی میـرزا عەو ڵلا و ژمارەییکی زۆر ناســراوانی ئەردڵان لە ناو بەدیــل گیــراوەکـان دا بوون لە لەشکـری محـەمـەد پاشـایش خەلکێکی زۆر کوژرابـوون و بەدیـل گیـرابوون. سەرەنجام پاشماوەی لە شکرەکە دوای خوسرەخان کەوتن و گەڕانەوە بۆ ئەیالەت. محەمەد پاشای بابانیش هەر لەو شەرگایەدا خیوەتی هەڵ داو

لە شکری لێ دامەزراند لە ترسی لە شکرکێشیکەریم خان وا توقی بوو ، بەیدەویرا هەنگاوێ نە بۆپێشەوە ونە بۆ پاشەوە هەلێنێ پاشان وای بە چاك زانی لەوێ بمێنێتەوە ناچار ماوەیێك لە مەریوان سرەوت . هەرکە ئەم خەبەرە بە کەریم خان گەیشتەوە، بە جارێ لە رکان ئاگری گرت . بۆ گوێ راکێشانی بابانەکان لەشکری ئامادەو تەیارکردو صادق خانی برای لەگەڵ چەند فەوجێك دا نارد، بەسرە بگرێ . نەزەر عەلی خانی زەندیشی بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو بەغدا بەرێ خست . کەلب عەلی خانی کوڕی شێخ عەلی خان و عەلی خانی زەندیش بە لەشکرێکەوە بەرەو سنە بەرێکرد ڕوم وبابان چاوترسێن کەن و بە تواندوتیژی سزایان بدەن . صادق خان بەماوەیێکی کەم شاری بەسرەی گرت و پیاوەکان وژنەکانیشی بەدیل گرتن . پاش تۆلەساندنێکی چاك گەرایەوە بۆ دەربارى کەریم خان و ئافەرینێکی زۆر کراو نەزەر عەلی خانیش کە بەرەو بەغدا دەهات لە سنووری ڕوم تێپەڕیو سێ فەرسەخی مابوو بگاتە بەغدا ئەوناوچانەی هەموو داگیرکرد . زۆر بەی ناوچەکانی سەر سنووری تالاًن کردو شادو دلخوش گەڕایەوەو بەدیل گیراوانی ڕۆمی سەرلەبەر رەوانەی فارس کرد . کەلب عەلی خان و عەلی مرادخانیش کە دەبووکومەك و یاریدەی خوسرەو خان بدەن گەیشتنە سنە بۆ ڕاوانی لەشکری بابان . محەمەد پاشایش هەرچەندە لە کردەوەکانی پەشیمان ببووەو نامەی ناردبوو داوای ئاشتی دەکرد، بەلام ئەم هەوڵ و تەقەلایەی بێ سوود بوو . لە شکری زەند لەگەڵ خوسرەو خان دا لە سالی ۱۱۹۱ی ك دا لە سەرەتای مانگی رەجەب دا چوون بۆ شەڕ . خوسرەو خانی دووەم بە لە شکری دەریاخرۆشی نەردەلانەوە بوو بە پێشەنگی لەشکرەکەو بەرەنگاری لەشکری

محەمەد پاشای بابان بوو و بۆ داگیرکردنی وڵاتی بابان کەوتە جم وجوول . بەڵام محەمەد پاشا ئەم شەڕەی بە بەرزەوەندو مەسڵەحەت نەزانی سووك وباریك پێی پێوەناو بۆیدەرچوو ولەشکری نەبەزی زەندو ئەردەڵانیش گەیشتنە قزلجە کە پێنج فەرسەخ لە قەڵاچوالانەوە دوورە لەوێوە لوتف عەلی خانی کوڕی سوبحان وێردی خان مامی خوسرەوخان ، بە لەشکرێك وە دوای لەشکرە هەڵاتووەکەی بابان کەوت وتا ناوچەی قەرەداخ ڕاوینان و ئەو ناوچەو سنوورانەی هەموو وێران کرد . لەم سەردەمەدا گورگ عەلی بەگ هات ، گەیشتە ئەو ناوچەیەو بە هەردوو سەرداری لەشکرەکەی ڕاگەیاند ئیتر لەوەندە زیاتر دەسدرێژی نەکرێتە وڵاتی ڕۆم و بابگەڕێنەوە بۆ سەر سنوورەکان ، چونکە دەرباری ئێران ئیلچیی خۆی بۆ دەرباری سوڵتانی عوسمانی ناردووەو دەوڵەتی عوسمانی عوزری بۆ دەوڵەتی ئێران هێناوەتەوەو حەز بە ئاشتیو نێوان تە بایی دەکەن پاش ئەم فەرمان عەلی موراد خان گەڕایەوە بۆ کرماشان . کەلب عەلی خانیش لەتەك خوسرەو خان دا گەڕانەوە بۆ گوندی زاغە ، کە یەکێ لە گوندەکانی ناوچەی ئەردەڵانە . دەوروبەری دوو مانگێ لەو ناوە مانەوە ، تا چەپەرێ لە لایەن کەریم خانەوە گەیشت ، ریك و ڕوون ، ڕای گەیاند:

کە هێشتا ئاشتی لە نێوان هەردوو دەولەت دا سەری نەگرتووە . چاك وایە سەرلەنوێ هەڵکەنەوە سەر ئەیالەتەکانی عوسمانیو ئەو ناوچانە لەژێر سمی ئەسپەکانیان دا دارزێنن.لەبەر ئەمە خوسرەوخان و کەلب عەلی خان و عەلیموراد خان دووبارە ڕوویان کردەوە ناوچەی شارەزوور.خوسرەو خان وەك جاری پێشوو هێزەکەی خۆی کرد بە پێش ڕەوی لەشکرەکەو هەموو ڕوویان کردە ناوچەکانی عوسمانی .

زولفقـار خانی خەمسـەیش هەر هەر لەم ڕۆژانەدا، لە ڕێگـایـەکی ترەوە هاتە نێو خاکی عوسمانی‌یەوە. محەمەد پاشایش کە لە قەڵاچوالان بوو پاشـەکشێی کردو داوای یارمـەتیی لە حەسەن پاشای وەزیری بەغدا کرد حەسـەن پاشـایش کە [٥٥] کە هیـەی خۆی بە لەشکـرێکی زۆرەوە بۆ یارمـەتیی نارد محـەمـەد پاشـایش دوای گەیشتنی ئەمیارمەتی‌یە خۆی لە سەنگەردا قایم کردو بۆ شەڕ ئامادە بوو. لەم سەردەمەدا ئەحمەد پاشای برای محـەمـەد پاشا پشتی لە دەوڵەتی عوسمانی کردو هاتە ناو لەشکری زەنـدەوەو بڕیـاری دا لەدژ لەشکـری ڕۆم شەڕ بکـا. هەرکـە لەشکری کەریم خان گەیشتـە نزیـك لەشکـری ڕۆم و سەنگـەرەکـانی محـەمەد پاشـا، لە ترسـان زەنـدەقیـان چووو بەرگـەی شەرکردنیان لە خۆیان دا نەبینیو هەر بەو شەوە بۆی دەرچـوون. بۆسبـەینێ کە لەشکـرەکـە ڕووداوەکـەیـان بۆ ئاشکـرابوو دەستیـان دایە تاڵان و بڕ و ئەو ناوەیان ئاگـرتێ بەرداو ئافـرەتێکیـان بەدیل برد. خوسرەو خان چونکە پیاوێکی نیهـادپـاك و ڕەوشت بەرز بـوو، دیلەکـانی لە دەست لەشکـری زەنـدو قزلباش سەنـدەوەو ئازادی کردن و بەشێ لەو دیـلانەی کە ناسراوبوون بەرەو سنە بردو ئیتر پاش ئەم سەرکەوتنە ئەحمەد پاشا کرا بەفەرمانڕەوای شارەزوور. ڕەزاقـولیخـانی برای خوسرەو خانیش بۆ پشتگیری کردنی ئەحمـەد پاشـا لە شارەزوور مایـەوە. ڕەزاقـولیخان پاش لە ناوبردنی دژمنانی ئەحمەد پاشا لەگەڵ باجگیرەکانیدا گەڕایەوە بۆ سەر کاروباری خۆی. بەپێی نوسخـە کتێبـەکـەی قازی، پاش ئەم ڕووداوە زۆری نەخـایـانـد محەمەد پاشا بوو بە پیاوی جەنابی کەریم خان و داوای کرد ئەحمەد پاشا لە کار بخرێ‌وخۆی لە جێی دانێن.

وەزیـری بەغـدا پاش بیستنـەوەی ئەم ڕووداوە دەمارگـرتی و ئەحمەد

پاشای کرد بەپاشای بابان. محەممەد پاشایش ئەم کارەی لە کەریم خان
ڕاگەیاندو داوای کۆمەگی لێ کرد. کەریم خانیش عەلی موارد خانی بە
لەشکرێکی گەورەوە بۆ کۆمەك کردنی ناردئەحمەد پاشا خۆی لەبەر ئەم
هێزە نەگرت ، بۆی هەڵات. عەلی موراد خانیش گەڕایەوە بۆشیراز.
بەڵام زۆری نەبرد ئەحمەد پاشا بە کۆمەگی لەشکری ڕۆمەوە
سەرلەنوێ گەڕایەوە بۆ ناوچەی شارەزوور. عەلی موراد خان ،
سەرداری زەندیش دووبارە ڕاسپێردرایەوە بەرەنگاریی ئەحمەد پاشا بکا.
پاش ئەوەی هەردوو لەشکر بەیەك گەیشتن و شەڕ گەرم بوو،
لەشکرەکەی عەلی موراد خان شکاو عەلی موراد خان خۆشی دەسگیر
بوو. ئەحمەد پاشایش یەکسەر کۆت و زنجیری کردو بۆ خزمەت
وەزیری بەغدای نارد. وەزیری بەغدایش زۆر چاکی ڕەفتار لەگەڵ
کردو دوای دوازدە ڕۆژ گەڕاندیەوە بۆ شیراز. بەڵام کەریم خان بەم
کەین و بەینە زۆر توورەبوو و ئەحمەد خانی کوڕی خوسرەوخانیشی کە
چواردە ساڵ بوو، بە بارمتە لە ئەسفەهان گل درابۆوە لە گەڵ خۆیدا
برد. لە شوێنێك دا کە دوو قۆناخی مابوو بۆ ئەسفەهان خان و سوڵتان و
سەردەستەو سەردارانی عیراق و محەممەد خانی فەیلی تێکرا چاکی گوی
بەفەرمانییان لێ هەڵکردو لەگەڵ ئەحمەد ئاغا باش ئاغاداولەشکری
لەوەندا کە دەوڵەت دەمێ بوو وەدەری نابوون ، وردوبارێك دایانە
پاڵ لەشکری عەلی موارد خان و بەم جۆرە لەشکرێکی جەیحوون
ئاسایی لێخڕبۆووەو بەرێکەوت دژمن تێك بشکێنێ. زولفوقارخانی
ئەفشاریش لەتەك هەرچیوپەرچیو ئەوباشان دا بەرانبەر لەشکرەکەی
عەلی موارد خان ڕاوەستا. لە قەڵەمڕەوی عەلی شوکوردا تێك
بەربوون. پاش شەڕوشۆڕێکی زۆرو خویناوی عەلی موراد خان

سەرکەوت و زۆربەی شەرکەرانی ئەفشار یان کوژران ، یان بەدیل گیران، زولفقارخان خۆشی لەگەڵ چەند کەسێك دا هەڵات و تا تارم و خەڵخاڵ [٥٦] خۆی نەگرتەوە. حوکمرانی ئەوولاتە زولفوقارخانی دەسگیرکردو راست بۆ عەلی موراد خانی نارد. عەلی مورادخانیش هەرکە گەیشت، یەکسەر فەرمانی کوشتنی داو وەکو مەر سەریان بری.
پاش ئەو سەرکەوتنە عەلی موراد خان ویستی خوسرەو خانی ئەردەڵان ببینێ. بۆ ئەمە یەکێ لە سەرکردە بەرچاوەکانی نارده لای خوسرەوخان.
خوسرەوخانیش داوخوازەکەی عەلی خانی بەجێ هێناو لە ناوەندی مانگی رەمەزانی پیرۆزدا لە سالی ١١٩٢ی ك دا بە هەزار و پێنج صەت سوارێکەوە لە سەرکردەو پیاوماقووڵ و سەردارانی ئەردەڵان رووی کردە ناوچەی ئەبهەر کە لەو سەروبەندەدا بنکەی عەلی موراد خان بوو.
عەلی موراد خان هەرکە خەبەری هاتنی خوسرەو خانی بیست ، زۆر شادو دڵخۆش بوو و خۆیشی لەگەڵ پیاوماقووڵان و ناودارانیدا لە شوێنێك دا ، کە دوو فەرسەخ لەلەشکرەکەوە دوور بوو، بەوپەڕی ڕێزەوە بەپیریەوە چوو.
خوسرەوخان پاش ئەوەی گەیشتە ئەوێ ئەڵلاقولیخانی زەندی ، کە عەلی موراد خانی لێبەرکدا چوو بوو، ئازادکردو بە تکای ئەو سەرلەنوێ لە لایەن عەلی موراد خانەوە فەرمانڕەوایی کرماشانی پێ بەخشرا. پاش ئەمە لەتەك سەرداری زەنددا لە ڕێی قەزوێنەوە ڕۆیشتن بۆ ئەسفەهان. لەم سەردەمەدا خەڵکی ئەردەڵان بە فیتی محەمەد رەشید بەگی وەکیل دژی خوسرەوخان جووڵانەوەو سکاڵاو گازنیان بردە لای عەلی موراد خان. عەلی موراد خانیش، چونکە خوسرەو خانی لە خۆی گەلی بەمەرد تر و بە جەرگتر و گەورەتر و تواناتر

دەزانی، بە هەلی زانی، نەی هێشت جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ ئەیالەتی ئەردەڵان و فەرمانڕەوایی ئەم ئەیالەتەی بە ناوی کەهزاد خانی کوڕی سوبحان وێردی خان دەرکرد. هەر لەم سەردەمەدا خەبەر گەیشت، کوڕەکانی صادق خانی زەند خەڵکێکی زۆریان کۆکردۆتەوەو خۆیان بۆ دژایەتیی عەلی موراد خان ئامادەکردووە. ئەویش سەردارانی خۆی بە لەشکرێکی بێشومارەوە بۆ تەمێ و گوێڕاکێشانیان دەست نیشان کرد. محەمەد ڕەشید بەگی بە سێ صەت کەسەوە لە هاوتفاقانی شەڕ فەرمان داو پاش بەرەنگاربوون کوڕانی صادق خان بە هەڵمەت و هێرشی مەردانەوە بە دەست هاتن و لەشکری دژمنیان بەزاندو لەو شەڕەدا سەرکەوتن. محەمەد ڕەشید بەگی وەکیل و هاوالانی هەڵاتن و چوون بۆ ئەسفەهان، لەوێوە یەکراست گەڕانەوە بۆ کوردستان، ئەویش بەو نیازەوە کە بەشکو بتوانن لە پەنای حوکمڕانیی کەهزادخان دا سەربەخۆییەکیان دەسکەوێ، بەلام خوسرەوخان کە لە ئەسفەهان بوو، وەختێ دیتی پەیڕەوان و دەست نیشانکراوەکانی عەلی موارد خان سەریان لێ شێواوەو بشێویان کەوتۆتە ناوەوە ،لە کوردستان لەگەڵ ڕەزا قولیخانی برای و لوتف عەلی خانی مامی دا گەڕانەوە بۆ کوردستان و پاش دە ڕۆژ دوای گەیشتنی محەمەد ڕەشید بەگ ئەمانیش گەیشتنە ناوچەی ئەسفەندئاباد. هەرکە خەبەری گەڕانەوەی خوسرەو خان بلاوبۆوە، کەهزادخان و محەمەد ڕەشید بەگ و میرزا یوسف و میرزا ئەحمەد، کە هەردووکیان کوڕی میرزا عەبدوڵلای وەزیرن لەگەڵ هەموو پەیڕەوو دەست و پێوەندەکانیاندا بە پەلە هەڵاتن و ماڵ و سامانی خۆیان کۆچ داو چوونە پایگەڵان کە بەشێکە لە ناوچەی کوردستان. خوسرەوخانیش نەیکردە

نامـــەردی ڕاوەدووی نـــان و هەرچی یـــەکیـــان هەبـووو نەبـوو لێی بە تاڵان گرتن و هەڵاتـــووەکـــان ناچـــار هەر هێنـــدەیـــان پەرژا بە سەری سەلامـەت دەرچن و دەستیان لە هەموو سەروەت و مـاڵ وسامانێکیان هەڵ گرت و بە خاوخێزانەوە ڕوویان کردە شارەزوورو لەو ولاتە ، لەپەنـای مەحمـوود پاشـای بابـان دا حاوانـەوە . خوسـرەو خانیش بە دەسکـــەوتێکی زۆرەوە گەڕایـــەوە بۆ ئەردەڵان و کەوتـــە ڕێـك خستنی کاروبـاری ولاتـەکـەی و ئەوانەی بێ هۆ ئاوارەو پەراگەندە ببوون خڕی کردنـەوەو هێمنی و ئاسایشی بۆ فەراهـەم کردنـەوە . لەم سەروبـەندەدا محـەمـەد پاشـاو عومـەر بـەگ هەردوو برای مەحمـوود پاشای بابان لە کردەوەو ڕەفتـاری مەحمـوود پاشـای برایـان ناقـابیل بوون وبەو جۆرە مانەوەیـــــــان لە خاکی بەبەو شارەزوور زویـر بوون و لەسەر ئەوە خاکـی بەبـــەو شارەزووریـــان بەجـێ هێشت و چوون بوخزمەت خوسرەوخانی والی . مەحموود پاشا کە ئەمەی بیست ، بە دەرفەتی زانی لە خوســرەوخـانی ڕاگـەیـاند ، ئەگەر ئەو براکانی بنێرێتەوە بۆ مەڵبەندی بابـان ، ئەمیش کەهـزادخـان و هاودەستـەکانی بۆ دەنێرێتەوە مەڵبەندی ئەردەڵان . مەحمـوود بەم جۆرە دەرووی دوستـایـەتی و نێـوان تەبـایی وەسەرپشت خست و داوخوازییەکەی قوبوول کرا،بابەکرئاغا لە لایەن مەحمـوود پاشـاوە بۆ هێنانەوەی محەمەد پاشاو عومەر بەگ ڕاسپێردرا . محـەمـەد ئاغـای بروجەردیش کە لە باوەڕپێکراوانی خوسرەخان بوو، هێنـانـەوەی کەهـزادخانی پێ سپێردرا . مەحمووپاشا چاوی لە هەموو ڕێ ورەسمی مروەت ویـژدان و بەزەیی و برایـەتی و هاوخوێنی پۆشی و هەردوو براکـــەی کوشت . کـەچی کەهـزادخـان کە گەیشتـە ئەردەڵان خوسرەوخان بە پێچەوانەی مەحمود پاشاوە زۆری پێشوازلی کردو بگرە

لەجــارانی زێتــر قەدرو ڕێــز گرت، بەڵام محەمـەد ڕەشیــد بەگ و هاودەستـانی، لە خۆڕایی ترسیـان لێ نیشت، لـە شارەزوور هەڵاتن و بەرەو ناوچـەی زەهـاو هەی پێیان لێ کردو لەوێ هێور ینەوەو خۆیان دایە پاڵ وەزیری بەغدا. وەزیری بەغدایش زۆریان بەتەنگەوە هات وسێ و چوار دێیـەکی لە ناوچـەی زەهـاو پێ بـەخشین، بەڵام پاش ماوەیێـك محـەمـەد ڕەشید بەگ و خزمەکانی لێ دەرچن سەرلەبەریان گەڕانەوە بۆ کوردستـانی ئەردەڵان و خوسـرەو خان لە هەموو گوناهێکیان خۆش بوو. محـەمـەد ڕەشیـد بەگ و خزمـاکـانیشی، بەقسـەی هێندێ کەس چوار ساڵ و بە واتـەی هێـندێکی دیکـە نزیکـەی ساڵێك لەو ناوچەی زەهاوە مانـەوە. پاش ماوەیێـك خۆیـان دایە پەنای عەلی موراد خان و بە سایی ئەوەوە بەخشـران و یارمـەتییـەکی زۆر درا ن، بەڵام زۆری نەخـایاند سەرلـەنـوێ ئاڵای دژمنـایـەتییـان هەڵکـردەوەو ناوچـەی جوانـرۆو پاڵنگـانیـان داگیـرکـرد. لە ساڵی ١١٩٦ی ك دا ڕێگـای غایـەنـەتی و رکـەبـەری یان لەپێش گرت و ، کار بە ئەنـدرازە یەك گەیشت توان و لێوەشـاوەیی خوسـرەو خانیان لە پێش چاو عەلی مورادخان بە تەرزێ خست خان کەوتە مەترسییەکی گەورەوە. عەلی موراد خان کە تازە لە گەڕ یاخیبـوونی کوڕانی صادق خانی زەنـد سەرسـووك ببوو زۆربەی یاخی یەکانی هێنابووە ژێر بار، بەو ڕایە گەیشت کە وێران کردنی سنەو بردنی خوسـرەو خان بۆ ئەسفـەهـان دەبێتـە مایـەی هێمنیو ئاسـایش و سەر بـە خۆییفەرمانڕەوایییەکەی ئەبەرئەوەجەعفەر خانی برای بە پێنج هەزار سوارەوە بۆ ناوچـەی ئەردەڵان بەڕێ کەوت خوسرەوخان یـگری بۆئـە سفـەهـانی بێنێ. بە پێی مێـژووی خوسرەو بەگ عەلی موارد خانی زەند بە ڕاوێژی محەمەد ڕەشید بەگ ڕەزا قولیخانی برای خوسرەو خانی

کرد بە فەرمانڕەوای سنە.بە بیستنی ئەم خەبەرە، خوسرەوخان فەرمانی لەگەڵ چەند جێمتمانەیێکی دا کە یەکێکیان باپیرەی ئەم کەمینەیەیە ۆمحەمەد ئاغایە، سواربوون و لە ڕێگای خونسارەوە خۆیان گەیاندووەتە ئەسفەهان خوسرەخان فەرمانی بە خان ئەحمەد خانی کوری دا لەگەڵ دەست و پێوەندانیدا کۆچ بکەن و ڕووبکەنە شارەزوور. شایانی باسە، ڕەزا قولیخانی برایشی کە لە ئەسفەندئاباد جێگیر بیوو فەرمانڕەوایی ئەیالەتی ئەردەلانی قوبوولی نەکردو داواخوازی عەلی موارد خانی بەجێ نەهێنا. بەم جۆرە مافی گەورەیی خوسرەو خانی برای بەجێ هێناو لەگەڵ هەموو خزم و پەیرەوانیدا کۆچیان کردو خۆیان گەیاندە خان ئەحمەد خان. جەعفەر خانیش پاش هەلاتنی ئەوان بە دوو سێ ڕۆژێ هاتە ناو سنەوەو ناوچەکەی ویران کردو خەلکەکەسریشی زۆر ئازاردا. هەرکە ڕەزا قولیخان ئەمەی دیت بەرەو ناوچەی ورمێ ملی ناو داوای یارمەتیی لەئیمام قولیخانیڕمێ کرد. ئیمام قولیخان لەو سەروکاتەدا ئالای سەربەخۆیی هەلکردبوو، داوای سەلتەنەتی دەکرد. ئیمام قولیخان بەهاتنی ڕەزا قولیخان خۆش حاڵ بووو زۆری پێشوازلیکردو ئەم هاتنەی بەهەل زانی بۆ ئەوەی بە پێنج شەش هەزار کەسێکەوە یاخی بیێو ئەیالەتی سنە و شارەزوور وەسەر قەڵەمرەوی خۆی خا. کاتێ لەشکر گەیشتە نزیکی سنە جەعفەرخانی زەند هەلات و ڕەزا قولیخانیش هاتە نێوشارەوەو کاروباری گرتەدەست. ئیمام قولیخانیش ڕووی کردە ئەسفەهان، بەلام کەدیتی عەلی موراد خان بە هێزێکی گەورەوە بریاری بەگژدا چوونی داوە، دوابەدوا گەڕایەوە بۆ ولاتی خوێ، پاش هەلاتنی لەشکری ئیمام قولیخان دوو سەرداری زەند، کەهزاد خان ولوتف

عەلی خان بە یارمەتیی لەشـکری کرماشان و کۆمەگی محەمەد رەشید بەگی وەکیـل هەڵیـان کوتایە سەر سنەو لەگەڵ رەزا قولیخانی ئەردەڵاندا تێـك گیـران. رەزا قولیخـان هێشتـا حەفـدە رۆژ بە سەر فەرمـانرەوایی یەکەیدا تێ نەپەڕیبوو، بەدەست یەکێ لە خزمانی محەمەد رەشید بەگ لەوە دەچێ نەزەرعـەلی بەگ بووبێ، لەنـاوکـەوە بەسەختی بریندارکرا زۆری نەخـایـانـد لە ناوچـەی گەڕووس کۆچی دوایی کرد. ـ سالی ١١٩٩ ی ك دا کە لەو سەردەمەدا سنە تووشی ئەوپەڕی وێرانیو خرابی بیـوو خەڵکی ناوچـەکـە لەوپـەڕی پەرێشـانیو سەرگەردانیدا بوو ن، خوسـرەو خان سەرلـە نوێ گەڕایـەوە بۆ ئەردەڵان. پاش چوارمـانگ خەبـەری مەرگی عەلی مورادخـانی بیستەوە. بەبیستنەوەی ئەم خەبەرە ئەدانەی لەم لاو لەولا پەراگەندەو پەرش وبلاو ببوونەوە هەموو گەرانەوە بۆ زێـدو نیشتمـانی خۆیـان و بەمـە هێمنیو ئاسـایش و ئازادییـان بۆ فەراهـەم بۆوە. پاش مەرگی عەلی موراد خان لە هەمـوو لایـەکەوە داوا کاری فەرمـانـرەوایی سەری بەرزکـردەوە، تەنـانـەت ئەڵـڵاقـولیخان زەنگـەنـەیش یکە هەرگیز بەبیردا نەدهات، لەتیرەکانی یەکێ لەوانە بوو داوای فەرمانرەوایی یان دەکردو هاتبوونە کۆڕی مەیدانەوە. لەشکرێکی کۆکی لە تیرەکـانی کرماشان خرکردەوەو بە نیازی داگیرکردنی ناوچەی بابـانـەوە بەتـۆپخـانەو زەمبورەکخانەوهەیت وهووتی لەشکرکێشییەوە هاتــە سونتـورەوە. لەو شوێنـەدا، نەزەر عەلی خانی کوری سوبحـان وێــردی خان لە گــەڵ لوتف عەلی خانی برایو ئەڵــلاوێردی خانی کوڕیو هەردوو دورەکــانی محــەمــەد رەشیــد، بەگــدا دایـان پاڵ لەشکـرەکـەی، پێش ئەوەی بچنـە سەر ناوچـەی بابـان. ئەڵـلا وێردی خانیـان هان دا ناوچــەی سنــە داگیــرکـاو دوایی بە فەرمـان رەوایی

خوسـرەوخـان بێنێ ئەڵڵا قولیخانی زەنگەنەوێرای ئەوەی خوسرەو خان بوو چاکە یێکی ئیکجار زۆری بەسەریەوە خۆی لە رابردوو نەبان کردو بریـاری دا بەگـژ خوسـرەوخان دا بچێ بۆ ئەم مەبەستە رۆی بۆ ناوچەی ئەردەڵان. خوسـرەوخـانی والیش بە بیستنی ئەم خەبـەرە ، وەك مووی هەڵکر ووزاو کرژهەڵات وهەر لە هەوەڵ کۆوە تەپڵ و کەرەنای ناوداریی هێنـایـە جۆش و بە حەوت صەت سەربـازی کینـەتـۆزەوە بۆ گوێ راکێشـانی ئەو هۆزە بێ ئاوەزە جمیـان و پێشـەنگـانی بەرەی زەنگەنەکە ئەڵـڵا وێردی خانی کوری نەزەعەلی‌خانیان سەرکردەبوو، لەدێی میراوا گەمارۆدران و لە ترسی شێر شێرگران خۆشیان نەیان زانی چۆن هەڵاتن و ناچـار لە نیـدەشـەودا خۆیـان گەیـاندە لە شکری زەنگەنەو لەشکری تایەنیان بە جاری شڵەژاند. سبەنیی هەردوو لە شکر لە ناوچەی سونقور بە یەك گەیشتن و تێك گیران. ئەڵڵاقولیخانی زەنگەنە یەکـەر بە سێ هەزار سەربـاز وتـۆپخانەو زەمبورەك خانەو نەقارەخانەوە، ئازایانە هاتـە مەیـدانی شەرەوە. خوسـرەوی پایـە بڵینیـدیش کەحەوت صەت کەسیکی لەتەك بوو، پشت بە ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆز (کم من فئە قلیلة غلبت فئـة کثیـرة) هاتـە مەیـدانی نەبـەردەوە. ئەڵـڵا قولیخان زۆریی لەشکـرەکـەی لە سەرێکـەوە وکـەمیی لەشکـری ئەردەڵان لە سەرێکی ترەوە وای لێکـرد لە خۆی بایـیبـێ. میـرزا یوسـفی کوری میـرزا عەبـدولـڵای وەزیری ئەردەڵانی، کە لەخزمەتیدابوو بوو لەگەڵ بری لە دلێـران کرد بە پێشـەنگی لەشکـرەکەوناردی بۆ مەیدانی خوسرەوخان ، بەڵام ئازایـانی ئەردەڵان زوربـەی هێـرش هێنـەکـانیان لەشیر کیشـان و رەوانـەی نەمـانیـان کردن. بە شێکیشیـان لە هەڵاتن بەوولاوە چی‌یان بۆ نەمایەوە، بەشێکی دیکەشیان بە دەست شیرانی ئەردەڵان بەدیل گیران.

کاتێ ئەم خەبەرە بە ئەڵلا قولیخان گەیشت، بە لەشکرێکی گەورەو گرانەوە بەرەنگاری خوسرەوخان بوو. ئەڵلا قولیخان لەشکرەکەی ئەردەڵانی لەچاو لەشکرەکەی خۆی زۆر بەبچووك دیت، تەنانەت هێندەی بە بچووك هاتەپێش چاو، دەنگوت ئەمیان دەریایەکەو ئەویان دڵۆپێك، ئەمیان خۆرەو ئەویان تیشکێکە لە خۆر، بەوپەڕی لە خۆبایی‌بوونەوە شیری ڕك و کینەی لە کالان دەرکێشاو هەڵی‌کردە سەر ئازاو لێرانی سنە. دووکەڵی تۆپ و تفەنگ بەری ئاسمانی واگر تبوو، دنیای بە جارێ شین هەڵ گەڕاندبوو. لەتوزو خوڵی سمی ئەسپی دلێرانی مەیدانی مەیدانی شەڕ ڕەنگی تاریك ببوو و لە شەوقی تێغی نێزەی گیان ئەستێن ڕەنگە و ڕووی دلاوەران وەك زەردەچێوو زەعفەران زەردهەڵ گەڕابوون و لە بریقەی شیر و نێزە خاکی مەیدانی شەڕ ڕەنگی ببوو بە ڕەنگی یاقوت و مەرجان. خوڵاسە دلاوەرانی ئەردەڵان ڕۆحی ڕۆستەمیان شادکردو داستانی دەستانیان بە بیرهێنایەوە. خوسرەوخان بەوپەڕی زاتەوە هەڵیکردە ناوجەرگەی لەشکری دژمن و لە ڕەگ و ریشەی دەرێنان وسەری زۆری لە سەرکردە ناودارەکانی لە خاك و خوێن دا گەوزاند.

هەڵبەست

آورد که خوسرو نیك بخت
خداوند گوپال وشمشیر و تخت
افتخارش رشیده به میغ
بیفشرد پای و بیازید تیغ
ز تیغ و زشمشیر تیر وسنان
بسم سمندش سر سرکشان

بەضرب قوی بازوی دورمند
بسی پردلانش بەخم کمند
شداندرهجا آن یل کامیاب
ظفر هم عنان ونصرتش هم رکاب
بەکوردی:
خوداوەند گۆپاڵ و شمشیر و تەختی
بە خوسرەوی خۆش بەخت بەخشی
سەری شانازیی سەر لە ئاسمان دەسوێ
پێی لە زەوی توند دەکردو بە تیغ تێی دەژەندن
زۆری لە ئازاو بەجەرگان
لە ناو تێغ و شمشیر و رمی
وەژێر سمی ئەسپەکانی کەوتن و
زۆر لە ئازاو بەجەرگانی بە هێزی
بازووی بە ئاڵقەی کەمەندیەوە بوون
ئەو شێرە بە موراد گەیشتووە
لە مەیدانی شەڕدا سەرکەوتن
بە دەسەجڵەویەوەو زاڵ بوون بە ئاوزەنگیەوەیە.
لەچاو تروکانێکدا زۆربەی لەشکری ئەڵڵا قولیخانی لە ناوبردو بەرەو ئەو دنیای ئاودیوکردن و میرزا بەگی کەڵهوڕ ئەڵڵاقولیخانی بە سزای کردەوەی خۆی گەیاندو لەسەریدا. هەرکە خەبەری بە خوسرەوخان گەیشت زۆری لەبەر گران بوو، چونکەوەك نیوەیەتێکی مەشهوور دەڵێ « ئەو تامەی لە بەخشیندا هەیە لەتۆڵە سەندنەوەدانی یە »گەوەیی و لێ بووردن یەکێك بوولە سیفەتە بەرزەکانی. لەو کردەوەیەی میرزا بەگ

زۆرقارس و دڵگیر بوو. بە توندی سەرکۆنەی کردو گوێی راکێشا.
شایانی باسە پاشماوەی لەشکر زەنگەنەو کرماشان هەڵاتن و تۆپخانەو زەمبورە نەقارەخان و خەیمەو خەرگاو سەراپەردەیان سەرلە بەر، بەدەست لەشکری ئەردەڵان کەوت لەو شەڕەدا ئەردەڵانی‌یەکان سەرکەوتن.

پاش دوو سێ ڕۆژ دلاوەرانی ئەردەڵان لەشەکەتی‌و ماندوێتیی ڕێگا حەسانەوەو ڕوویان کردە کرماشان و بریاری ناوبردنی سەرکێش ویاخی‌یەکانی ئەو ئەو ناوچەو سنوورانەیان دا لە شوێنێك کە
قۆناخێ لەشارەوە دووربوو، حاجی عەلی خانی مامەی ئەڵڵا قولیخان کە بیو بە جێگری ئەو بەخت ڕوولێ وەرگێراوەو خۆی بە میراتگری دەزانی بە خەڵات وپێشکێشێکی شایانەوە پێشوازی لە خوسرەوخان کردو ملی بۆکەچ کردو بوو بە پیاوی. هەرچی‌یەکی لە ماڵ وسامان و پەزو ئاژەڵ و چوارێی لە کرماشان لە ئەڵلا قولیخان مابۆوە، بەسەر لە شکرەکری‌دا دابەش کرد. خوسرەو خان یەك قەرەپوولی بۆخوی لێ هەڵ نەگرت. حاجی عەلی خانیش حوکومەتی کرماشانی پێبەخشرا، بەلام تووی سەرکان و سەعدئابادو سەنقورو دینەوەر بەشێ کە بەشێ بوون لە قەڵەمڕەوی فەرمانرەوایی ئەڵلا قولیخان جیاکردەوەو بەسەر پیاو ماقوولان وسەرکردەکانی کوردستانی‌دا بەشی‌یەوە.

هەڵبەست

چو سایە بە ظل هما میکنی
بە یەك نظرت بس کیمیامیکنی

پاش ئەم سەرکەوتن و زاڵ بوونە گەرایەوە بۆ بارەگای فەرمانرەوایی. لەم کاتەدا بەشێ لە لەشکرەکەی عەلی موراد خان کە بڵاوەیان لێ کردبوو، گەیشتنە خزمەتی خوسرەوخان لە سای سێبەری پیرۆزی دا سرەوتیان گرت. هەر لەم سەردەمەدا بوو کە خاقانی بەهەشت هێلانە، ئاغا محەمەد خانی قاجار ئاڵای سەڵتەنەتی هەڵ کردو بریاری دا سەرلەبەری وڵاتی ئێران داگیرکا. جەعفەر خانی زەند لە بەرابەری ڕاوەستا بوو، لە ئەسفەهان حوکمرانی دەکرد، بەڵام خان سەبارەت بەوە کە ئاوازەی لێهاتوویی خانی قاجاری بیستبوو، ناچار لە ئەسفەهان هەڵات و ڕوی کردە ناوچەی شیرازو لەوێ سەربەندی کاروباری بەدەستەوەگرت.
بەڵام زۆری نەبرد، لەشکرێکی گەورەی خرکردەوە بریاری شەری داو سەرلەنوێ ڕووی کردەوە ناوچەی ئەسفەهان و عیراق، ئاغا محەمەد خانی قاجار هەرکە ئەم خەبەری لە شکرکێشیەی جەعفەر خانی بیست ئەسفەهانی بەجێ هێشت و لە ناوچەی ئەستراباد و مازەندەران جێگیر بوو و بەم جۆرە بێ شەڕ وشۆر دووبارە خانی زەند ئەسفەهانی داگیرکردووەو بە ناوی خۆیەوە پەرەی پێدا. پاش ماوەیێکی کەم داگیرکردنی عیراقی خستە ئەستۆی ئیسماعیل خانی زەندو ئاسایشیو ئەمنی ئەو ناوچەیەی بەرەوڕوو کردەوە. ئیسماعیل خانی زەند پاش ئەوەی گەیشتە هەمەدان ئاڵای یاخی بوونی هەڵ کردو لە فەرمانرەوایی جەعفەرخان سەرپێچی کرد. بەڵام بیستی جەعفەر خان بەتەواوی بریاری سەرکوت کردنی داوە هێشتا سێ قوناخیان لە نێوان دا مابوو بۆ شەر بەرەو گەرووس هەی پێی لێ کردو لە شکرەکەی لە سالی . . ۱۲ی ك دا بڵاوەیان لێ کرد. لەوسەروبەندەدا کە جەعفەرخان لە هەمەدان بوو محەمەد ڕەشید بەگی وەکیل دیسان نێوانیان لەگەڵ

خوســرەوخــان دا تێـك چووەو لەتـرسی خوسرەو خان خۆی دایە پەنای
. جەعفەرخانو هانی دا ناوچەی ئەردەڵان داگیرکا. جەعفەر خانیش بە
فیتی محەممەد رەشید بەگ چەپەرێکی بۆ سنە نارد داوای خوسرەو خانی
کرد، بە مل کەرچی بێ بۆلای ، بەڵام خوسرەو خان گوتی وەرامی ئەم
داوخوازەت لە مەیدانی شەڕدا دەدەمەوە.

پاش گەڕانــەوەی چەپــەرەکــە خوسرەوخان یەکــەر لەشکـری
کۆکــردەوە، بەرەنگــاری لەشکــری زەنـدیـە بوەستێ. عـەلی خانی
خەمســەیی و محـەمـەد ئەمین خانی گەرووسی بە لەشکـرێکی کەمـەوە
خۆیـان گەیـاندە لەشکرەکەی خوسرەو خان. کاتێ گەیشتنە سالح ئاباد
کە دێیـەکـەلە دێیەکانی هەمەدان ، محەممەد رەشید بەگ کە پێشرەوی
لەشکـری زنـدیـەکـان بوو، هەڵات و خۆی گەیـانـدە لەشکـرەکەی
جەعفـەر خانی زەنـد. بۆ سبـەینێ لەشکـری ئەردەڵان گەیشتە شاری
بەهـارو بەرانبـەر لەشکری زەندیەکان لەشکرگایان دامەزراند. پاش
شەکـەتی و مانـدوێتی رێگـاوبـان برێ حەسانەوەو ئەنجا خۆیان بۆشەڕ
ئامـادەکـرد. جەعفـەرخـان جەزایرچیەکانی فارسی کە لە دوو هەزار
کەس زۆرتــر بوون ،بەتۆپخانەو زەمبـــوورە کخـــانـــەوە لەپێش
لەشکـرەکـەیەوەی دامەزراندو کردنی بەقەڵغان و لەمپەر بۆ لەشکرەکەی
، خــۆیشی بە سوارەیـــەکی زۆرەوە پشت سەریـــانی گرت و دەستیـان
بەشـەڕکـرد. لەم شەڕەدا هەرکەسێ لە ئازایانی ئەردەڵان دەهـاتە کۆڕی
شەڕەوە وەرامی بەتـوپ وتفـەنـگ دەدرایەوە. بەڵام ئەوی راستی بێ
کەس لە شەرکـەرانی زەنـد نەدەهـاتـە مەیـدانی شەڕەوە. سێ ڕۆژیـان
بەوئـاوایـە بەســەربـرد ، تا چوارەم ڕۆژ، دلاوەرانی ئەردەڵان یەك دل،
وەك شێری دڕان بەڕیچدا بردوو پلینگی تووڕە هاتنە مەیدانی شەڕەوە و

به جاری دەستیان لە گیانی خۆیان شوشت و بەسەر ئەوەدریای ئاگرەدا پەرینەوەو لە یەکەم هەڵمەتدا تۆپخانەو زەمبورەك خانەی دژمنیان داگیرکرد. سەری زۆربەی جەزایرچی وتۆپ تەقێنەکان لە لەشیان جیاکردوەو خۆیان گەیاندە ناوجەرگەی لەشکری دژمن. جەعفەر خان بە بینینی ئازایەتی‌و دلێریی شێرانی کوردستان هەڵات و تا دەوروبەری شیراز خۆی نەگرتەوە. خوسرەوخان دەستی لێ‌نەکێشانەوە، خان ئەحمەد خانی کورەگەورەی خۆی بە دووخستن، هێرشی بردەسەر پاشماوەی لەشکرەکەیان و دەستی کرد بە کوشتارو بەدیل گرتنیان.

شیعر

ز خون یلان در صف کارزار
شد آورد که غیرت نوبهار
ز تیغ یلان بس سران کشته شد
ز کشته بهر سوی صد پشته شد
چو شیر غران همچو شرزه پلنگ
یلان سنندج مظفر بجنگ

خوسرەوی ناودار پاش ئەم سەرکەوتنە هەموو خێوەت و خەرگاو تۆپخانەو زەمبورەکخانەی زەندیەکانی سەرلەبەر داگیرکردو زۆربەی سەرکردەکانی فارس و زەند لەم شەڕەدا کوژران و بەدیل گیران و ئەسپ و چەك و ئەسلەحەیان تێکرا کەوتە دەست لەشکری سەرکەوتووی ئەردەڵان. پاش ئەم سەرکەوتنە گەورەو پیرۆزە خوسرەو خان دوو سێ ڕۆژێ لە شاری هەمەدان مایەوەو هەرچییەکی لەو شەڕەدا وەگیرکەوتبوو بەسەر سەربازە دلێرەکانی‌دا بەشی‌یەوە. محەمەد ڕەشید بەگی وەکیلیشی کە حەوت سالی ڕەبەق بوو لە دژی

خوســـرەوخـان جوولابـوّوەو لەسـەر ئەمـە لە ولات دوورکـەوتبـوّوە، بەخشی و وەك جاران بوّوە بە جێی ڕووخوٚشی و نازکێشران و پلەوپایەی بەرزیشی پی بەخشی. محەمەد رەشید بەگی وەکیل هەرکە گەیشتە سنە کوٚشکی وەکیلی بە کوٚمـەگی ئەنـدازیاران وەك جاران پوٚشتەو پەرداخت کردەوە. خوٚلاسـەی قسـە، ئەو خوسـرەوی بی‌هـاوتایە، پاش فراندنی جەعفـەر خان ئالای سـەرکەوتنی بەسەر ناوچەکانی برووجەردو کەزازو فەراهـــان و گولپـــایـــەگـان و هێنـدێ لە خاکی عیـراق دا شەکاندەوەو سەرلەبەری داگیـرکردن و ئەنجا کەوتە سەر کەلکەلەی داگیرکردنی ئەسفـــەهـــان. هەر بەم نیـــازەوە چوو، کەنـــدمـانی بە پایگـەی خوٚی هەلبـژاردو خەرگای لی‌دامەزراندو لەوێ هێوری. لێرە، لەم شوێنەدا، میـرزا ئەحمـەدی وەزیـر بە خزمـەتی ئەو خوسـرەوی رەچـەلەك بلیندە گەیشت و رای گەیاندێ، گوتی، ئێستا کە ناوچەی عیراق و قەلەمرەوی کرمـاشان و خوزستان و لورستان کە لەشکری سەرکەوتووتان داگیری کردوون و فەرمانرەوایەکی ئەوتوٚ لە خاکی ئێران دا بە سەر پێوە نەماوە، چاك ئەوەیـە، جاری شاهێتیی خوٚتـان بدەن و بە نووسیـارەکانتان فەرمـان بفەرموون، ئەم فەرمانە لە سەرانسەری ولات دا بلاو بکەنەوە. ئیتـــر لەمـــەوپـاش پوول و دراو بە ناوی خوٚتـانـەوە لی‌بـدرێ و مەلای مزگـــەوت خودبسە بە ناوی خوٚتـــانـەوە بخـوێنێ و تەپلی شاهێتیتـان لە سەرتاسەری ئێران دا دەنگە بداتەوە.

خوســـرەوخان هەرکـــە ئەمـــەی لە وەزیـــر بیست نوقمی دەریـای بیرکردنەوە بوو. دوای پشوویێك سەری هەلبری گوتی ئاشکرایە ئێستا هەمـوو خاکی ئیـرانمـان لە ژیـر دەسەلاتدایەو درکیکمان لەسەر ری نەماوەو هیچ سەرکیش و یاخی یەکمان بەسەر پیوە نەهێشتووە ئەوەی

دوازده هەزار کەسێ دەبوون، بەگەڵ کەوتن و هەڵی کردە سەر قەڵای کرماشان و حاجی عەلی خانی حاکمی کرماشان کە نەونەمامی دۆستایەتیی خوسرەوخان بوو، گەمارۆدا. حاکمی کرماشان چونکە توانستی بەرەنگاربوونی لە خۆیدا شك نەدەبرد و بەخۆیدا رانەدەپەرموو، هەستا رووداوەکەی بە نامەیێ لە خوسرەوخان راگەیاند، خوسرەوخانیش هەر یەکسەر چەپەرێکی بۆلای ئیسماعیل خان نارد، داوای لێ کرد، دەست لە گەمارۆدانی قەڵای کرماشان هەڵگرێ و مافی نانونمەك و چاکەی نێوانیانی بە بیر هێنایەوە، بەڵام ئەو نانکوێرە سپڵەیە گوێی بە ئامۆژگارییەکانی نەداو بە هەموو توانێکیەوە دەیویست قەڵاکە بگرێ. هەرکە چەپەرەکە گەرایەوەو خوسرەو خان لە راستیی رووداوەکە گەیشت، ئاگری توورەیی بەجارێ بڵێسەی سەند. لە مانگی رەمەزانی ساڵی ١٢٠١ی ك دا بۆ تەمێ و گوێ راکێشانی ئەو یاخییە بە خەڵکێکی کەمەوە رووی لە کرماشان کردو زۆری نەبرد ئاڵای سەرکەوتنی بەسەردا شەکاندەوە. هەرکە ئیسماعیل خان بەم خەبەرەی زانی دەستی لە گەمارۆدانەکە هەڵ گرت و پەنای وەبەر چیای بێستوون برد. حاجی عەلی خانیش بە دەست و دیارییەکی زۆرەوە بە پیریی خوسرەو خانەوە چوو و لە خزمەتیدا هاتن بۆ کرماشان. پاش پشوو و حەسانەوە، ئەو میرەکین لە دڵە کرماشانی بەجێ هێشت و رووی کردە لەشکرەکەی ئیسماعیل خان. ئیسماعیل خانیش خۆی لێ بواردن و قوناخێ پاشە کشێی لێ کرد. بەڵام خوسرەو خان دەستی لێ هەڵ نەگرت و قوناخ بە قوناخ هەر بەدووایەوە بوو، تا گەیاندیە ناوچەی سەر بەندی سیلاخور. ئیتر لەم شوێنەدا هەردوو لەشکرەکە تێکگیران و بە یەکیاندا دا. شێرانی پرتوانی هەردوو لە شکر

دەم لە دژمنـــایـەتـی ئێمـە دەدا ، دەبێ کێ بێ؟ لە هەمـوو شوێنێ پشت بەخـودای دادوەر و توانی بازووی دلێـرانی ئازامان سەرکەوتووین بەڵام ڕۆژ ڕۆژی لەدووە، خودا فەرمـانـڕەوایی کوردستـانمان بۆ بێڵێ پێ لە بەرەی خۆ پتـر ڕانـاکێشین و ئەو نانەی لەباوو باپیرمەوم بۆ ماوەتەوە نای برم و دەسکـەوتی حەوت ساڵـەمـان هەروا بە فیـرۆ نادۆڕێنم . هـەر بۆ سبـەینێ ئەو شەوە بڕیـاری دا بۆ سنـە بگەڕێتەوە . بەناوی دۆستایەتیو خۆشەو یستیەکی دەگەڵ محەمەد حەسەن خانی قاجاری دا هەیبوو، نامەیێکی بۆ ئاغا محەمەد خانی قاجار نارد، ئەو ئەیالەتانەی گرتبوونی، بە پیاوەکانی ئاغا محەممەد خانی قاجاری سپاردن .

دەڵێن ، مـەهـدی بەگی شقـاقی کە یەکێ لە کەڵـە شاعیـرانی زمـان پاراوی ئەو سەردەمـــە بوو ، سـەرکـەوتن نامـەیێکی بۆخـوسـرەوخـانی هۆنیـــوەتـەوەو بۆ خوسـرەوخـانی خوێنـدووەتـەوە . خـوسـرەو خانیش لەیادداشت دا سێ توغـرا بەراتی ـ یەکێکیـان ( ٤٠ )تمـەن و دوومیان ( ٥٠ )تمـەن و سێـیـەمیـان . ٦٠تمـەن دەبێ، دێنێـە خزمەت، کێهەیانی ئارەزوو فەرمـوو بۆی مۆرکـاو بیکـا بە خەڵاتی، بەڵام ئەو خوسـرەوی حاتـــەمـــە هەر سێ توغـرا بەراتـەکـەی بۆ مۆرکـردو لە کیسـەی خۆی پێیـبـەخشی . لە پێشـدا وا بڵاوبـۆووە کە ئیسمـاعیل خان لە لەشکری جەعفـــەر خانی زەنـد هەڵاتـووەو بە سیپـاڵ و گوێنی دەروێشی‌یـەوە لە ناوچەی گەڕووس دەخولێتەوە . خوسرەو خان هیمەتی بەرزی نواند ، خەڵاتێکی زۆری ، لە چادر و ئەسپ و ئیلچـە پێبـەخشیو خەڵکێکی زۆری لە دووخست و ئیـــزنی دا بۆ وڵاتی خۆی بگـەڕێتـەوە . بەڵام لە گەڕانەوەدا ، خەڵکێکی زۆری لە هەرچیو پەرچیو ئەوباشو قزڵباش و هۆزەکانی کرماشان و لوڕستان و بەختیاری لە تیرەکانی دیکـەکەنزیکەی

بۆ ئازایەتی نواندن، مەچەکی دلێری یان لێ هەڵماڵی و هوزەبرانی ئەردەلان هەڵیان کردە سەر دژمن و ئاگری شەڕ لەنێوان هەردوو لەشکردا خۆش بوو. هێندێ لە خاك و خوێنی خۆیان دا گەوزین و برێ بەرەو دنیای نەمان چوون ،بە شێکی زۆری لەشکرەکەی ئیسماعیل خان لە هەڵمەت بردن وکشانەوەدا بەدیلگیران و بەشێکی زۆری تریشیان لە گەرمەی شەڕدا کوژران. شنەی سەرکەوتن ئالای خوسرەو خانی بێ هاوتای شەکاندەوەو خێوەت وخەرگاو سەروەت و سامانی ئیسماعیل خان سەرپاکی کەوتە دەست سوپای سەرکەوتووی ئەردەلان . دەگێرنەوە: ئەو دەسکەوتەی لە لەشکرەکەی ئیسماعیل خان وەگیر باپیرم کەوتبوو (باپیرەی مەستوورەخانم ـ وەرگێر)زۆر لە خۆی بەزیاتر دیت لەبەر ئەوە؛ بردیە خزمەتی خوسرەوخان ،بەڵام ئەو فەرمانرەوا دادگەرە، بەوهیممەتە حاتەمی یەوەی کە هەی بوو، توخنی هیچی نەکەوت و سەرلەبەری بەرموروروی خۆی کردەوە ،تەنانەت ئاوێنەیێکی گرانبایی زۆر نایاب لەو دەسکەوتە تا ئێستا بەموفەرك لە بنەماڵەی ئێمەدا هەر ماوەتەوە.

خوسرەوخانیش لە پاداشتی ئەو هەموو ئازایەتی و لەخۆبوردن و دلسۆزی یەی ، کەڵەمێردو گەرناسانی ئەردەلان لەو شەڕەدا نواندبوویان، چەند کەسێکی کرد بە بەرپرسیاری ئەو ناوچە داگیرکراوانە. بە نموونە ناوچەی تووی سەرکانی بە میرزا فەتحەڵڵای کوڕی میرزا عەبدوڵڵای وەزیر کە لاوێکی خاوەن ڕاوتەدبیر و شیر بووو لە قسەزانی و دەم وپل پاراوی دا هاودەم و هاوتای حەسان بووو لە حەزم و جەزم دا زۆر بەناوبانگە بوو. هەرلەو ساڵەدا ئاغا محەمەد خانی قاجار کە شاریارێکی خاوەن دەسەلات و بەشان وشکۆبوو،

کەڵکـــەڵـەی داگیـرکـردنی ئەیـالـەتی کوردستـان و بەدیـدارگـەیشتنی خوسـرەوخـانی کەوتـە سەر و بە لەشکـرێکی گەورەوگرانەوە چووە ناو شاری هەمـەدانـەوەو ئەوێی کرد بە پایگـای خۆی . چـەپەرێکی نارد لە دووای خوسرەوخان ، بێت بۆ هەمەدان . خوسرەو خانیش شاری سنەی بەجێ‌هێشت و لە وەرامی ئاغـا محـەمەد خان دا عوزری بۆ هێنایەوە کە ناتـوانێ بگـاتــە خزمـەتی . لە ساڵی ١٢٠٤ی ك دا لە لایـەن خوداوە خوســرەو خان تووشی نەخـۆشیی پەرکـەم و چەنـد نەخـۆشی‌یـەکی تر هات . سەرەرای هەمـــوو چارەســەرکــردنێ لەلایــەن پزیـشکـــانی ئەفـلاتـوون ئاســاو حەکیمـانی ئەرستۆهونەرە ، نەخۆشی‌یەکانی رۆژ لە دوای رۆژ زیاتریان تەشەنە دەکردو لە چارەسەر کردن بەدەربوون .

هەڵبەست

از قضا اسکنگبین صفرا فزود

روغن بادام خشکی مینمود

لەم سەروەختەدا خان ئەحمەد خانی کورە گەورەی خوسرەو خان کە لە ئاسمانی ئەیالەت دا ئەستێرەیێکی پرشنگدارو لە عومانی گەورەیی و سەرداری‌دا گەوهەرێکی درەخشان بوو، پەرژایە سەر جێگریی باوکی و بەرێـوەبـردنی کاروبـاری فەرمـانرەوایی لە ئەستۆگرت و رێ‌ورەسمی دادگەریی لەم رووەوە بە چاکی‌و لێزانی بەجێ‌دە هێناو تەپڵی نێو بە چاکە رۆیشتنی دەنگی دایـەوەو وڵات و خەڵکی وڵات لەســای بەزەیەوە شادو ئاســـودە بوون . بەرێـــکـــەوت هۆزی بلباس لەو سەردەمــــەدا بە جم وجووڵ کەوتبوون . لە ناوچەی یاشماق و تیلەکۆ خەریکی تاڵان و برۆبوون . ئەمـەیش لەگـەڵ غیرەتی ئەحمەد خان دا کە لە مەردایەتی‌دا تاك و لەدلێری‌دا یەکـە پیـاوی دنیـا بوو، نەگونجاو زۆری لەبەر گران

بوو، فەرمانی دا لەشکر ئامادە بکری. هێشتا شتێکی ئەوتۆ لە سوپا فەراهەم نەکرا بوو، لە ویلاتەوە بە نیازی تەمێ و گوێڕاکێشانی ئەو قەومە بەدناکامە بەڕێ‌کەوت و لەسالار و هۆباتو تووشیان هات و دەست بەشەڕ کرا.

پاش تەیاربووون و خۆئامادە کردن، هەڵیان کردە سەر یەکتر. لەشکری ئەردەڵان لە یەکەم هێرشدا بلباسی خودانەناسیان ناچار بەپاشەکشێ کردو هەڵیان فراندن، بەڵام لە هێرش بردن و کشانەوەدا خان ئەحمەد خان چەرخی چەپگەردی لێ‌وەدەست هات و بەر گوللەیێک کەوت و، کوژراو لەهەرەتی لاوی‌دا گیانی بە پەروەردگار سپارد. دەگێرنەوە: کە ئەللاوێردی خانی کوڕی نەزەر عەلی خان، کە کوڕی گەورەی سوبحان وێردی خانی والی بوو، بە دەست ئەو کوژراوەو ئەم کارە نارەوایە لەو وەشاوەتەوە. خودا بۆ خۆی چاتری دەزانێ.

هۆزی بەدناکامی بلباس هەرکە لەشکرەکەیان بێ سەروەر مایەوە، گەڕانەوە، هەڵیان کردە سەر، ئازایانی ئەردەڵان و زۆریان لێ بلاوە پێ کردن. میر ئەسلان[٥١] خانی کوڕی ڕەزا قولیخان کە ئەم بارودۆخەی دیت، دەماری پیاوەتیی بزووت و لەتەك محەمەد ڕەشید بەگی وەکیل و دەست و پێوەندانی‌دا شیری ڕکیان لە کالان دەرکێشاو بریاری شەڕیان دا. هەر لە هەوەڵ هێرش دا هێزی بلباس دووبارە شکان و هەلاتن و زۆریان لە مەودای شیری براو ئاوداری کەلەدلاوەران کێشران و تا نزیك سەقزو سیاکۆیان ڕاوەدوونان و سەروەت و سامانیان. سەرلەبەر، چەپاودان.

وێرای ئەوەی کە سەرداری سوپای ئەردەڵان کوژراو دلێران بێ

سەردارو خاوەن دەسەلات، کزبوون، دلاوەرانی ئەردەلان بۆ تۆڵەکردنەوەی کوژرانی لەناهەقی ئەو نەوجوانە هێندەی دیکەیان وەفاداری نواندو گوێی پیاوەتیو ئازایەتییان بردەوە. بە نموونە: میرزا لوتفوللای کوڕی میرزا عەبدوللای وەزیر کە مامی ڕاستەقینەی دایکی ئەم کەمینەیەیە، لەو شەڕەدا حەقدە کەسی لەسەر زینی ئەسپ گلاندو لە خوێنی خۆیانیدا گەوزاندن و بەم ڕەنگە ئازایەتیو مەردایەتیی خۆی ئیسپات کرد.

پاش ئەم سەرکەوتنە شەرکەرانی سنە تەرمی سەردارەکەیان هەڵ گرت و بەرەو سنە گەڕانەوەو لەوێ چەند ڕۆژێ پرسەیان بۆ گرت. لەبەر ئەوەی نەخۆشییەکەی خوسرەو خان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتری تەشەنە دەکرد بەداخەوە پزیشکەکان لە چارەسەرکردنی دامان، لوتف عەلی خان بە فەرمانی ئاغا محەمەدخان هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی.

## ...وست عەلی خانی کوڕی
## ...وبحان وێری خـان

لوتف عەلی خان لە سالی ٥ . ١٢ ی ك دا، بەبێ ھیچ نەرك و تێکۆشانێ بووکی فەرمـانـڕەوییی لە ھامێـزگرت . خەڵکی وڵات لەسای دلاوایی و بەزەی سەرئـاسـوودەو ڕەحـەت حاوانـەوە . لوتف عەلی خان میـرێکی تەواو خوێـنـــدەوار بوو، ئازایـەکـی شێـر دڵ بوو . لە زار پـــاراوی و قـسـەسواری بێ‌ھاوتاو لە ئازایەتی و گەڕناسی‌دا بێ‌وێنە بوو . کار وباری وڵاتـەکـەی بەوپـەڕی دادپـەروەری یـەوە بەرێـوە دەبرد . یاساو پیرۆزی حوکمـرانیی ھەر لەسـەر داوودەستـووری باووبـاپیرانی بەجێ‌دەھێنا . لەسـەرەتـای حوکمرانی یەوەی حەسەن عەلی خانی کوڕە گەورەی ، بە بارمتـە لەکن ئاغا محەمەد خانی قاجار دانا لەم سەردەمەدا خوسرەوخان وەك گوتمان دنیای ڕوونی بەجێ ھێشت . (اناللە وانا الیە راجعون) .

شیعر

دریغا ازآن خوسرو پرھنر

شبەش نیاوردە مادر دگر

دریغا ازآن میر قاآن روش

کە با دادو دین بود و با رأی وھش

بەکوردی :

حەیفێ بۆ ئەو خوسرەوە بەھونەرە

کەوێنەی نەھێناوە دایکێکی تر

درێغ بۆ ئەو ڕەوشت قائانە

کەلەگەڵ دادو دین بووو لەگەڵ ڕاو عەقڵ و ھۆش دا

مەرگی خوسرەوخانی [٥٨] ئەردەڵان، بوو بە هۆی سەربە خۆیی لوتف عەلی خـان لە کاروبـاری فەرمانرەوایی دا چون لەسـالی ١٢٠٦ك دا، فەرمانرەوایانی ئەیالەتی خوزستان ئالآیان لە دژ دەرباری فەرمانرەوایی قاجـاری یـەکـان هەڵ کردو دەسیـان بەسەربزیوی کردو ناوچەکەیان بە تەواوی خستـە گیـژاوی ئاژاوەوە. بەخواستی ئاغا محەمەد خانی قاجار لوتف عەلی خان بوگوی ڕاگیشـانی خەڵکی ناوچـەکـە ڕاسپـێردرا. جەنابی خانیش بە نیازی جیبەجی کردنی ئەم ڕاسپاردەیە سێ هەزار کەسـی [٥٩] لە شەرکـەرانـی ئەردەڵان وەدووخـوی داو لە ڕێـگـای کرمـاشـان و لورستانەوە رووی لەو ناوچەیە کرد ولەشکری کرماشان و لورستانیشی بەگەڵ کەوتن. فەرمانروایانی خوزستانیش هەرکە بەمەیان زانی لەتـرسـان لەرزیـان لیهات و بیهیچ تیککگرانی سەرلەبەریان مل کەچ بوون و بە عوزرخـوازییـەوە داوای لی بوردنیـان کردو هەرچی خەرج و باجیکی لەسـەریـان بوو، سەرلـەبـەریـان هینایە پیش لوتف عەلی خان و ئەنجـا بە خەلاتیکی زۆر و دیارییەکی زۆرەوە بەرەو دەربـاری قاجـار ڕۆیشـتن. لوتف عەلی خان پاش داگیـرکـردنی خوزستـان هەر لە سەرەتـای زستانەوە تا سەرەتای بەهار لەوناوە مایەوە. بۆ ڕیـك خستنـەوەی باری شیـواوی ئەو ناوچـانـە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دا. لـوتـف عەلی خان زنجیـری مل کەچیی لە ملی هەمـوو یاخییان کردو خەڵکی کوردستانیش لەو ماوەیەدا دەسکەوتیکی زۆریان دەس کەوت.

بەنمـونـە: باپیـرەگـەورەم کە دەرامـەتی عەباس قولیخان ووالیی شوشتەری پیسپیردرابوو، هەزار تمەنی وەگیرکەوت.

هەر لەم ماوەیـەدا ئەحمـەد سولتـان، حاکمی بانەو بری لە بەگزادەو

سانــانــی هەورامــان و خەڵــکی مەریــوان یەکیــان گرت و ئاڵای سەربزێوی‌یان تەواو هەڵ کرد. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ پاشای بابانیشدا دەستیــان تێکــەڵ کردو سەرسنــوورەکــانی ئەو ناوچــانــەیــان تێــك داو دەســــدرێــــژیو تاڵان وبــرۆیــان لە ئەنــدازەبــەدەر کردو بە جاری یاخی‌بــوون. ئەم خەبــەرە کاتێ گەیشتــە لوتف عەلی خان ئاگــری تووڕەیی بڵێســەی سەنــدو بەو سەرمــاو سوڵــەو باوبــۆرانە رووی کردە بانــەو یاخی‌یــەکانی ئەو ناوچەیەی دامرکاندەوە، بەڵام کاتێ لوتف عەلی خان گەیشتــە قزڵجە دانیشتووانی مەریوان، ئەو شوێنانەی لە سەردەمی بابــانــەکان دا نەختێ ئاوا بیوەوە، بەجێ‌هێشت و چوون بۆ شارەزوورو لەوێ خۆیان حەشاردا، بەڵام لەپاشان لە مەرکەزی ئەیالەتەوە فەرمانی ماڵــــوتــانــدن و تاڵان کردنیــان دەرچــوو. ماڵ و سامــانیــان ئاگــرو سووتمانێکی وایان تێ‌بەردرا دڵێ گەردوونی هەڵ دەقرچاند.

ئەحمــەد سوڵتــانی بانــەیش ترس و سامێکی وای چووە دڵەوە، هەر هێنــدەی پێ‌کــرا، نــاچــار رووی لە لوتف عەلی خان وەرگێــراو خۆی گەیــانــدە ناو هۆزی بڵبــاس. لوتف عەلی خان فەتــح عەلی ئامــۆزای ئەحمەد سوڵتانی بانەی بە خەڵاتێکی زۆرەوە کرد بە حاکمی بانە. پاش ئەوەی کاروبــاری ناوچــەی بانــەو هەورامانی سان داو رێکی‌خستەوە، یەکێکی نارد بۆ کن عەبدورەحمان پاشای بابان، ئەو ناوچانەی وەختی خۆی لەقــەڵــەمــرەوی ئەردەڵانی داگیــرکــردبــوون، بــۆ بگــەرێنێتەوە. عەبــدورەحمــان پاشــایش یەکســەر بی‌چــەنــدوچــۆن، ئەو ناوچــانەی سەرلــەبــەر بۆ گەڕانــدە دوواوەو زۆریشــی عوزر بۆهێنــایەوە، بەڵام ئەم نێــوان کوکی‌یــە زۆری نەخــایــاند، عەورەحمــان پاشــا سنــووری داوودەستــووری دراوسێ یەتیی بەزانــدو سەرلــەنوێ ئاڵای دژمنایەتیی

لێ هەڵ کردەوە. لوتف عەلی خانی والیش پەزو ماڵاتی خەڵکی ناوچەی شارەزووری لەچوونە کوێستانەکانی سنە قەدەغەکرد. ئەم پەزو رانانە وەختی خۆی بەهاران و هاوینان دەچوونە کوێستانانی سنە، بەڵام ئەو ساڵە کەس،نە یتوانی پێ باوێتە ئەو کوێستانەو لە ترسی لوتف عەلی خان سنوور تێنەپەرین، هەر لە شارەزوور مانەوەو زۆریان لە تاو گرەو گەرماو وشك و برنگیی ناوچەکە مردن و ئەوەیشی مایەوە بەهەزار ئەم لاو ئەولاو، بلاوەیان لێ کرد. دوو صەت بنەماڵەیەك نەبێ کە لەگەڵ بنەماڵە گەورەکانی ئەردەلان دا رێك بوون و بە دزیی والییەوە گەرانەوە بۆ ئیلاخەکانی تریان و پەزو مەرو ماڵاتی خزم وکەس و کارەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دا هێنابوو. بەلام هەرکە ئەم خەبەرە بەرگوێی لوتف عەلی خان کەوتەوە، فەرمانی بە محەمەد بەگی کوری مەنوچەر بەگی ئەردەلانی دا لە ناوکاو هەڵکاتە سەریان و بە مەرو ماڵاتەوە کۆچیان داو لە دەوروبەری سنە دایان مە زرێنێ.

جەنابی لوتف عەلی خانی والی لە مانگی ربیع الثاني ساڵی ١٢٠٩ی ك دا تووشی نەخۆشییەکی ناگەهان هات و کۆچی دوایی کرد.

# حەسەن عەلی خان

هەرکە خەبەری مەرگی لوتف عەلی خان بە ئاغا محەمەدخانی قاجار گەیشت، حەسەن خانی کورە گەورەی کە لە تاران بوو بانگە کرد وپاش بەرسەرچوونی پرسەو پرسەکاری، کردی بە فەرمانرەوای سنە.

حەسەن عەلی خان هەرکە گەیشتە سنەو لەسەر تەختی فەرمانرەوایی باوو باپیرانی دانیشت، زۆلموزۆرو دەسدرێژیی لەسەر خەڵك دوورخستەوە. حەسەن عەلی خان بەراستی میرێکی ئازاو لێهاتوو بووو دلێرێکی خاوەن شیرو بەشان و شکۆ بوو. زۆربەی کاتی خۆی بە خوداناسی یەوە رادەبواردو زۆریشی حەز لە راووشکار دەکردو وەختێکی زۆری پێوە بەسەردەبرد. پێنەو پەرۆکردنی ئەیالەت و بەرێوەبردنی کاروباری خەڵکی ئەیالەتەکەی لە ئەستۆی محەمەد رەشید بەگی وەکیل خستبوو.

لە ساڵی ١٢١١ی ك دا شەری شووشێ روویدا. حەسەن عەلی خان لەتەك سوارەی کوردستان دا، لەم شەرەدا هاوبەش بوو. پاش رووداوی کوژرانی ئاغا محەمەد خانی قاجار، حەسەن عەلی خان لە شەرێکدا بەر گوللەی قەلاّداران کەوت. ئەمانوڵلا خانی کوری خودالی خۆشبوو خوسرەو خان و سوبحان وێردی خانی کوری محەمەد موئمین، دەرفەتیان هێنا، لەگەڵ برێ لە گەورەو بنەماڵەکانی ئەردەلانی یان دا رێك کەوتن و بە نیازی فەرمانرەوایی دەسکەوتنەوە،

خۆیـان گەیـانـدە سنـە، بەڵام محەمەد رەشید بەگی وەکیل کە زۆریش نەخـۆش بوو، لەدژیـان وەستـاو ریگـای سەر بـەخـۆیی لێ گرتن و ئەوانیش ناچـار لە عوزرهێنـانـەوە زێتـر هیچیان بۆ نەمایەوەو بێ بەهیچ ئامـانـج گەیشتنێ روویـان لە ناوچـەی مەریـوان کرد. دوای یەك دوو رۆژێ، بەرەو سەقز هاتن. لەم سەروکاتەدا حەسەن عەلی خان گەیشتە ئەیـالـەتی سنـەو بە چارەسـەرکـردنی نەخۆشییەکەوەی خەریك بوون. ئەمانوڵلا خان و سوبحان وێردی خان نوێنەرێکی زمان لووسیان نارد بۆ لای عەبدورەحمان پاشای بابان، داوای یارمەتیو کۆمەگیان لێ کرد. عەبـدرەحمـان پاشایش کۆمەڵێ خەڵکی بە سەرۆکایەتیی سەلیم بەگی برایـەوە، بۆیارمـەتی ناردن و بە نیـازی داگیـرکردنی ئەیالەتی ئەردەلان بەرێکـەوتن. هەرکـە لەشکـرەکەیان گەیشتە مەریوان، حەسەن عەلی خان و محـەمـەد رەشیـد بەگی وەکیـل، کۆچیـان بە خەڵکی سنـە کردو روویـان لە ماهیدەشت و مەیـانەدەربەندو کرماشان کردو لەو شوێنەوە چەپـەرێکیـان کە لە رەوت و تەکان دا لە بریسکە تیژرەوتر بوو، نارد بۆ کن والیی بەغـدا. خەبـەری لەشکـرکێشیی بابـانیـان لە والیی بەغـدا راگـەیـانـد. لەسەرێکی دیکەوە مەلا محەمەد شەریفی قازییان نارد بۆ سەلیم بەگی بابـان و داوایـان لێ کرد، بیری بکاتەوەو نەختێ راوەستێ، تا لە لایـەن والیی بەغـداوە نامـەیێ، وەڵامێکیـان دەگاتێ. والیی بەغدا هەڵکـوتـانـە سەر ناوچەی سنەی بەدڵ نەبوو، بە پەلە لە عەبدورەحمان پاشـای بابـانی راگـەیـانـد، نەچێتە یارمەتیی ئەمانوڵلا خان و سوبحان وێـردی خانـەوە. عەبـدورەحمـان پاشایش لە دوای سەلیم بەگی برای نارد، بگـەرێتـەوە، خانەکانی ئەردەلانیش گەرانەوە بۆ سەقز. پاش ئەم رووداوە ئەمـانـوڵـلا خان خۆی چوو بۆ سلێمانیو داوای کۆمەگی لە

پاشـای بابـان کرد، عەبـدورەحمـان پاشـای بابان لەنووکەوە چیرۆکی ئەوەی بۆ گێـرایـەوە کە والیی بەغـدا بە چوونـە سەر ئەیالەتی سنە رازی نی‌یەو عوزرێکی زۆری بۆ هێنایەوە. ئەمانوڵلا خانیش ناچار گەڕایەوە بۆ جێگای خۆی‌و رووداوەکەی وەکو خۆی بۆ هاوالانی گێرایەوەو ئەنجا رۆیشت بۆ تاران. سوبحـان وێـردی خان و خانەکانی دیکەیش داوای لێبوردنیان لە حەسەن عەلی خان کردو بە رەزای ئەو گەڕانەوە بۆ سنە.

هەرکـە ئەمـانـوڵـلا خان گەیشتـە تاران، فەتـح عەلی شای قاجـار، کە جێ‌گری مامی تاجداری بوو، ناوچەی ئەسفەندئابادی لە ئەیالەتی سنە پێ‌بـەخشی. ئەمـانـوڵلا خان لەگەڵ داروودەستەکەی‌دا لەوێ مایەوە، تا ناووبـانگی دەرکـرد. زۆری پێ‌نـەچـوو، بە فیتی فەتـح عەلی بەگ و ئەحمەدبەگ و نەسـرولـلا بەگ و کورانی محـەمەد رەشید بەگی وەکیل لەتـەك برێ لە پیـاوماقوولان و ناودارانی ئەردەلان دا چوون بۆ تاران و سکـالاو گازنێکی زۆریـان لە کردەوەو رەفتـاری حەسـەن عەلی خان لە لای شای قاجـار کردو داوای کۆمەگ و یارمەتی‌یان لێ کرد. سەرەنجام لە لایـەن دەربـاری قاجـارەوە داوای حەسـەن عەلی خان کرا. بێتـە حوزوور. کاتێ حازربـوو، لەگـەڵ محـەمـەد رەشیـد بەگ و محەمەد رەحیـم بەگی کوری میهـر عەلی سوڵتـان و نەزەر عەلی بەگ لە مالی بەگلەر بەگی تاران دا، فەرمـانی زینـدان کردنیـان دراو ئەیالەتی سنە بە ئەمانوڵلا خان سپێردرا.

# ئەمانو ئڵلاخان

لە مانگی رەجەبی ساڵی ١٢١٤ی ك دا كوڕی هەڵكەوتووی خوسرەو خانی دەوران و كوڕە بەنرخ و خۆشەویستی بنەماڵەی ئەردەلأن هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی باووبا پیرانی. كورسی حوكمڕانیی بە بوونی سەخاوەت و زینەت و ئەریكەی دەسەلأتی بەختەوەری پڕلەجوانیو فەڕ رازایەوە. بە فەڕی هاتنی بەهار تەڕو پاراوتر بۆوەو بە پێو قەدەمی موبارەكی خونچەی ژین بە پێكەنین دەمی كردەوەو دادگەریو بیروڕاراستیو شان و شەوكەت بەرزیی ئاشكرا بوو.

هەڵبەست

جهان خرم دگر از سر گرفت
ز لطفش زمین رنگه دیگر گرفت
بهار أيالت زنو تازه شد
فزون عشرت از وهم وا ندازه شد

بەكوردی:
دنیا خۆشییەكی تازەی بەخۆیەوە گرت،
زەوی لە لوتفی، ڕەنگێكی دیكەی بەخۆیەوە گرت،
بەهاری ئەیالەت سەرلەنوێ تازە بووە،
گوزەران هێند خۆش بوو لە خەیاڵ و ئەندازە چووەدەر.

. رای روونی خەیاڵ وبیری، ئەفلاتوون وئەرەستۆ نەخۆش و
زەبوون، بەبیری جیهان پەیرای، فەزلی بوزرگمهر وبوقرات سووك،
میرێکی ئەوتۆ، لەگەڵ شاریارانی تاجداردا دەمی لە هاوسەری و خاوەن
تەدبیری دەداو خاوەنڕاوتەدبیرێکی ئەوتۆ، لەگەڵ خوسرەوانی کام کاردا
لافی لە یەکسانی دەدا تاك:

جهان آفرین تاجهان آفرید
چواو شهسواری نیامد پدید
بەکوردی:
خودای جیهان دروست کەر تاجیهانی دروست کرد
شاسوارێکی وەکو وی پەیدانەبوو

لەدلاوایی هاوشانی حاتەمی تەی و لە هونەرو ئازایەتی دا
هاودەستەجلەوبوون. خاوەن بەهرەو زانست و فەزڵ و کەماڵی بە هونەری
خۆش دەویست زۆربەی کاتی بە تازەکردنەوەی خانووبەرە دروست
کردنی بینای جوان جوان[١٦٠] بە سەردەبرد. تاوانباری سزا
دەداو درێغی کەری تەمێ دەکرد. لە شان و شەوکەت و حوکمرانی دا
شانی لە شانی خوسرەوی پەرویز دەداو لە سام و هەڵمەت دا وەك
ئەفراسیاوی خوێنرێژوا بوو. مووچەی ساڵیانەی سادات و زاناو
خاوەن بەهرەو ئیمامزادەگانی گەیاندە چل هەزار تمەن.

تاك:
تعالی الله ای میر باداد وفر
همیدون بە جنت گزیدن مقر

بەکوردی:

پەنابەخوا لەومیرە بەدادو فەرە
کەئێستا بەهەشتی بە بارەگا هەڵبژاردووە

خولاسەی قســـە، سە بـــارەت بەوە کە ئەم میـرە بەغبـاڵ بەرزە بوو بە فەرمانـڕەوای ولاَت، بەڕاو سەلـیـقـــەی ڕاسـتـی حوکـمــــەتی بەرێـوەدەبـرد. ئایین و ڕێورەسمی خوسـرەوی باپـیری سەرلەنوێ تازەکـردەوەو شەووڕۆژ خەریکی ڕێـك خستنی کاروبـاری لەشکرو ژێـردەسـتـانی بوو. چاوتر ووکانێ لە پێناوی بەڕێوەبردنی کاروباری ولاَت دا نەدەسـرەوت. دڵی گەورەو بچـووکی ڕاگـرتبـوو. هەمـوو خەڵکی سنـــەی لە لانکی هێمنیدا حەسـانـدەوە. تا حەسـەن عەلی خانی والی لە ساڵی ١٢١٦ی‌ك دا کە لە ماڵی بەگلەربەگیی تاران دا بەندکرابوو، هەلی وەدەست هێناو لە تارانەوە هەلاَت و خۆی خستە. پەنـای بلبـاس و پیـاوخـراپـوخەڵکێکی زۆری لەخـۆی خرکردەوەو ڕووی لە سنە کرد، تا گەیشتە شوێنێکی شەش فەرسەخی‌ی شاری سنـە. ئەمـانـوڵـلا خانیش بە نیـازی بەرەنگـاربـوون جمیـا، بەلاَم سەبـارەت بەوەی کە حەسـەن عەلی خان توانستی بەرەنگـاربـوونی لەخـۆیدا شك نەبـرد، ناچـار گەڕایەوە بۆ ناو بلباسەکان. **ئەمانوڵلا** خانیش گەڕایـەوە بۆ سنـە. زۆری پێ نـەچـوو برێ لە دزودرۆزنانی سنـــە لە دەوری حەســەن عەلی خان کۆبـوونـەوەو فیتیـان دا ئالاَی سەربزێوی هەڵ کا. بەلاَم سەبارەت بەوە کە هۆزی بلباسی لە والی ترسان، ئیتر گوێیان بە حەسەن عەلی خان نەداو حەسەن عەلی خانیش ناچار بەو لەشکرە کەمەوە کە هەی بوو ڕووی لە سنە کردو ئەمـــانـــوڵـلا خانیش دووبـارە بەرەنگـاری بۆوە. لەو قەراخ دەشتی

مەریوانە کە هەمیشە مەیدانی شەڕوشۆڕ بووە، هەردوو لەشکر بەیەك گەیشتن. حەسەن عەلی خان بەو لەشکرە کەمەوەی هەی بوو هاتە مەیدانی دلێرییەوەو شەڕ گەرم بووو دەست بە هەلمەت و هەلکردنەسەریەکتر کرا. چەند کەسێ لەم شەڕەدا مەیگێری ئەجەل مەرگی پێنۆشین. حەسەن عەلی خان خۆی هەنگاوی ئازایەتی هەلێناو ڕووی کردە ناوجەرگەی لەشکرەکەو خۆی گەیاندە جێگای والیی پایەبەرز. یەحیابەگ و محەمەد قولی بەگی سەقزی کە هەریەکەیان نەرەشێری بێشەیەك بووو، لە مەیدانی شەڕدا دلاوەرێکی کینەلەدڵ بوو ڕێیان لێگرت، بەلام ئەو چاونەترسە، بە چالاکی هەردووکیانی کوشت و بەرەو ئەودنیای ڕەوانەکردن. دوای ئەوان فەتح عەلی بەگی وەکیل، شێری خوێنرێژی لەبەرهەلات، ڕەخشی بە تاو هێنایە مەیدانی شەڕەوە. بەلام حەسەن عەلی خانی بەجەرگ بە نێزەیێکی گیان ئەستێن تخێلی زەویی‌کرد.
پاش ماوەیێك چون بەختی سەرکەوتن لەگەڵ ئەمانوللا خان دا ياربوو، سمی ئەسپەکەی حەسەن عەلی خان لەکوتە ڕزقێ چووو گلاو برێ لە شەرکەرانی ئەمانوللاخان دەرفەتیان نەدا، یەکسەر هەلیان کردێو بریندارییان کرد والیی دەروون پاك لەبەر خزمایەتیو نزیکی لەم تەنگانەیەی ڕزگارکرد بەرێکەوتنەوە گەڕایەوە بۆ ئەیالەت ، فەرمانی بەپزیشکە پسپۆڕەکانی دا برینەکانی تیمارکەن بەلام پاش ماوەیێك لەسەر دا خوازیی دەرباری دەولەتی ئێران حەسەن خانی بۆ تاران نارد. لە ژووری تایبەتی نوکەرانی بەگلەربەگیدا کۆت و زنجیرکرا. کاتێ مەوکبی فەتح عەلی شابۆ بارەگای سەلتەنەت گەڕایەوە لە ئەسفەهان[61]، بە دزییەوە، شەربەتی مەرگیان بە

حەسەن عەلی خان نۆشی .
لە پێشەوە گوتمان، ئەمانوڵلاخانی والی پایەی بریکاریتیی ئەیالەتی ئەردەلانی بە فەتح بەگی کوڕی محەمەد ڕەشید بەگ سپارد،بەم شێوەیە شوێنی باوکی گرتەوە. وەکیلی تازەیش وەك باووباپیرانی بە سەر وڵات ڕادەگەیشت و فەرمانڕەواییی خەڵکی کوردستانیان بەڕێوە دەبرد، لە سەردەمی ئەوخودانەداویستیان هەر لە سەر شێوەی پێشوو بڕۆن تەنانەت ئەوخودانەبەشکۆیە وێڕای هەموو بەهرەمەندیوجەوهەرداری یەکی پێویستی بە ڕاوتەدبیری کەسانی دیکەو ڕاوێژو بەرژەوە ندبینی لە خۆی گەورەترو مەزنتر نەبوو گوێی بەقسەیان نەداو لەبەر ئەمە فەتح عەلی خان و براکانی کەوتنە کنەو تێکدانی کاروباری میرنشینەکەو بنەمای کردەوەی نارێکیان دامەزراند.
والیش هەرکە لەم بارە ئاڵۆزکاوە بەئاگاهات ، لەدوای ناردن و لەپێشان یەکەیەکە دڵی دانەوەو دڵنیای کردن وڕێك خستنەوەی کاروباریەرەوڕووی وەکیل کردەوە بەڵام پاش سێ وچوار مانگێ دووبارە بە فیتی ئاژاوەگێڕو هەلپەرست و مایەفیتنە ڕێگای دووڕوویییان گرتەوەبەرو دەرووی دژمنایەتی و سەربزێوییان خستەوە سەرگازی پشت و لە گەڵ سەرلەبەری خەڵکی سنەدا ڕێك کەوتن.

دەگێرنەوە : ناکۆکیی نێوان فەتح عەلی بەگ و هاودەستانیو ئەمانوڵلاخانی والی بەڕادەیێ گەیشتبوو، سێ شەوو سێ ڕۆژ شێوی نێو

مەنجەڵی سەرئاگردانی والی بێ چەوری مابەوەو کەس نەیدەوێرا هیچ سەوداو مامەڵەیێ لەگەڵ دەستوپێوەندانی والیدا بکاو شتێکیان پێ بفرۆشێ.

پاشان کار بە رادەیێ گەیشت ، خەڵکەکە روویان لە دەرباری شای قاجار کردو چوون بۆ شکات. والییش بۆ بەرەوبەریی دژمنانیو ئاژاوەو فیتنە کوژاندنەوە ، چوو بۆ تاران، بەڵام والی لەبەر کەم هاودەست و یارانیی کاری شڕ و ناکۆك بوو و، ناچار بە خۆکەوت و بیری لە
راو تەدبیری کردەوەو بەدەم بیرکردنەوەوە ئەم چوارینەیەی بە بیردا هات و لەسەر پارچە کاغەزێکی نووسیو دای‌نا . هەر لەو دەمەدا حەزی لە قلیان کێشانێکیش کرد، بۆچی تنۆکە ئاوێ لە قلیانەکەیەوە نەکەوێتە سەر وشەی «سپاهی»و رەشی‌نەکاتەوە. والی ئەم چوارینەیەی بە نیشانەی بەخت سواری لێکدایەوە :

از جوشش کثرت سپاهی
تن تالانه است و چهره کاهی
أز خلق امید قطع و باقی
الطاف خفیهء الهی

بە کوردی :

لە تاو زۆریی سەربازان
لەش ناڵەناڵیەو دەم وچاو وەك کا زەرد
نومێد بە خەڵك براوە ، ئەوەی ماوە
مەگەر هەر بەزەییی پشت پەردەی خودابێ

خوڵاسە دژمنانی ئەماتوڵلاخان هەرچەندە لە دەرباری قاجاردا زۆریان درێژە بە شکات و سکاڵاداو تۆمەتێکی زۆریان وەپاڵ داو بۆ لێ خستنی دەسەوداوێنی چەندین میر و کاربەدەستی پایە بڵیندی دەوڵەت بوون و بەڵێنیان دا، دیاری و خەڵاتی زۆر پێشکێش بکەن، بەڵام ئاکامێکیان وەگیر نەکەوت و کارەکەیان بستێ بەرەوپێش نەبرد. لەپاشان میرزا ئەحمەدی وەزیر بۆ نێوبژی کردنیان، کەوتە نێوانیانەوەو دژمنەکانی بە هەزار پەشیمانی و سەرشۆڕی یەوە، بۆ دەست ماچ کردن و عوزرهێنانەوە بردنە حوزووری والی.

ئەو میرە بە تەدبیرە بە پێی بەرژەوەندی رۆژگار لە تاوان و گوناهیان خۆش بوو، بە خەڵات و پێشکێشی مەزنانە سەربڵیندکردن و دووبارە پایەی بریکاری بە فەتح عەلی خان بەخشییەوەو گەڕایەوە بۆ ئەردەلان.

والی باپیرەی سەروەری ئەم کەمینەیە، لەو هەراوهوریایەدا لەگەڵ تارازی‌یەکان دا هاودەست بوو، لەبەر ئەوەی ئەمامی پەناسێبەری پەروەردەی ئەو بنەماڵەیە بوو، بێ ئەمەکی کردبوو، دەستی لەگەڵ دژمنانی‌دا تێکەڵ کردبوو، چەند رۆژێ بۆگوێ راکێشان، چاوی بەزەیی لێ پۆشی و پێنج هەزار تمەنی چاوترسێنانە لێ‌سەند، بەڵام پاش ١٨ رۆژ دووبارە پلەی چاوێری کردنی دارایی پێ‌بەخشییەوەو

به خەلاٌت و پێشکێشی شایـان سەربلێنـدی کردو هەتـا دەهـات پلەو پایـەی بەرزتر دەکردەوە .

، بەلاٌم زۆری نەخایاند، وەك شاعیر دەڵێ :
خوی بد بر طبیعتی که نشست
نرود بوقت مرگ از دست
بەکوردی :
خوویی گرێت بە شیری
تەرکی ناکەی بە پیری

فەتـح عەلی بەگ لەگـەڵ براکانی‌دا ماکی خراپەیان خستەوەو گەرای ئاشـووب و فیتنـەیـان دانـاو، دەرووی فەسـادیـان خـستە سەرپشت . سەرەنجـام، والی کاسـەی سەبـرو بوردەبـاریی سەرریـژی کردو لە ئاخـرونـۆخری مانگی شەعبانی ساڵی ۱۲۱۷ی ك دا فەتح عەلی بەگی لەگـەڵ چەنـد برایـەکی‌دا بە بیـانووی دیدەنی‌و رابواردنەوە بۆ ماڵەوە بانگ کرد. فەرمانی‌دا میرغەزەب و باوەڕپێکراوانی لە پشت پەردەوە بە چەکـەوە. خۆیـان حەشاردەن . ئەو گەورەیە، دیاردیی بۆ کردن هەڵیان کردێ کوشتیـان ئیتـر بەم ڕەنگـە ، بیـرو بـر وایـان هاویشتـە زەلکـاوی ڕیسـوایی‌و پەشیمـانی‌یەوە. پاشان لە ژوورێك دا کە لە ناوەوە بوو، بە کۆت و بەنـدەوەیـان زینـدان کردن و فەرمـان بە کاربەدەستانی دەوڵەت درا، کە خزم و کەس و کارو دەست وپێوەندیان ، هەرچی هەن و نین، لە نێـو شارو دەرەوەی شار، سەرلـەبـەریـان بگـرن . ئیـدی بەم ڕەنگـە هەمـوویـان بەو پەڕی پەرێشـانی‌یـەوە لە کۆت و زنجیـردران . هەر لە

یەکەم شەودا ، فەتح عەلی بەگ و ئەحمەد بەگ و ئەسر وللا بەگیان، کە هەرسێکیان گەوهەر نێو یەك قەپێلك و لە یەك دایك بوون ، کوشتن

. محەمەد زەمان بەگی براگەورەیان، کە لە هەموویان بەناوتر بوو، سەبارەت بە چەند هۆیەك نەیکوشت دوو ساڵیکی زیندان کرد، بەلام سلێمان خانی براگچکەی ئەو میرە پر هونەرە، کاتێ والی ، بە سەفەر چوو بوو، ئەویشی کوشت و گلکوکەشی کەسی نازانێ لە کوێیە.
پاش ئەم رووداوە، بە پێی بەندوباوی میرانگری، پلەی بریکاریشی بە محەمەد رەحیم بەگی کوڕی میر عەلی سولتان کە زاوای محەمەد رەشید بەگی وەکیل بوو ئامۆزایشی بوو، سپێردرا هەرچی کار و باری ئەیالەیشی بوو، ئەوە والیی بەشکۆ، بۆ خۆی دەیگێراو بەرێوەی دەبردو هەرخۆی دەپەرژایە سەر رێك خستن و سەروبەرنانی کارەکانی.
زۆربەی کاتی خۆی بە لەشکرخرکردنەوەو زێر وزیو کوکردنەوە بەسەردەبرد. لە ماوەییکی کورت دا هێندەی شان وشکۆ پەیداکردو ئەوەندەی سەروەت و سامان وەسەریەك نا، شاریارانی تاجدارو هەمەکارانی دەولەت ئێرەیی یان پێ دەبردو دەستیان بە لێ خۆیندنی کرد.
لە ساڵی ١٩١٩ ی‌ك دا عەبدورەحمان پاشای بابان لە فەرمانڕەوایی شارەزوور خرا، ئەویش بریاری دا پەنا وەبەر دەباری فەتح عەلی شای قاجار بەرێ . پاش پشوو حەسانەوەییك ، والیی کرد بە پێناو و بە دیاری و پێشکێشی شایانەوە. لەگەل چەند کەسێك دا لە باوەرپێکراوانی ، لە تەك والیدا چوون بۆ تاران . لەوێ ، لە دەرباری قاجاردا والیی

پایە بڵیند بەوپەڕی ڕێزو نوازشتەوە پێشوازی لێ کراو بە شمشێرێکی بەگەوهەری ئاودارو مرداری شاهانە ڕازاوەو ئەنگوستیلەیێکی ئەلماس کەلە پەنجەی شا، خۆی دا بوو، خەڵات کرا. هەروەها بەزەییشی بە پاشای بابان دا هاتەوەو لە باری کارڕایی کردنیەوە، لەگەڵی‌دا کۆبوونەوەو بۆ گیروگرفت ڕەواندنەوەی کاروباری ، کەوتە وتووێژ.

پاش وتووێژ ، ڕای والی‌و باوەڕپێکراوانی دەوڵەت لەسەر ئەوە گیرسایەوە کە مادامێکی پاشای بابان ڕووی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگێراوە و بووە بە پەناهێنی ئێران ، دەبێ دڵی بدرێتەوەو نائومێد نەکرێ چونکە نائومێدکردنی لە یارمەتیی دەرباری شاریاری ، لە ڕێورەسمی جیهانداری ناوەشێتەوە. لەبەر ئەوەچاکترو پەسندتر وایە کە بۆ ئەوەی بتوانێ سەربە خۆیی ولاتەکەی بپارێزی، لەشکرێکی گەورەگرانی بۆ یارمەتی‌و دەست گرتن بخرێتە تەك. وەزیری بەغدا هەرکە بەم هەواڵەی زانی یەکسەر فەرمانی دا لەشکرو تیرەو هۆزەکان سەرلەبەر کوکەنەوە. لەسەر فەرمانی وەزیر زێتر لەبیست سەرباز بە تۆپخانەو ئاتەشخانەی زۆروزەوە ندەوە، لە بەغداوە بەرێی‌کەوتن ڕۆیشتن، گەیشتنە قەسری شیرین و لەوێ بنەوبارگەی لەشکریان خست. شازادەی ئازاد محەمەد عەلی میرزا فەرمانڕەوای هەرسێ ناوچەی کرماشان و خوزستان و لورستان ، لەلایەن فەتح شای قاجارەوە فەرمانی پێ‌کرا، نەختێ گوێی وەزیری بەغدا ڕاکێشی‌و کەمێکی چاولێ سوورکاتەوە. ئەمە لە سەرێکەوە، لەسەرێکی دیکەشەوە، فەرەجوڵلاخانی سەرداریش بە سێ هەزار کەسەوە فەرمانی پێ‌کرا کە لەگەڵ ئەمانوڵلا خان دا لە ڕێگای مەریوانەوە هەڵ کاتە مەڵبەندی‌بابان.

ئەمانوڵڵا خانیش فەرمانی بەسپای ئەردەڵان کرد، ئامادەبێ: نزیکەی دەهەزار سوار، لەدەس وەشێنی دا وەك ڕۆستەم ولە مەیدان بازی‌دا وەك بارام لەگەڵ فەرەجولـلا خانی سەرداردا لە دوادوایی مانگی جومازی‌الثانی‌یەی ساڵی ۱۲۲۱ك دا، لە سنەوە، کۆچ بەکۆچ بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی شێخ عەتار.

هەرکە وەزیر بەم خەبەرەی زانی وای بە بیردا هات کە عەبدورەحمان پاشای بابان، کەهێشتا هەر لە مەریوانەو لەشکری ئەمانوڵڵا خانی فریانەکەوتووە. وای بە چاك زانی، لە ناکاو هەڵ کاتە سەری و بە دەك و دەهۆیێ لە ناوی بەرێوبەلە رەگە و ریشەراهەڵ کەندنی ئەم مایەفیتنەیە سەری هەردوو دەولەتی عوسمانی وئێران سووك و ئاسوودە بێ. هەر بەم نیاز و ئارەزووەوە خالید پاشای بابان و سلێمان ئاغای کەهیەی بە دە هەزار کەسەوە ناردە سەر عەبدورەحمان پاشا. عەبدورەحمان پاشاش بەمەی زانی ئیبراهیم بەگی پیاوی، بۆ خزمەت والی رەوانەکردو راستیی کارەکەی راگەیاندێ.والیش کە ئەم خەبەرەی بیستەوە، پشت بەخوداو پێغەمبەر، هەرچی زووتر بوو، خۆی گەیاندە عەبدورەحمان پاشاو لەگەڵ یەك دا لەشکریان ڕێك خست و خۆیان بۆ شەڕ ئامادەو تەیار کرد.

کەهیەی بەغدایش لەگەڵ خالید پاشاو سلێمان پاشای کۆیەو حەریر و لەشکرێکی ئازای خاوەن شمشێرەوەو لەگەڵ حەشەم ئاغاسی‌دا، کە سی هەزار کەسێ دەبوون، بەرەنگاری بوون. لە گوێی گۆلی زرێبار هەردوو لەشکرەکە تێك گیران و شەرێکی بێ‌ئامان و دڵ رەقانەیان کرد. لە پریشکی دانەتۆپ و چریسکەی مەودای شیر و بریقەی نیزەی دلیران مەیدانی شەڕ وێنەی ڕۆژی(یوم تأتی السماء

بدخـان میبنی)ی دەنـوانـد. لە زەبـری بازووو هێزی پەنجەی شێرانی هونەروەر وێنەی(ان هذا لشیء عجاب)بەدیاردەکەوت.
کاتێ سەری شەرکـــەرێکی زۆر لە مەیـدانی شەردا گلۆربـۆوەو لاشـە یێکی بێشـــومـار لەژێـر سمی ئەسپـان دا گیـانیـان دەرچـوو، شنـەی سەرکـــەوتن و زاڵ بوون ئاڵای ئێـران و ئەمـانـوڵاخـانی شەکـانـدەوەو لەشکـری عوسمـانی هەڵات وئـازایـانی ئەردەڵان چنگ لەسـەرشـان هەڵیـان بری و دەستیـان بەهەر کامێکیان گەیشت کوشتیان. برێکیشیان لەگەڵ سلێمان پاشای کەهیەدا بەدیل گیران.
سەلیم بەگی برای عەبدورەحمان پاشای بابانیش بریندارکراو پاش دوو سێ رۆژێ مرد.
دوای ئەم سەرکـەوتنـە دەرەخشـانـە، عەبـدورەحمان پاشا جێگەی خۆی گرتەوەو دەسەڵاتی پەیداکردەوە ئەمانوڵلا خانیش بە سەرکەوتنەوە گەرایـەوە بۆ مەڵبـەنـدی خۆی و کەهیـەی بەغـدای لەگەڵ دوو سەت لە بەدیل گیراوانی رۆمیدا کە لەم شەڕەدا بەدیل گیرابوون لەگەڵ محەمەد ئاغـا باپیـرەی ئەم کەمینـەیەدا نـارد بۆخزمەت فەتح عەلی شا، بەڵام شا ناردنیەوە بۆ بەغدا. سەرەنجام والیی بەغدا لەگەڵ حوکومەتی عەبدورەحمان پاشادا رێك کەوت. لە موحەرەمی ساڵی ۱۲۲۲ی ك دا خان ئەحمـەد خان، کوری رەزاقـولیخـان و محـەمـەدقولیخان کوری خان ئەحمەد خان برای ئەمانوڵلا خان و محەمەد رەحیم بەگی وەکیل و نەزەر عەلی بەگ و ئیمـام وێـردی بەگ لەگەڵ خزموخۆیشیخۆیان دا لە ژێـرەوە رێـك کەوتن و دەستیـان بە پیـلان گێـران کرد، والی بکـوژن و خۆیـان جێگـاکـەی بگـرنـەوە. دوای وتـووێژو راوێژێکی دوورودرێژ میـرزا لوتفـولـلا کوری میـرزا عەبـدولـلای وەزیـر کە یەکێ لە

هاوپەیمانانیان بوو، ئەم خەبەرەی بەهۆی میرزاعەبدولکەریمەوەکە یەکێ لە باوەڕپێ کراوانی والی بوو، بە والی راگەیاند. والیش ئەیکردە نامەردی تاوانبارانی خرکردەوە سەرلەبەریانی کوت وزنجیرکردو زیندانی کردن. پاشانەکێ لەبەر خزمایەتی لە خان ئەحمەد خان ومحەمەد قولیخان خوش بوو، بەلام محەمەد رەحیم بەگ و محەمەد عەلی بەگ و نەزەرعەلی بەگ و ئیمام ویردی بەگی لە تێغ کێشان و بە سزای خۆیانی گەیاندن.

ئینجا پاش ئەوەی دوو سێ ساڵ بەسەر فەرمانڕەوایی عەبدورحمان پاشادا تێپەری و لە کاروباری حوکمرانیدا سەربەخۆییێکی تەواوی وەدەست هێنا، تەپلی دژمنایەتیی لە دژ هەردوودەولەتی ڕوم و ئێران کوتاو رووی لە هەردووکیان وەرگێرا. لە مانگی شەعبانی ١٢٢٥ ی ك دا لەگەل رەئیس ئەفەندی‌دا، بە نیازی لە ناوبردنی والیی بەغدا بەرێ کەوت و لە ناوچەی قەرەتەپە هەلیان دا. لە سەرەتای مانگی رەمەزانی ١٢٢٥ ی ك دا، لە دەرەوەی شاری بەغدا هەردوو لەشکر یکیان دا. پاش لیکدان و شەڕوشوڕیکی زۆر عەبدورەحمان پاشاو رەئیس ئەفەندی سەرکەوتن و سوپای ڕوم زۆر خراپ شکا. سلێمان پاشای وەزیری بەغدا، لە مەیدانی شەڕ هەلات و چوو، ناچار پەنای وەبەر خیلاتی عارەب برد. لەلایەن دەربای عوسمانی‌یەوە فەرمانی کوشتنی دەرچووو کوژرا. دوای ئەوەی ئەم خەبەرە بەشای ئێران گەیشت فەرمانی دا والی لە مەریوانەوە بگەرێتەوە بۆسنە. عەبدورەحمان پاشایش دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ سلێمانی، لە خۆبایی بووو ئەوەی هەر لە دل دا مابوو، کە لەشکری ئەردەلان کاتێ لە مەریوان بوو، ناوچەی شارەوزووری چەپاودا بوو، ئەم ڕووداوەی

کرد بە بیانووو ئاگری دژمنایەتیی سەرلەنوێ خۆش کردەوە. لە ئاکام دا ئەمانوڵلاخان و محەمەد عەلی میرزا بۆ لەکۆڵ کردنەوەی ئاژاوەکە راسپێردران. لە رێگای کرماشان و زەهاوەوە بۆ لەکۆڵ کردنەوەی بەرێکەوتن. کاتێکی گەیشتنە ناوچەی زەهاو عەبدورەحمان پاشاش لە سلێمانی دەرچووو رۆیشت، لە کۆیە خۆی قایم کرد. هەردوو لەشکردوو سێ رۆژێ بە گرمەی تۆپ و ترکەی قومپارەو شریخەی تفەنگ مەیدانی شەریان گەرم کرد، تەنانەت کار بە ئەندازەیێ گەیشت عەبدورەحمان پاشا، بەجارێ هەودای هەویای پچراو دەرووی رزگاربوونی لێبەسترا ناچار سەری گوێبەفەرمانیی دانەواندو ملی‌دا، پەنجا هەزار تمەن بجرنگێنێ.

ئەنجا پاش ئەوەی والی و شازادە محەمەد عەلی میرزاگەرانەوەو ئاشتی بەرپابوو، عەبدوڵلا پاشا، وەزیری بەغدا لەم دەهری بوو، هەستا، بە لەشکرێکی لە ئەستێرەی ئاسمان زێترە بە تۆپخانەو ئاتەشخانەیێکی زۆروزەندەوە، لە بەغداوە بۆ گوێراکێشانی پاشای شێرئاسا بەرێکەوت.

پاشایش نەی‌کردە نامەردی، بە ئازاو دلێرانی بابانەوە لێیان راپەری و هاتە پێش ... مەیدانیان، بەڵام پاش شەروشۆرێکی زۆر بەسام لەشکری بابان تێك شکاولە مەیدانی شەر هەڵات. پاشا خۆیش ناچار پەنای وەبەر شازادەی ئەژادپاك، شازادە محەمەد عەلی میرزا بردو چووە ناو شاری کرماشان. محەمەد عەلی میرزایش رووداوەکەی لە فەتح عەلی شا راگەیاند. شایش بە پێی رێورەسمی پاتشایەتی، لەو سەروەختەوا، لە چیمەنی سوڵتانییە، خێوەتی‌بارەگای شاهێتیی هەڵ دابوو. هەرکە ئەم هەواڵەی بیستەوە، چەند کەسێکی لە پیاوماقووڵانی

قاجار راسپارد ، کە لە خزمەت شازادە محەمەد عەلی میرزادا ، بە یارمەتیی ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵانەوە بچن وشاری بەغدا بگرن و ئەو ناوچە بە هەشت ئاسایانەی دەوروبەری خاپوورو وێران کەن و بۆ گوێ ڕاکێشانی ئەو وەزیرە بەدنیهادەی بەغدا هەرچی یەکیان لەدەست دێ دریغی نەکەن .

هێزی لەشکری بە یارمەتی هاتنی عەبدورەحمان پاشا تا نزیکی دەوروبەری بەغدا هات . سەبارەت بەوە کە والیی بەغدا توانی بەرەنگاریی لە خۆدا نەدەبینی ، ناچار داوای پێك هاتن و ڕێك کەوتنی لە بەرژوەند زانی .

شێخ جەعفەری موتەوطلیی نەجەف و چەند شێخ و سەیدو پیاوماقوولانی ئەو ناوچە پیرۆزەی کرد بە تکاکارو ناوبژی کەر . جوکومەتی باڵبانیشیان بەرەوڕووی عەبدورەحمان پاشا کردەوە .

لە سەرەتای مانگی شەوالی ساڵی ١٢٢٧ ی ك دا شازادەی بەسام و شەوکەت و والیی نژادخاوێن بۆ ولاتی خۆی گەڕایەوە . پاش ئەم سەفەربەرە ، ئەم والییە ڕەوشت پەسندو چاکە بۆ ماوەی دوو سێ ساڵێ ، لەناو لانکی هێمنی و ئاسایشتدا هەلاژیاو دەرووی بەزەو دلاوایی و نوازشتی لە ڕووی خەڵکی ولاتەکەی هەریەکە بە پێی پلەوپایەی خۆی خستە سەرپشت و هەرکەسە بە پێی توانایی و لێوەشاوەیی خۆی بە پلەوپایەی شیاوی خۆی سەرفراز بوو . هەموو کەسێکی لە ژێر سایەی بەزەو نوازشتیدا ، لە ناچاری و ناگوزووری دوورخستەوە . تەنانەت کار بە ئەندازەیی گەیشت ، گوورگ و مەڕ پێکەوە ئاویان دەخواردەوەو چۆلەکەو شەهێن پێکەوە چینەیان دەکرد . ئەم بارودۆخە تا ساڵی ١٢٣٠ ی ك خایاند ، ئیتر ئەوە بوو ، تا جارێکی دیکە محەمەد زەمان

گە کوری یوسف بەگە و خزم و کەس و کارەکانی و سەید مەحمودی
خول ئیسلام و سەیید زەکی وئسماعیل بەگە ومیرزا رەحیم و کورانی
رزا یوسف دوای سەرکێشی و کەڵەوەکێشیی خۆیان کەوتن و هیمی
اوە وگێرە شێوێنی یان لە ولاتی ئەردەلاندا بنیات نا . برێکیان لە گەل
زیان دا هێنایە ژێر بارو بە نیازی لابردنی والی یەوە روویان کردە
ربـاری تاران و هەر ئەوشـەوە . بۆ بەیـانی کە ئەم هەواڵـە بە والی
یشت محەمەد ئاغای سەرکاری کە باپیری پایە بلیندی ، نووسیاری
م مێژوویەوە ، بۆ روون کردنەوەی راستی کەین و بەینەکەو بەتاڵ
دنەوەی نیـازی پیسی نارەزایـان ، نـارد بۆ دەرباری فەتح عەلی شا .
داکردی تیری نارەزایان نیشانەی نەپێکاو ناچار بەپەشیمانی گەرانەوە
ئەردەلان ، بەلام محەمەد زەمان بەگە و کورەکانی و دوو کەسیش لە
ـوزاکـانی لە ترسی زەبـروزەنگی ئەمـانوڵـلاخـان خۆیـان گەیاندە
ماشان و چاکی خزمەتگوزاریی شازادە ، محەمەد عەلی میرزایان لێ
لکردو شەش حەوت مانگێکیان لەو ناوە بەسـەربـرد . سەرەنجام
لیی بە جارێ لێ بە رك داچوو و ، لەبەر ئەوە لەسەر داخوازیی
الی شازادە محەمەد عەلی میرزا و چوار کەسیان لە ئاژاوە گێران
اوهـەلکـولین و بەرەو ئەردەلان ، بۆ کن والی یسان ناردنـەوە . والی
ۆیشیی ، ئەوانی دیکـەی گرتن و پاش ئەوەی دەستی بەسـەر ماڵ و
امانیـان دا گرت و پارەو پوولێکی زۆری لێ سانـدن ، هەمـوویـانی
کـونی زینـدان تونـد کردن . خولاسـە ، پاش ئەوەی لە ئاژاوەو مایە
بتەییی ئەمانە بۆوە ، چەند ساڵێکی تریشی بە فەرمانرەوایی ئەردەلان
ەسـەربـرد . تالـە سالی ١٢٣٤ك دا محەمەد حەسـەن خانی کورە
ەورەی ، بە هانەهانەی پیاو خراپ و زمان پیس و ئاژاوەگێران ، کەوتە

بیـــری پرو پـوو چ و ئالاْی دژایـەتیی باوکی هەلْ کردو لەگـەلْ بریْ بیْ پەرواو سەرسەری و ناکەسی ولاْتەکەدا دەستی تیکەلْ کردو لە شەویکی تاریــك دا هەلاْت و پەنـایـان بوْ شازادەی کامـرەوا ، کە لەو دەمـەدا لە ناوچـەی ئەردەلاْن نزیـك بوو، برد . بەلاْم محـەمەد عەلی میرزا گویْ نەدانی ئەویش هیچی بوْ نەمایەوە، ناچار، خوْی گەیاندە کەژو کوْسارو چوْلـەکـانی لورستـان و عەرەبستـان و لەو ناوچەیەدا یاخی‌بووو دەست دریـژیی کردە سەر مالْ و سامـانی خەلْکی ئەوسەرسنـوورانـەو لەگەلْ یەکیْ لە سەرەك هوْزەکـانی عەرەب دا نیـوانیان تیْك چووو بەگژیەك دا چوون و دوای شەریْ بە سەری‌دا زالْ بووو سەروْك عەرەبـەکـەی کوشت و زوْربـەی کەلـەپیـاوانی ئەو ناوچـەیەی بەدیل گرت . محەمە حەســەن ماوەییکی بەو رەنگـە بەسەربرد، لەپاشان گەرایەوە بوْ ناوچەی ئەردەلاْن و بنـاخـەی دەست دریـژیی لەویْ بنیـات ناو دەستی بە ئازار و ئەشکەنجەدانی خیْلْ و هوْزەکانی کوردستان کرد .

ئەمـانـولْـلاْ خان ئەم کردەوەیەی بوْ قووت نەچوو، بریاری دا گوییْ یاخی‌یــەکـــان راکیشیْ . بەم جوْرە خەلْکیکی زوْری لە سوارەو پیــادە خرکردەوەو بوْ ریْك خستنی سەرسنوورەکان روی کردە ئەو ناوچانە . لەم لایـەوە خان ئەحمەد خانی ئاموْزای و زاوای لەگەلْ میرزا عەبدولْلاْ خەلْـەفی حاجی میـرزا ئەحمـەددا کە سەرکـوت کردنی فەتـح عەلی سولْتانی بانەی[٦٢] پیْ سپیرادرابوو، داواکردو خـتیە تەك خوْی و محمەد ئاغـا باپیـری نووسیـاری ئەم کتیبـەی کردە سەرداری لەشکریْ لە ئازاو شیْردلاْنی ئەردەلاْن و بوْ ناوچەی بانەی نارد . هەرکە ئەم هەوالە بەسامە بەرگــویی محــمـەد حەســەن خانْ و دەست دایـەرەکـەی کەوتـەوە ، چارەســەرکـردنی‌کـارەکـەی لەوەدا دیت خوْی بەسنـە بگـەیەنیْ و ئەوەی

کەلەشکرەکەی ئەمانوڵلاخان لە ناوشارمابوّوە ، سەرلەبەری کەلە لەشکرەکەی کوشت و وتەفروتونای‌کردن و وناوچەکەشیان تالآن کردو هەلاتن . هەر ئەوروّژە ، بوّعەسر ، ئەم خەبەرە لە سەرانسەری ناوچەکەدا بلاوبوّوە . خودالیخوّشبوو، ئەبولحەسەن بەگە . باوکی نووسیاری ئەم کتێبە سەبارەت بەوە کە ریش سپی بوو لەبریکاریی حوسەین قولیخانی کوری والی کاروباری ولاتی بەریوەدەبرد لە ری ورەسمی قەلاداری‌و بورج و بارووو شوورە پاریزی‌دا هیممەتێکی زوّری نوواند . جەنابی محەمەد حەسەن خانیش وای بە چاك زانی هیرش نەکاتە سەر شاری سنەو چارەسەری کارەکەی لەوەدا بەدی‌کرد بەگژ باوکیدا بچیّو لەناچاری مل لە شەریکی خویناوی بنیّ بەم نیازەوە هاتە مەیدانی شەری باوك و فرزەندەوە ، لەوناوچەی رەوانسەر، لە شوێنیّ کە گومی وشتری بی‌دەلین ، لەسەر سنووری ماهی دەشت و کوردستانی ئەردەلانەوە نزیکە ، هەردوو لەشکری باوك و کور پیّك گەیشتن . بریکارانی والی ئەم شەری باوك فرزەندی یەیان پیّ شتێکی نارەوابوو ولە ناکامی شەرەکە دەترسان نەوەك والی ئوبالی قەوماندنی بخاتە ئەستوّیان، پیش ئەوەی شەرەکە دەست پیّ بکا ، دو سیّ جار، قوتبولئەقتاب مەلاعە باسی شێخولئیسلامیان بە قورئانیکەوە ، بوّ تکاکاری ناردە خزمەت حەسەن عەلی خان . بەلام بە پیّی ئایەتی «اذا أجلهم لايستأخرون ساعة ولايستقدمون»و بە پیّی « اذا جاء القضاء عمي البصر»وا دیاربوو ئەستیرەی ژیانی حەسەن عەلی خان لەکشا‌ن بوو . بەناوبژیی قورئانی پیروّز قایل نەبووو ئاموژگاریی شێخولئیسلامیشی کە هەقی ماموّستایەتیی بەسەرەوە بووو ماوەییکی دەرزو دەوروو مەشق دابوو لەگوێ نەگرت و کارلەکار ترازاو و شەر

قەومـاو گەرم بوو. دوو سەعـاتی ڕێـك ئاگـری شەڕ بە گڕ و بڵێسەبو،
زۆر لە پیاوماقوولان و کەلەکەلەی کوردستان بەر گازو هەوڕێتی ئەجا
کەوتن و شیـرازەی کار و بـاری دژمنانی والی بەجاری پچرا . هێندێ
کەلـە لاوانی بە نامێی وەك میـرزا عەبدوللای وەزیر و [٦٣] محەمەد عە،
سولتـانی بەنی ئـەردەلان و حوسـەین ئاغـای برای موراد بەگی دارۆغ
میرزا باقری کوڕی میرزا لوتفوللاو چەند کەسێکی تر لەمەیدانی شەڕ
بە گوللەی گیـان کێشـەوە بوون و بە نوکـە نێـزەی دڵ پێـك کوژراز
هێنـدێ لە پیـاوماقـوولانی وەك میـرزا عەبـدولکـەریمی موعتـەمیـ
ئیسمـاعیلی برای و میـرزا عەبـدو ڕەحمـان و میرزا فەرەجوللای کوڕ
میرزا عەلی برینداربوون و خلتانی خوێن بوون .

لە هەنگـامـەو بگـرەو بەردەی شەڕدا محـەمەد حەسەن خان کە نو
باوەی باخچـەی لاوێنی وگـەنجیی والی بوو بە گوللەیی خلتـانی خو:
بوو. محەمەد صادقخان کوڕەکەی تری ئەمانوللا خان بە نووکە نێزە،
بریندارکرا. زۆربەی لەشکرەکەی محەمەد حەسەن خانیش کوژران
بەدیل گیران و ئەوانەی سەریشیان ڕزگارکرد دایانە چیاوچوڵ. والی
تاوانی غایەنەتی سەردارانی لەشکرەکەی محەمەد حەسەن خانی کوڕ
دابـە دەست سەربـڕەکـانیـەوە هەمـوویانیان سەربڕین . عەباس میر
بەگی مەنـوچـەهـری سەقـزیو سوبحان وێردی بەگی کوڕی محەمە
حوسەین بەگ و چەند کەسێکی دیکە لەناو ئەم سەربراوانەدا بوون .

والی لە کاتێك دا کەهیچ دڵی بەم سەرکەوتنە خوێناویە خۆش نەبو،
چونکـە هەردوو کوڕەکـانی ، محـەمـەد سادق خان و حەسـەنی تێـ
برینـدار بوون ، خەبـەری سەرکەوتنیشی لە شەڕ و هەراکەی شەڕەکە
بانەداو شکانی فەتح عەلی سوڵتان و بە تالان و بڕوبردنی ناوچەکەی.

یشت. محەمەد ئاغای باپیری سەروەری ئەم نووسیارە بەرانبەر ئەم
زمەتە گەورەیە بە جوبەیێکی تورمەو شیرێکی دەبان خەلات کردو لە
ـو خەلـك دا سەری بڵینـدو پایـەی بەرزکـرد. ماوەیـەکیشی لەو
ەرسنــوورانـە، بـۆ بەرێـوەبـردنی کاروبـاری ئەو ناوە هێشتـەوە. بۆ
ێشی لەگەڵ برینداره‌کان دا گەڕایەوە. والی پاش ئەوەی گەیشتە شار
ەکیم و نۆشــدارانی بۆ چارە کردنی محەمەد حەسـەن خانی کوڕی
ۆکــردەوە، تەنــانــەت لەپـاشـان حەکیمێکی ئینگلیـزیشی کە ناوی
یلەقووس بوو و لە تەورێز، لە خزمەت (نائب السلطنه)عەباس میرزا
و، بۆ چارەسەری کورەکەی بانگ کردە سنە بەلام لەبەر ئەوەی کە ئەو
ۆە بەهیممـەتە، ڕۆژی خۆی تەواو ببوو چارەو عیلاج کەڵکی نەبوو،
ش ماوەی بیـست و دوو ڕۆژ، لە تەمـەنی بیست و دوو ساڵی دا مەلی
یانی بەرەو کۆشکی بەهەشت هەڵ فڕی.

ریغا ازان میر روستم سیر
ژان زور بازوی‌وفر و هنر
ریغا ازان غیرت مهروماه
یگر یوسف بودو در مصر چاه
ز آیین چرخ فسونگر فسوس
ە از گیتی ربودش بە گاه جلوس
لی نیست ازین غم نـالد چو بید
لی رسم ماتم چنانش سزید

لی لە ناو ئەم ئەهامەتی‌یە سامناکە میشکی تێك چوو لە خەم و خەفەتان
یت بوو وتـا مردیش هەر بەو دەردەوە تلایـەوە. کاتێ ئەم خەبـەرە بەر

گوێی شای قاجار کەوتەوە، زۆری لەبەر گران بوو. خەفەتێکی زۆری بۆ خوارد چونکە پیاوێکی بە دەس وبردو لێ هاتوو و چاپك و چالاك بوو شا لەم بارەیەوە، تا بڵێی خەمبار بوو تەنانەت نارەزایی و نەفرینی خۆی بە محەمەد ئاغا ، باپیرەی نووسیاری ئەم کتێبە کە ئەمانوڵڵا خان بەناوی باڵیوزەوەی ناردبو بۆ دەرباری قاجار بە ئەمانوڵڵا خان ڕاگەیاند. شا لەم کردەوە ناپەسەندەی ئەمانوڵڵاخان زۆر تووڕە بوو زۆری خەفەت بۆ لەناوچوونی ئەو نەوجوانە خوارد.

پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێ فەتح عەلی سوڵتان ، کە لەمەوپێش لەبارەیەوە دواین، خۆی گەیاندە هەرێمی ئازەربایجان و لەو هەرێمەدا بەدەست سەربازانی (نائب السلطنة) شازادە عەباس میرزا لەسەر کردەوەکانی خۆی گیراو بە پێوەندکراوی، بە دەست پیاوەکانی والی یەوە دراو یەکسەر ڕەوانەی کوردستان کرا. پاش ئەوەی چەند مانگێ کە لە ماڵی ئیسماعیل ئاغا، مامی نووسیاری ئەم کتێبەدا بەندکرا بوو، بەسەربرد، بە پێی ئایەتی قورئانی پیرۆز «السن بالسن والجروح قصاص» بەدەست کورانی ئەحمەد سوڵتانی خوالێ خۆشبووەوە دراو لە مەیدانەکەی پێش دەرگانەی بارەگای فەرمانڕەوایی دا، لە تۆڵەی خوێنی باوکی سینەو گەروویان هەڵ دری. پاش ئەو ڕووداوانەی باسمان کردن بەسێ ساڵ کاتێکی ئەمانوڵڵا خان لە تاران بوو، شای قاجار یەکێ لە کچە ڕەوشت پاکـــــەکانی خۆی کە لە جوانی بێهاوتا بوو و وەکو خور دەدرەوشایەوە ئەوێنەی گەوهەری ورشەدار دەچریسکایەوەو جوانانی دنیابوو دا بە خوسرەو خانی کوری والی ، کە پاش خۆی دەبوو بە جێگری و زوریش خۆشەویستی باوکی بووو بەمە خوسرەو خان بە زاوایەتیی شای قاجار سەربەرزکرا.

پاش ئەوەی والی گەڕایەوە، یەك سالی خشت خەریکی ئەم کاری خێرە بوو. پاش سەروبەرنانی هەموو پێدویستی‌یەك لەگەڵ گەورەپیاوانی ئەیالەت و چەنـد خانمێکی سەرەی ئەندەروون و خاتوون جانی خوشکی والی و دوو سێ کەسێ لە ژنانی میران دا بەرەو تاران بەرێ بەرێ کەوتن لە تاران ماوەی مانگی بەوپەری کەیف سازی و شایی و زەماوەندەوە سەرگەرم بوون و نزیکەی سەت هەزار تمەنێ بۆ سەروبەرنانی ئەم شایی و ژن هێنانە خەرج کرا. لەم سەت هەزار مەنە، چل هەزار تمەنی بۆ ئالاو والا و بۆ بەزەك ودۆزەك خشڵ و زێر وزێوی بوکێ خەرج کرا خوالی خۆشبوو، باوکم بۆ خۆی سەرپەرشتیی ئەم زەماوەندەی کردووەو هەر خەرج و پوول و دراویکی بو شیرینی‌وخواردەمەنی خەرج کراوە ئەو سەرپەرشتی‌بووە.
دەگێرنەوە: لەم شایی‌یەدا دە هۆرنوقڵ، لەگەڵ چەند تێر قەندو نەباتی سپی و چەند شیرینی‌یەکی تر، بە خەرج دراوە.
ئیتر ئەو دواکەیشی هەر بەم پێودانە بووەو دەبێ هەرواش لەقەڵەم بدرێ.
ئەم شایی‌یە تا نووسینی ئەم کتێبە، کە بیست و حەوت سالی بەسەردا ڕابراوە، هێشتا لە سەرانسەری ئێران دا هەر بە سەرزاری مەزن و چووکەوە دەگەرێ بەلێ تاکە بەیت:
:استانیست کە بر سر هر بازاریست
بەکوردی:
:استانێکە لە هەر سەر بازارێك هەیە.
پاش ئەوەی گەیشتنە سنە، چەند شەوو ڕۆژێکیان لەوێ، بە کەیف و شادی بەوە ڕابواردو، بەزم و ئاهەنگێکی بە شکۆو هەیتوهووتیان گێرا

، بەلام چۆن شکۆو هەیتوهووتی، ئەستێرەی زۆیرە تێدا خۆشخوان و مانگی تابانی تێدا سەماکەر.

بەرهەمی ئەو هاوسەری بە سێ نێرینەو سێ مێ ینە بوون. نێرینەکان: رەزاقولیخانیوالیو غولام شاخان و خان ئەحمەد خان بوون، مێ ینەکانیش، یەکەمیان خانمی خانمان، کیژە گەورەی بوو، کە بووبە هاوسەری ئەردەشێر میرزا، برای پشتیی محەمەد شای قاجار. دووەمیشیان نێوی عادیلە سولتانەو نازاناویشی بە (خانم) رۆیشتووەو، هاوسەری حوسەین خانی فەرمانرەوای شیرازە. کیژی سێیەمیشیان لە هەموویان کلۆل ترە، ناوی (ئاغاخانم)ە، کەهێشتا کیژەو لە کن براکەیەتی خودا دەستی بە بالآیانەوەبێ:

دوو سێ سالێ، پاش بە خۆشی گوزەراندن و رابواردن، لەبەرئەوەی کوردی ناوچەی سلێمانیو شارەزوورو هۆزی جاف، کە لەسەرسنووری ناوچەی سنە پەزو ئاژەلیان دەلەوەراند، پێیان لەبەری خۆ زێتر راکێشا بووو ئاژاوەییکی زۆریان لە ناوچەکەدا نابۆوەو والی هەرچەندی دەکرد، ئەم کردەوەیەی بۆ قووت نەدەچوو، بریاری سەرکوت کردنیانی داو دەگرژیان راچووو تیرەو هۆزەکانی جافی سەرلەبەر، چەپاوداو تالآن وبرۆی کردن و زۆربەی ناوداران و بەریزانیانی لە شیر کێشان. لەم دەگرژراچوون وشەروشۆرەدا لە شکری سەرکەوتووی ئەمانوللا خان پەنجا هەزار تمەنی زێتر بە دەست کەوت و هەمووی بۆ سنە ناردبۆ والی، خۆیشی بە تەنتەنەو هەیتوهووتەوە، لەسەر مەریوان و شارەزوورەوە هاتە ناو شاری سلێمانییەوە، مەلبەندی پاشاکانی بابان. ئەوسەروبەندە مەحموود پاشا میری بوو پاش گەیشتنی والی چەند رۆژێ، مەحموود

پاشـا ، به خۆی و دەستـەودایـەرەو پیـاوماقـوولان و بازرگـان و بازاڕیـانـەوە ، شاری سلێمـانییـان چۆڵ کردو وردبـاریـك بۆی دەرچـوون و هەرچی ماڵ و سامـانێـکی لە مزگـەوت و تەکیـەو خەلـوەتخـانەو کولبەدا شار دبوویانەوە هەمووەگیر لەشکری ئەمانوڵلا خان کەوت .

پاشـا دوو سێ ڕۆژی سەبـارەت بە ناسازی ئاووهەواو گرەو گەرماو بلاوبـوونـەوەی پەتـاو ڕشـانەوە لە قەلەمرەوی ئەمانوڵلا خان دا زیاتر لە سێ هەزار کەسی لە لە شکرەکەی لە ناوچوون ئەوانەی مانەوە ، ناچار مەلبەندی بابانیان بەجێ هێشت و یەکراست بۆ ئەردەلان گەڕانەوە .

وەلەد بەگی جافیش کە یەکێ لە هەرە پیاوەگەورەکانی کوردبووو ئەم هەلکـردنـە سەر مەلبـەنـدی بابـانەی ، هەر لە بنەڕەت دا ، بۆ سەرکوت کردنی ئەوبوو ، دەسگیـرکراو والی بەگەڵ خۆداو هێنایە شاری سنە . ڕۆستـەم بەگ و حەبیب بەگی بەنـامێ کورانیشی لە قەلای قەسـلان زینـدان کردن ، بەلام کورەکـانی وەلەد بەگ ، سەرەنجـام هەلیـان وەگیـرکـەوت و لە قەلاکـە هەلاتن . وەلـەد بەگ ، بۆ خۆیشی ، بەر نوازشتی والی کەوت و لێی خۆشبووو یەکێ لە کیژە بە ئابڕووەکانی ، کە بەڕاستـی لە ئاسمـانی داوێن پاکی و جوانیدا مانگی تابـان بوو ، دا بە حوسـەین قولیخـان و سەری بێ بلیندکـرد . وەلـەد بەگ ، بـۆ خۆیشی ، لەسەر ئارەزووو خوایشتی خۆی گەڕاندەوە بۆ نیوتیرەو کەس وکاری خۆی لە دەوەوبـەری سالی ١٢٣٧ك دا ، ئەمـانـولـلاخـانی گەورە تووشی مجێـز تێکچـوون وبێ سەلیقـەیی هات . لەپـاش سێ و چوار سالێ ، لە سەرەتـای زستـانی سالی ١٢٤٠ك دا ، بەنەخۆشیی جەرگ ، چاوی لە دنیا پۆشی ، «انا لله وانا الیه راجعون» .

پاش پرسەو پرسەکاری لەبەر تەڕوتووشی و ساردو سەرمای ئەو ساڵ تەرمەکەیان لە کۆشکێکی خاڵیدا داناو ، چەند قورئانخوێنێکیان لەسەر دانــا ، قورئــانی لە سەر بخــوێنن . چەنــد ڕۆژێ پاش نەوروز ، بە هەیتوهوتێکــەوە ، مەرگــە هەر شایــانی میـر و میرزادان بێ تەرمەکەیان هەڵگرت و لەنزیك والی‌یە گەورەو بەشان و شکۆکانی ئەردەڵانەوەیان ناشت .

خواڵێخۆشبوو لەسەردەمی فەرمانڕەوایی دا حوکمڕانیی ناوچەی جوانـرۆو هۆزی جافی بە محـەمـەد سادق خانی کوڕە گەورەی سپاردو کاروبـاری ئەسفـەنـدئـابـادو چاردۆلێشی [٦٤] بە حوسەین قولیخانی لۆ هاتوو ئەسپارد . یەکێ لەو خان ومان و کۆشك و سەرا بلێندو جوانانەی لەو میـرە پادشـا دروشمە بە یادگار ماوەتەوە کۆشکی ئەندەروونەو یەکێ لەو مەیـدانە دڵ کەرەوەیەی بەردەمی نێوی باخچەی گولستانەو بیناکانی دەرەوەی کە بریتین لە داڵان و چەند ماڵێك و کلاوفەرەنگی یە ك و چەند کۆشکێکی بەرز شان لە شانی خەوەرنەقی بارام دەدەن .

هەروەها کۆشکی دڵ گوشا [٦٥] یەکێکـەی لە بینـاکانی ئەو میرە وڵات گیـرە کە لە هەمـوو دنیـادا ناوی دەرکردبوو . یەکێکی دیکەی بیناکانی ، بینـای خوسـرەوی یەو مزگـەوتی (دار الاحسان) [٦٦] ولەگەڵ (المسجد الاقصی) دا هاوتـایـە ولـەگـەڵ (البیت المعمور)دا هاوشانە . هەروەها کۆشکێکی تری بەشـان وشکـۆی دیکـــەهەیە لە پاڵ (دارالاحسان)دا . کۆشـــکـــی سەرهـــەنـــگ خانـــی ومەیـــدانی‌دەمـــی دەروازەی (دار الایـالـەیش)هـەن و بازاڕێکیش هەیـە ، لە دەرەوەی‌قەڵای‌شارەکـەیە . هەروەها کۆشك وباخی خوسرەوئابادیش هەیەکە هەر لە ئاسەوارەکانی ئەمـانـوڵـلا خانی گەورەیەو سەرچاوەی شیربنی‌لەئاوی ئەو هەڵ دەقولێ

وگـولزاری ئیرەم جوانیی خۆی لە تەرو پری و چیمەن و شەقامەکانی ئەو بەقەرز وەرگـرتـووە . هەردەلێی ئەوەی لەسـەر ئەم زەوینەی بنیات ناوە خوسـرەو وئـاباددی نێوناوەپەرە چیمەنـەکـانی کانی شیفا کە لە کەژەکانی ناویـدەرن و باخ و وکـۆشکی حەسـەن ئاباد کە لەسەر گردیکی دەورو پشت ئاوەدانن و هەروەهـا قەلاو کۆشـك و بازاری قەیـسـلان ئەمـانـە سەرلـەبـەریـان لە بینـاکانی ئەون . بە کوردی . باس کردنی ئەم هەموو بینـاو کۆشك، تەلارانـەی کە ئەم میـرە گەورەیـە رووی ناون لەم چەنـد لاپـەرەیـەدا جێ یان نابێتـەوە، ناچـار، دەبێ بەم چەنـد دێـرە دوایـی بەقسـەکـەمـان بێنین . لە ئاکـام دا چونکە رۆژی دوایی ئەم میرە مەزنە هات و هاواری «ارجعي الى ربك» لە پێوارەوە بەرگوێ کەوت ئەوساکە نە مال و سامـان و نە شان و شکـۆو تەنتـەنـەو سەنسەنە ، هیچی فریای نەکـەوت و پاشـان بەرەو نەمان کەوتە پەرواز . بەڵێ : «یوم لاینفع مال ولابنون الامن اتى الله بقلب سليم» .

## خوسرەوخانی سێیەم

کاتێ ئەمانوڵڵا خانی مەزن چاوی لە دنیای ڕۆشن لێك نا، خوسرەو خانی کوڕی کە لە ژیانی خۆیدا جێنشین بوو، چووە سەر تەختی فەرمانڕەواییو زۆر بە شکۆوە کاروباری باوکی بەڕێوەبرد. لەسەرەتای هاوینی ئەو ساڵەدا، کاتێ شازادەی بێهاوتا، حوسن جیهان خانم سکی لە خوسرەو خان پڕبوو، بە نیازی دیەنی شای قاجارەوە کە بە ڕێوڕەسمی هەمیشەگی لەچیمەنی سوڵتانییە بوو، بەڕێ کەوتن. لەم سەفەرەدا شازادەی سەرفراز، نێرینەیێکی بوو، نێویان بە نێوی ئەمانوڵڵاخانی گەورەوە ناو ناو نازناوی غوڵام شای پێ درا. میرزامورتەزا قولی موخلیس کوڕی خوالی خۆشبوو میرزا عەبدولکەریم، کە خاوەنی نیهادێکی پاك و ڕەوشتێکی ڕاست بوو خوسرەو خانی والی لە ڕووی لوتف و نوازشتەوە، ناوی نابوو میرزای ڕەفیق. لەبارەی چوونە سەر تەختی خوسرەو خان ئەم سێ بەیتەی هەڵبەستووە. وای بەجوان دەزانین بەم بۆنەوە بیان نوسین:

شبهی در وادی فکرت فتاده
ز بهر مصرع اندر یك و دو
پی تاریخ سال فوت والی
هم از بهر جلوس والی نو
خرد گفتا که در ملك ایالت
امان اللەشد و بنشست خسرو

پاش ئەوەی خوسرەوخان لەم سەفەرە پیرۆزە گەڕایەوە دەرووی گەنجینەی والی خوداڵێخۆشبووی باوکی کە زیاتر لە بیست کروور نەختینەی تێدابوو، کردەوە خەڵکەکەی بە چینی سەروو و چینی خواروو وە، هەریەکە بە پێی پلەو پایەی خۆی بەشێکی لەم گەنجینەیە پێ بەخشی.

ئەم کردەوە پەسندەی والی بوو بە مایەی ئەوە کە خەلکەکە بە دلەوە لە نیهادپاکی و ئاکارپەسندیی والی ڕازی بن. لە سەردەمی هیچ والی‌یەکی پێش خوسرەوخان دا، تا ئێستا وا ڕێک نەکەوتووەو نەبیستراوە کە گەورەو بچووک، سەرلەبەر لە فەرمانرەوایی، بەو ئەندازەیە ڕازی و شادمان بن و بەدڵ و بە گیانەوە مل کەچ و گوێ بەفەرمانی بن، حەیدەر سوڵتان و محەممەد سوڵتان. سەبارەت بە چەك و جبەخانەی زۆر وزەوەندو بەدنیهادی‌یان لە خۆیایی‌بوون و لێی یاخی بوون و لە دژ والی ئاڵای خراپەو مایەفیتنەیی‌یان هەڵکردو دایانە کەژە سەختەکانی هەورامان.

ئەمانە سەرەرای ئەوەی کە بۆ دڵ دانەوەو لە کەلی‌شەیتان هێنانە خوارەیان هەوڵ و کۆششکی زۆر بەخەرج درا، بەلام هەرلەسەر کەلەوە کێشیی خۆیان ڕۆیشتن، پشتیان لە والی کردو ئەو هەموو هەوڵ دان و تەقەلایە بێ سوود بوو. والیش نەی‌کردە ناسەردی بڕیاری گوێ‌ڕاکێشانی یاخی‌یەکانی داو بۆ ئەم مەبەستە محەممەد خانی سەرهەنگی، کە برای باوکی‌ودایکیی خۆی بوو، ڕاسپارد، لەشکری ئەردەلان بە سوارەو پیادەوە بۆ گوێ‌ڕاکێشان و سەرکوت کردنی یاخی‌یەکان بەڕێ بکەوێ. کاتێ کە یاخی‌یەکان ئەم خەبەرەیان پێ گەیشت، خۆیان لە چیا سەختەکانی هەورامان دا حەشارداو سەنگەری

شەڕیـان لێ دامـەزرانـدو ئەسپـابی شەڕو شۆڕیـان بۆ شەڕکـەران ئامـادەکرد. محەمەد خانی سەرهەنگ لە سەنگەرەکانیان نیو فەرسەخی نزیـك بۆوەو لەوێ بارو بـنـەی خـست و دوو سێ ڕۆژێ لەوێ حەسانەوە. سەر لەبەیانی یەك، کاتێکی گلۆلەی یاخی یەکان بەرەو لێژی دەچوو و ئەستێرەی بەختیان بەرەو کشان دەڕۆی، لەناکاو هێرشیان بردە سەر لەشکـری محـەمـەدخـانی سەرهـەنگ و وەبەر دەسرێژی گوللەی تفەنگ و دانەی تۆپ دران. محەمەد خانی سەرهەنگ، کە لە ئازایەتی و بەجـەرگی دا شێـری بێشـە بوو، سەرەڕای ئەوەی کە تەمـەنێکی زۆری نەبـووو لە شەڕنـاسی دا کەم ئەزمـوون بوو، شەڕی بە شایی هاتـە بەرچـاو و کەلەمێرانە سوار بوو، لەشکرەکەی خستە مەیدانی شەڕەوە. بەڵام سەبارەت بەوە کە مەیدانی شەڕ تەنگ بووو بواری ئەوەی نەدەدان تێك گیرێن، تەنیا هەر لە دوورەوە دەسرێژیان لێك دەکردو چەند کەسێ لەهەردوو لا کوژران. ئاغا جەعفـەری ئەردەڵانی یەکێ لەو کوژراوانـە بوو. شەڕەکـە وا گەرم بیـوو، شریخـەی جانبیـزاروئەرەو نەعـرەتـەی شەڕکـەران حەوت تەوەقـەی ئاسمانی هێنابووە لەرزە. بەڵام سەبارەت بەوەی کە سەنگـەری یاخی یـەکسان بە تیخـەی شاخـەکـانـەوە بووو سەنگـەری لەشکری محەمەد خانی سەرهـەنگ لە داوێنی شاخەکان دا بوو، شەڕکـەرانی محـەمەد خان زۆر پێش کەوتن. سەرەنجام شێرانی ئەردەڵان چاکی ئازایـەتی یـان لێ بـەداراکـردن و هەڵیـان کوتـایـە سەر سەنگەری ئەو ملهوڕانە. وا دیار بوو نان ونمەك یاخی یەکانی گرتبوو، لەنـاکـاو حەیـدەر سوڵتـان کە سەرۆکی ئەو یاخی یـانـە بووو بە مایـەی شەڕو شـۆڕو ئاژاوەنـانەوە، هەر لە خۆڕا، سەنگەری بەجێ هێشت و مەیـدانی شەڕی چۆڵ کردو لەگـەڵ شەڕکەرەکانی دا بە تەپڵ و کەڕەناوە

هاتە خوار و لە دەوری کانیاوێ کە لە داوێنی چیاکەدا بوو دامەزرا. کەڵەمێردانی ئەردەڵان بێ ئەوەی چاو لە تیر و گوللە بترووکێنن، هەڵیان کردە سەر ئەو نمەک حەرامەو وەك گوستیلك ئاڵقەیان دان و زۆربەی شەرکەرەکانیان بەدیل گرت و زۆریشیان لە شیرکێشان. سوڵتانیش بۆ چارەسەری دەردی بێدەرمانی خۆی هەڵ داشتە نێو ئاوێ، خۆی بشاریتەوە، دادی نەخوارد، چەند کەسی لە شێرانی سنە لەنساو ئاوەکە تێی ڕۆهاتن و گیانیان بە ئاگری دۆزەخ شادکرد. لە سەرێکی دیکەوە، جەعفەر سوڵتانی ئاجودان باشی بە لە شکرێکەوە هەڵی کردە سەر سەنگەرەکانی محەمەد سوڵتان و شەڕ گەرم بوو و لە هەموولایەکەوە گوللە وەك تەرزە بە سەر شەرکەرانیدا دەباری. لەشکری جەعفەر سوڵتان بێ هیچ ترس و سڵەمینەوەیێ، بە هێرشی مەردانە ئەو شوێنەیان لە گەمارۆی محەمەد خان خاوێن کردەوەو سەری زۆربەی یاخییەکانیان لەخاك و خوێنی ڕیسوایی‌دا گەوزاندن. محەمەد سوڵتان کە ئەوەی‌دیت، لە هەڵاتن بەولاوە هیچ چارەسەرێکی دیکەی بۆ نەمایەوە. ئیتر بەم ڕەنگە هەڵات و خۆی گەیاندە ناوچەی شارەزوور. برێ لە بابسانەکانیش کە بە یارمەتییەوەی هاتبوون ئەوانیش لەبەر ئەردەڵانییان، زەبوون و بێچارە ویستیان بۆی دەرچن، جەعفەر سوڵتانیش زارکی ئەو دەربەندەی تێدابوون لێ گرتن و ڕێگای لیوە هەڵاتنی لێ بەربەست کردن. بەلام برێ لە گەورە پیاوانی سنە وەك میرزا عەبدولکەریمی موعتەمیدو میرزا هیدایەتوللای نەمین و ئەمانوللا بەگی وەکیل، کە لەو سەروبەندەدا یوزباشی بوو و محەمەد ئاغای نازر و محەمەد سوڵتان. فەرمانڕەوای سەقز. شەمروبان بەرژەوەندیان لەوەدا دیت کە بابانەکان دەربازکرین و

فەرمـانیـان دا دەرگـای دەربـەنـدە کەیان لێ‌یکەنەوە. جەعفەر سولتانی سەرهەنگە پاش ئەم سەرکەوتنە بەناووبانگە، بە تالآن و دیلێکی زۆرو زەوەنـــدەوە گەڕایـــەوە بۆ سنـەو لە هەزار لاوە ئافـەرین و بتـرەژەم کرا. شەرکـــەرانـیش هەر یەکـــە بە جۆرێ خەلآتـی خۆی وەرگـــرت و بەر نوازشتی والی کەوت. جەعفـەر سولتـانیش بە خەلآتی نیشانەی بەردی بەنرخ لێ‌چەقێندراو، لە ناو دۆست و هاوالآنی‌دا سەرفراز کرا.

جەنـــابی خوســـرەوی سێ‌یـــەم زۆری حەز لە ڕابـــواردن و خۆش گوزەرانی دەکرد، دەنگی ئارەزووی ڕابواردن و خۆش گوزەراندنی ئەم پیاوە داستانی بارامی گۆڕی لە بیـری خەڵك بردبۆوەو ئەو حەزرەتە یەك پارچـە بوو لە پۆپـەی مرۆڤایەتی. لە قۆزی‌و قۆچاخی‌دا بە یوسفی دووەم لە قەڵە دەدرا.

خوسـرەوخـانی سێ‌یـەم لە خۆشنـووسی‌دا دەفتـەری مامـۆستـایانی پێشووی لەبلو بردبووو لە برەوو ڕمێنی خستبوون. لە چەندین چەشنە ئینشـــانـووسی‌دا ئوستـادانی ئینشابە شاگردی دەشیان. سـەدەفی خامەی دورڕی ئاوداری لێ‌دەچکـــا، دەریـــای بیـری گەوهـــەری شاهـانـــەی لێ‌هـــەڵ دێنجـــرا. لە دەمبـــلآوی‌و دلآوایی‌دا داستـانی حاتـەمی تەی پڕ وپـــووچ ، لە دادو دادگـــەری‌دا ئاوازەو دەبـــدە بەو هەیتـــوهـــوتی خوسـرەوان هیـچ و پووچ. لە سەر وبـەنـدی فەرمـانڕەوایی‌دا کارمامز شیـری لە گواتی دێڵەشێـران دەمـژی ، لـە سەر وەختی توان وگوری باز کەوی لە ژێـر سێبـــەری‌دا دەحـــاوانـــدەوە. بە کورتی، لەســەردەمی فەرمـانـڕەوایی خوسـرەوی سێ‌یەم دا ناوونیشانی چی‌یە لە زۆرو ستەم نەمابووو تێلآو تازیانەی باجگر بیوون بە ئەفسانەی سیمرخ و چیرۆکی ئیکسیـر و کیمیا، بەلآم لە بەرایی فەرمانڕەوایی دا لەبەر کەم ئەزموونی

، تووشی چەند هەلەیی هات: باپیر و باوك و مامەكانی نووسیاری ئەم كتێبەی بە بێ تاوان كۆت و زنجیر كردو زۆر بە بێ بەزەیی‌یانە و رەفتارێكی دزێوەوە سێ هەزار تمەنی بە ناوی باجەوە لێ ساندن. سەرەنجام خودا كردی بەدینهادیو دڵ پیسی بەدكارانی بۆ ئاشكرا بوو و لە دووی ناردن و بە خەلاتی گران بایی‌و شایان سەربەرزی‌كردن. هەروەها لەگەڵ براكانیشی‌دا زۆر بێ‌بەزەیی‌رەحمانە بەی‌بەزە جوولایەوەو هەر یەكەیانی بەجۆرێكی وا ئازارو ئەشكەنجەدا كە لە كونجی سەركزی‌دا فەراموش كران. تەنانەت یەكێ لەو برایانەی كە عەباس قولیخانەو لە سەردەمی باوكیان دا پلەو پایەی جێگری گرتوە ، هەر پاش مردنی باوكی بە ماوەیەك لێخراو كۆت و زنجیر كرا و

لە زیندان هاوێژراو لەگەڵ دایكی عەباس قولیخانیش دا هەر بەو بێ‌بەزەیی‌و رەفتارە ناهەنجارە دزێوە جوولایەوەو هەرچی دارایی‌و سامانی هەبوو، دوور لە رەوشتی بەرزو ئاكاری گەورەیی، لێی داگیركرد. هەروەها حوسەین قولیخانی برای لەسەردەمی باوكی‌دا فەرمانرەوایی ئیسفەندئابادی پێ سپاردرابوو، سەرەرای هەموو مل كەچی‌و گوێ‌رایەڵی‌یەكی، دوای ماوەی سالێك، دەستی لە كاركێشایەوەو لای بردو فەرمانرەوایی ناوچەكەی بە بابا خانی مەراغەیی سپارد. حوسەین قولیخانی بێ‌چارەیش هیچی بۆ نەمایەوە، هەر ئەوەندەی بۆ لوا، هەرچی سەروەت و سامانێكی نەختینەی هەبوو پێچایەوەو بە قورئانێكەوە، بە هەلمداوان چوو بۆ خزمەت خوسرەو خان ، رای‌گەیاندێ: ئەوەی هەبەتی‌و نی‌یەتی، هەر ئەمەیەو بەس ، ئیتر هەلی‌گرەو لە كوڵم بەوەو رێسی ملم مەخە ژێر بیوری سەربرەوە. ئیدی بەم شێوەیە، گیانی قوتاركرد. وەك لە پێشەوە گوتمان ، باوك و باپیرم بەر

تووڕەیی خوسرەو خانی سی‌یەم کەوتن و ئیتر لەم ماوەیەدا ڕێك خستنی کاروباری فەرمانڕەوایی ئەسفەندئاباد و بریکاریتی کوردستانی لەنوێوە دووبارە بە حوسەین قولیخان سپاردەوە.

محەمەد سادق خانیش دوای مردنی ئەمانوللا خان گەڕایەوە بۆ شاری سنەو مل کەچی خوی بۆ خوسرەو خانی برای ڕاگەیاند. بەڵام ساڵێکی نەبرد ئالای سەرکێشی و سەرپێچی هەڵ کردو لە ناوچەی جوانڕۆ یاخی بوو. خوسرەو خانیش سا بە هەرچی فرت و فێڵی بوو، فریوی داو هێنایەوە بۆ سنەو پاش ئەوەی هەرچی‌یەکی هەبوو لێی داگیرکرد. لە بالاخانە کەی پاڵ تالاری خوسرەوانەی‌دا، دوو سێ ساڵێکی زیندان کرد. بەڵام لە پاشان خانمەکانی ئەندەروون بۆی تێ کەوتن، ڕزگاریان کردو دووبارە فەرمانڕەوایی جوانڕۆی پێ سپێردرایەوە. بۆ ماوەی نۆساڵێ فەرمانڕەوایی ولاتی بەوپەڕی سەربەخۆیی‌یەوە بەسەربرد. تەنانەت لە گوڵزاری سەردەمی فەرمانڕەوایی‌دا درکێ بە داوێنی هیچ گوڵچنێکدا نەچەقی و لە پیالەی ڕۆژگاری‌دا چێژی هیچ گوشەنشینێك تاڵ نەبوو، مەگەر هەر ئەوە نەبێ کە لەسەرەتای بەهاری ساڵی ١٢٤٦ ی ك دا، ئاهۆییکی پیس لە ولاتی ئەردەلان بلاوبووەوە زیتر لە هەشت نۆ هەزار کەسێکی لەناوبرد. بۆ نموونە ئەللا ویردی خانی کوڕی نەزەر عەلی خان و عەلی موراد سوڵتانی کوڕی و چەند کەسێکی لە خزمانیان و جەعفەر سوڵتانی ئاجوودان باشی و ئامۆزای باوکی منی کەمینە، کە شێری مەیدانی خۆی بوو. شەربەتی شەهادەتیان نۆشی. ئاهۆکە بە ڕادەیی بوو. سەرلەبەری خەڵکی ولات ناچار دایانە کەژ وکێو و دەشت و چۆڵ و پەنایان وە بەر بەرەیی و فریای خوداوەندی گەورەبرد. پاش سێ مانگ، لە سەرەتای

مانگی (محرم)ی سالی ۱۲٤۷ی ک یەوە خوداوەند بەزەی بەخەلك دا هاتەوە، ئاهۆ بەسامەکە رەوی‌یەوە. ئەوەی لێی رزگاربوو گەرایەوە بۆ مەلبەندی خۆی. لە کاتێکدا کە دەولەتی رووسیا باسکوفیچی بۆ داگیرکردنی ئێران راسپاردبووو پاش چەند شەرێکی گەرم، برێ ناوچەی لەسەر سنوورەکانی ئازەربایجان داگیرکرد. ئەکبەر بەگی کوری محەمەد زەمان بەگی وەکیل و چەند کەسێ لە خزمان و کەسوکاری بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دیت حوسەین قولیخانی والی زادەیش کە تازە لە فەرمانرەوایی ئەسفەندئاباد لێ خرابوو لەگەل خۆیان دا هاودەس کەن، بەلام ئەوانەی سەرپێچی‌یان لە دژی دەکرد چۆنێتیی رووداوەکەیان یەکسەر لە والی راگەیاند. لەبەر ئەوەی کە حوسەین عەلی خان زۆربەی سامان و نەختینەکانی لەکن بنەمالەکەی منی کەمینە دانابووو نیوبراو سەبارەت بەوە کە لەباوکەوە پوورزایلم بوو، کاربەدەستانی والی بۆباوکمیان تێ چاندبووو لە داستانەکەوەیان وەرداو لە کارەکەوەیان گلاندوئەوەیانکرد بە بیانوو. ئەو سامان و نەختنیەیەیش کە هەمان بوو لیمانی دائگیرکەن و ئەویش بخەنە سەر گەنجینە. بەم مەبەستە حوسەین قولیخانیان فریوداو بەلێنی فەرمانرەوایی ئیسفەندئابادیان دایێ و ئەمیش کە هێشتا ساردیو گەرمی و تالی وسوێریی ژیانی بۆ کەس تاسەر نەماوی و نەچێژتبوو، بە تەماحی فەرمانرەوایی‌یەوە پشتی لە مافی خالۆوخوارزایی هەل کردو پاشان بە بیانووی بەسەرکردنەوەی یەکێ لە ئامۆزاکانمان کە نەخۆش کەوتبوو لە دوای باوکی نارد. هەرکە باوکم گەیشتە ئەوێ، حوسەین قولیخان کۆرێکی بەست و لە دژی والی دەستیان بە وتوویژکرد. بەلام لە دەرەوە، چەند کەسێکی لە پشت پەردەوە لێ‌راگرتبوون ،گوێیان

لەهەموو کەین و بەینەکە گرتبوو. ئەو شەوە بۆ سبەینێ محەمەد بەگ و مستەفا بەگ کوڕانی فەتح عەلی بەگی وەکیل و ئەکبەر بەگ کەببوو بەمایەی ئەم هەنگامەیەو سوڵتانی کوڕی نەزەر عەلی بەگ و ئەبولحەسەن بەگ، باوکی ئەم کەمینەیەو مام و ئامۆزاکانی دیکەی سەرلەبەر فەرمانی کۆت و زبجیرکردن و زینداان کردنیان دراو هەموویان گیران و بە کۆت و زیجیرکراوییەوە زیندان کران. پاش چەناتێ فەتح عەلی بەگ و سوڵتانیان لە قەڵای قەسلان دا کوشت. ئەکبەریش بە هەزار تەڵەکەو دەهۆ، سا هەر چۆنێ بوو، سەری خۆی ڕزگارکرد. مامی ئەم کەمینەیەیش، چونکە هیچ تاوانێکی نەبوو، ئازاد کراو بە بەزەیی و دڵاوایی یەکی زۆرەوە خەڵات کراو ئەوەبوو، بۆ پتەوکردن و چەسپاندنی نێوان تەبایی و نێوان کۆکی لە ئەنجام دا بەندوبەندەواری هاوسەریم لەگەڵ خوسرەوخان دا سەروبەرنراو پەوپەری شان وشکۆوە پێم هاویشتە حەرمسەراوە. بەڵام کارەساتی کوژرانی ئەم پیاوانە لە ئاکام دا بوو بە مایەی ترس و لەرزێکی بەسام و زراوتۆقێن بۆ بنەماڵەکانیان، بەنموونە ئەمانوڵلا بەگ، کوری هەرە گچکەی فەتح عەلی بەگ و محەمەد بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ و هەموو خزمەهەڵە ژێردەکانیان کە دە کەسێ دەبوون هەراسانی و ترس تەنگی پێهەڵ چنین و هەڵاتن و پەنایان وبەر دەرباری تاران برد. خوسرەو خانیش میرزا فەرەجوڵڵای وەزیری کە خاڵی بوو، بۆ دامرکاندنەوەی ئاژاوەکە نارد بۆدەرباری عەلی شای قاجار، بە نیازی ئەوەوە کە بەشکو هەڵاتووەکان بگێڕێتەوەو نەهێڵێ دەوڵەت کەلێنی تێکەوێ، بەڵام لەبەر ئەوەی وەزیر یەکێ لە خانمەکانی ئەندەروونی، کە بە نازناوی تاجودەولە بەناوبانگە کرد بە پێنناوی خۆی و بوو بە هاودەمی شازادە،

سەیفوددەولە، وەك بەدیارەکەوێ خواستەکەی میرزافەرەجوڵڵاڵە خزمەت فەتح عەلی شا هێند بە گەرمی‌یەوە پێشواز لێ‌نەکرا، بەڵام هەر ئەوەنـدەی کرد هەڵاتووەمەکانی بەرەورووی سەیفوددەولە کردەوەو بۆ ئەسفەهـانی ناردن. ئەوە بوو ساڵێ پێش بڵاوبوونەوەی پەتاکەی ساڵی ١٢٤٥ی ك، کە دەمی ودایـەرەی پا تشـا لە ئەسفـەهان هێوری بوون، هەڵاتـووەکـانیان دەمی گیرکردو بە دەمی خوسرەو خانیانەوە دان، بەڵام ئەکبـەر بـەگ بەسپـاڵی دەرۆزەکـەرەوە خۆی ڕزگارکرد مانەوە ئەوانی دیکـە، ئەوانیش بە خەم و پەژارەوە کونجی سەرکـزی‌یان گرت. ئیتـر ئەوە بوو پەتـاکـە زۆری شوولێ لێ‌هـەڵ بری‌و تەشـەنـەی‌کـردو وڵات چۆڵ بووو دنیـا ناخـۆش بوو، بەخـواستی میـرزا فەرەجوڵڵای وەزیرو میرزا هیدایەتوڵڵای ئەمین، عەلی محەمەد بەگیش ئازادکراو بۆ گوندی بلبـانئـاوای یەکێ لە گونـدەکـانی ئـیلاق رەوانـەکـراو لەوێوە ویستی بە یارمـەتیی خزمـەکـانیەوە هەڵێ، بەڵام ژیری‌و زیرەکی‌و ئازایەتیی میرزا جەعفـەری کوڕی میـرزا هیـدایـەتوڵڵا کە لەو نزیکانە نیشتەجێ بوو، ڕیسەکەی لێ کردەوە بە خوری‌و سەرئەکەوت.

لە دوادوای مانگی (ذو الحجـــة)ی ساڵی ١٢٤٩ی ك دا، ئـەو سۆمـای چاوی شان و شکـۆیـە بەپێی (هکـذا وجـدنا اباءنا) تووشی نەخۆشیی جەرگ بوو زۆر بە تەنـگە خۆیـەوە نەهـات و نەخۆشی‌یەکەی تەشەنەی دەکـرد، منیش ئەم کەمینـەیـە کە شەرەفی هاوسـەریم لەگـەڵی‌دا هەبوو شەووڕۆژ بە سەرپـەرشتیی ئەنـدەروون سەربڵیند بووم، بۆ ماوەی دوو مانگی خشت، سەبارەت بەوە کە شەونخـوونی‌یـەکی زۆرم دەکێشـاو هەمیشـــە چاوەڕێ بووم، خەوێکی ڕەحـەتی نەچـووە چاوم، پاشـان، ئەوەی لێی دەتـرسـام، بەسـەرم هات. ئەوەی شیـاوی باسە، لە ماوەی

نەخوشی یەکەی ئەو خودانەدا ئاهوی رشانەوە، پەنا بەخوا، دیسان بلاوبووەوەو خەلکی شار سەریسان لی شێواو هەمووو هەلاتن، بەلام سوپاس بۆ خودا، ئاهوکە زۆر توندو تیژ نەبوو، لە سی چوار کەسی بەولاوە کەسی دیکەی لەناونەبرد، بەلام والیی ئەیالەت مجیزی رۆژ لە دوای رۆژ رووی لە خراتر بوو، تا لە رۆژی دووشەممەی مانگی مەولوود(ربیع الاول)ی سالی ۱۲۵۰ی ك دا مەلی گیانی پرسەرکەوتنی بە هەزار داخ و ناکامی یەوە بەرەو بەهەشتی بەرین هەل فری.

تنی نبود نپیچد زین ستم چون موی در آتش

دلی نبود ننالد زین الم چون رعد در بیدا

ازین غم زیبد ایدر تا دم یوم النشور آید

بود همدوش ماتم در بچرخ چارمین عیسی

ئەم رووداوە دەرگای ئێش و ئازاری لە رووی خەلك خستە سەرپشت و ئاخ و ئۆخ و نالەو شین و گرین گەیشتە ئاسمانی حەوتەم و واوەیلاو فوغانی خەلکی ئەندەروون گوێی گەردوونی کەرکردو رەخنەی لە هەر چوارگۆشەی دنیاکردو چەند رۆژی بە پرسەو پرسەکاری یەوەی سەرگەرم و بەریشان کردن و ئالای خەمباری و لیوبەباری یان ماوەیێکی دوورو درێژ هەل کرد.

ندانم دو چشمم ز غم چون بگرید؟

سزد در جوانیش گر خون بگرید

بەکوردی.

نازانم هەردوو چاوم لە تاو خەم چۆن بگری؟

ئەگەر لەجیاتی فرمێسك خوێن برێژێ سزاوارە

هەر پاش مەرگی خوسرەو خان خەلکی ولاتی ئەردەلان سەبارەت بەوە کە هەر لە کۆنەوە خزمەتگوزارو دل پاك بوون، هەموو قسەیان

بەیـەك كردو میـر زادەی كامـەران . رەزا قولیخـان ، كورە گەورەی حەز رەتی خوسـرەوخـانیـان لە تەمـەنی یازدە سالیدا بە فەرمـانـرەوای خۆیـان پەسـنـدكـرد ، بەڵام هەركـە والـی دەنـگـی مەرگـیوالـی خودالیخـۆشبـوو ، خوسرەوخـان بڵاوبـۆوە ، ئەردەشیر میرزا ، برای محـەمـەد میـرزا ، كوری عەبـاس میـرزای قاجـار بای كوردستـان داگیـركـردنی بەلـووتـەوە چوو ، لەشكـری خۆی خركـردەوەو لە گەرووسـەوە ، كە مەلبـەندی فەرمانرەوایی بوو ، بە نیازی داگیركردنی سنـەوە بەرێكـەوت . لەم سەریشەوە ، شازادەی ئازاد ، حوسن جیهان خانم ، كە هێشتـا تۆزی خەم و پەژارەی كۆست كەوتـوویی نەشتبوو ، نەیكـردە نامـەردی ، یەكسـەر لەشكـری ئەردەڵانی كۆكـردەوە ، بە تۆپخـانەو زەمبـوورەكخـانەو چەك و جیەخانەیەكی گەورەو گرانەوە ، لەگـەڵ حەوت هەشت هەزار كەسێـك دا هاتە بەر مەیـدانی ئەردەشێر میـرزا لە زاغـەو آق بلاق بەرانبـەر یەكتـر خێـوەتیـان هەڵ داوبریـاری شەریـان دا ، بەڵام كاتێ ئەردەشێـر میـرزا بۆی روون بۆوە ئازایـانی ئەردەڵان دەستیان لەگیانی خۆیان شتووەو ئامادەی گیانبازین و هەمیشە گوێبەفەرمانن و هێزەكەیشی توانی شەری ئازا شێردرەكانی ئەردەڵانی نیـیە ، ناچـار پێنـاوێكی بۆ ناوبـژیكـردن ناردە خزمـەت و ئاكـام بە ئاشت بوونەوە گەیشت . ئەردەشێر میرزایش خانمی خانمانی ، كە كیژە گەورەی خوسرەو خانەو پێشترمان باس كرد ، خواست و ئەم كارە بوو بە مایەی ئاشتیو دۆستـایـەتی . پـاش چەسپینی بنـەمـای ئەم ئاشتیو دۆستایەتییەو رێك خستنی كاروباری وڵات گەرایەوە بۆ مەلبەندی خۆی .

# رەزاقولیخان

پاش مەرگی خوســرەو خان کە ڕووداوێکی یەکجـار سامنـاك بوو، کازم بەگی ئەفشــار بۆ ڕاگــەیـانـدنی ئەم هەواڵـە دڵ تەزێنـە ڕەوانــەی دەربـاری قاجـار کرا. هەرکـە کازم بەگ ئەم هەواڵـەی بە شاو خانمانی ئەنــدەروون ڕاگـەیـانـد، خەمبـاریو کوڵ و کەسـەرێ دای گرتن لە نووسین و گوتن نایــەو لە ئەنـدازە بەدەرە. شازادەی ناودار فەتحـوڵـڵا میـرزای شوعـاعـوسســەڵتـەنـەو تاجلی بێگوم خانم، کە براو خوشکی حوسن جیهان خانمن ڕاسپێردران بەشداریی ئەم پرسە گەورەیە بکەن. تەنـانـەت ئەم شازادە گەورانە دوو سێ مانگێ بە بۆنەی ئەم پرسەیەوە لە سنە مانەوەو لە ڕاوێژکردن و یارمەتیدانی والیی لاوچاکیان دا دەستێکی باڵایـان هەبـوو. میـرزا فەرەجـوڵـڵا یوەزیـریش کە پیـاو هەق بێژ لە ڕێورەسمی وەزیـــریدا نیــزامــولمــولکێ بوو بۆ خۆیولە ڕەوشتی سەروەریدا لە ئاســەف لەپێشتر بوو، کاروباری وەزیریی پێسپێردراو سەربـەندی کار بەڕێوەبردنی خرایە دەست. لەبەر ئەوەی داناني بەهرام میـرزا، برای محـەمـەد شا بە جێگرو لادانی محەمەد حوسەین میرزا، کوڕی خوداڵێخۆشبوو محەمەد عەلی میرزا، کە کرماشان و لوڕستان و بەختیاریی بە دەستەوە بوون، بەرەوڕووی میرزا هیدایەتوڵڵای ئەمین، کە پێشتـر باڵیـۆزایـەتیی ئازەربـایجـانی پێ سپێردار بوو، کرابۆوەو لەو کاتـەدا بەهـرام میـرزای جێگـر، بۆ تاران دەچوو، خزمەتێکی گەورەی کردبووو بۆ ئەم مەبەستە داوای یارمەتییێکی زۆری لە والیی پایەبەرز

کردبوو، والیی ڕەگەز پاك لە ناوجەرگەی زستان و بەفرو بارانێکی زۆردا بە هەشت هەزار سوارەو پیـــادەوە، بەرەو کرمـاشـان بەرێ کـەوت و لە کاروانسەراکەی ماهی‌دەشت بە سوپاکەی بەهرام میرزا گەیشت. پاش ئەوەی محـەمـەد میرزا هاتنی بەهرام میرزاو یارمەتی‌دانی ڕەزا قولیخانی بیستـەوە، ئیتـر هیـچ دەرەتـانێکی بۆ هەڵاتن و خۆقـوتارکردن نەدیت، و لەگـەڵ چەنـد دەست و پێـوەنـدێکی‌دا ناچار بەرەو تاران بۆی دەرچووو لەوێ وردوباریك وەگیرکەوت و بۆ کونی زیندانی ئەردەوێل نێردرا. تا نووسینی ئەم کتێبەیش، کەدەکا ساڵی ١٢٦٢ی‌ك، هەرلەو ناوەیە. لە سەرێکی ترەوە بەهرام میرزا بێ بەرەنگار بوون و شەڕوشۆڕ بە یارمەتیی لەشکـری سەرکـەوتـووی ئەردەڵانـەوە دەستیـان بەسـەر دام و دەزگای فەرمانڕەوایی وڵات داگرت و کوڕەوی پیرۆزی والی، پاش داندرانی شازادە، گەڕایەوەبۆسنە. هەر لەپاش مەرگی خوسرەوخان وداندرانی ڕەزا قولیخـان بە هەژدە مانگە، هەمەکارەو هاودەمانی والی دەستیان بە بەدڕەفتـــاری‌و پیـــاوخـــراپی لەگـــەڵ خەڵکی وڵاتی ئەردەڵان دا کردو دەرووی زۆرداری‌یان لێ‌خستە سەر پشت.

محـــمـــەد سادق خانی کوڕی ئەمـــانـــوڵـــلا خان کە کەڵکـەڵـەی فەرمـانـڕەوایی کەوتبـووە سەر، لەگـەڵ عەبـاس قولیخـانی برای، کە ماوەیێ پشتی لە وڵاتـــەکـــەی خۆی کردبـــوو، لەتـــەك برێ لە پیـاوی ناســـراوی سنـــەدا ڕێـــك کەوتـــن و لە ساڵـــی ١٢٥١ی ك دا بۆ جێ‌لەق کردنی والی بەرەو تاران بەرێ‌کەوت.

محـەمـەد سادق خان لەگـەڵ هاورێ‌کـانیـدا هەرچـەندە کاریان لە سەرەتـــاوە تا ئەنـــدازەیێ سەری گرت، بەڵام پاشـــانـــەکێ لە ناکـامی کوشـشت و هەوڵی مەردانەی حوسن جیهان خانم ڕێسەکەیان لێ‌بۆوە بە

خوری و تیخی هەویایان لەسەنگە داو هیچ کاریکیان بە ئاکام نەگەیاندو خانمیش بە سەرکەوتنەوە گەرایەوە بۆ سنە. محەمەد سادق خانیش کە دوو سالێ بوو لە تاران بوو، لەوێ ترازاو رووی کردە کرماشان و هاتە لای مەنوچەهر خانی موعتەمەدوددەولە، کە لەو سەروبەندەدا ئەو ولاتەی بەدەستەوە بوو.

موعتەمەدوددەولەیش سەرەرای ئەوەی چەند بەلێنیکی بۆ برینەوەی کارەکانی دابوویێ، ئەوەبوو کاتێ خوشکانی والی لەگەل چەند پیاوماقوولێکی سنەدا بۆ خوازبێنی تووبا خانمی خوشکی شا کە حۆرییەکی بەهەشتی بوو بۆ والی بەرەو تاران بەرێ کەوتبوون، محەمەد سادق خان بە فەحوای (الامور مرهونة باوقاتها) بێشەی بە چۆل زانیو هەلیهێنا، دوای ئارەزووی خۆی کەوت و بە دوو سەت سواریکەوەو بە یارمەتیی چەند پیاوخراپێکی خەلکی کوردستان، لە کرماشانەوە بەرێ کەوت و بریاری داگیرکردنی ئەردەلانیدا. والیی پایەبلێندیش کە ئەو سەردەمە تەمەنی پازدە سالێ دەبوو، کاتێ ئەم هەوالەی بیست، لەگەل میرزا نەرەجوللای وەزیردا بە سوپایەکەوە سەر لەنیوەرۆیێك بە نیازی ئەوەوە بەگژ محەمەد سادق خان دا بچن، لە سنە وەدەرکەوتن. هەر ئەو شەوە، محەمەد سادق خان لە ریی یەمینیان و گرزە جارەوە هاتنە ناو شارەوە. بەلام لەبەر ئەوەی رەزا قولیخانی والی ریی (نەران)ی گرتبووە بەر هەردوو لەشکرەکە، تاق وجووت کەوتن و پێك نەگەیشتن. ئەوی راستی بێ، دەس و دایەرەکەی محەمەد سادق خان کاتێ گەیشتنە دەوروبەری شار، هەرکەسیکیان تووش هات لە گەلی تێك گیران، تەنانەت یەك دوو کە سێکیشیان کوشت. مالی مەلا عەباسی شێخولئیسلام و میرزا نەرەجوللای وەزیر و میرزا

هیدایەتوڵڵای ئەمین هەرکە ئەم ڕووداوانەیان بیست، هەر ئەو شەوە لە ترسان کۆچیان کردو بۆ بەیانی خۆیان گەیاندە ناو هۆزی جاف.
محەمەد سادق خان هەرکە هاتە ناو شارەوە دەستی بە لەشکر کۆکردنەوەکرد. لەو سوپایەی لەناو شاردا بوون، هێندێکیان ئارەزووی پیس و چەپەڵ سواری سەریان بووو هێندێکیشیان دوای بەرژەوەندو قازانجی خۆیان کەوتن و ئاژاوە وخراپکاری گەرای خست. کاتێ هەواڵی گەیشتنی محەمەد سادق خان بە شاری سنە گەیشت، ئەمەو دایەرەکەی والی لە ترسان زەندەقیان چووو بە جارێ پەرێشان بوون.
تەنانەت کار بە ڕادەیێ گەیشت شیرازەی لەشکرەکەیان پچڕاو ئەو لەشکرە گەورەو گرانە غیرەت و پیاوەتیی بە جارێ لەبار چوو، بەڵام جوسەین قولیخانی کوری ئەمانوڵڵا خانی والی ئازایانە هاتەپێشێ و زۆر ژیرانە لەشکرەکەی دڵ دایەوەو غیرەتی وەبەرنایەوەو هەر ئەو شەوە بۆ سبەینێ ، دلێرانی ڕیزشکێن و هونەروەرانی ناوەك خەری ئەردەڵان لە خزمەت والی دا لەشار نزیك بوونەوەو محەمەد سادق خان لە قەڵای بارەگای فەرمانرەوایی دا گەمارۆدراو دەروازەکانی شاریشیان بە دەرکەوان و پاسەوانان سپارد. نزیکەی سەعاتێ گوللەی تفەنگە لە نێوان دا بوون بە پەیك و هاتوچۆیان کردو ڕێسمانی چەند کەسێ لە نەناسراوانی ئەیالەت بە برینگی مەرگ برا. سەرەنجام سەربازانی لەشکری والی چەند ڕەخنەیەکیان لە بورج و بارووی قەڵاکە کردو تیپ تیپ بە زەمزەمەی شەڕەوە هاتنە بەر مەیدان و هەردوولا لە سەربانەکان و مەیدانی پێش بارەگای فەرمانرەوایی دا ش.ڕیان گەرم کردو تا دەمەدەمی نیوەڕۆ شەڕەکە تا دەهات گەرمتر دەبوو، بەڵام هیچ لایەك بەسەر لایەکەی دیکەدا سەرنەکەوت. لەم هەنگامەو

کێشمەکێشەدا . ئەمانوڵڵا بەگی وەکیل و قوبادبەگی فەراش باشی لەگەڵ چەند بەگزادەیەك و تفەنگچی یەکانی هەورامان و بانەدا خۆیان گەیاندە پشت کۆشکی حەرەمسەراو ئەندەروو نیشیان بە گوریس، ئازایانە، بۆ سەرەوە کە بەرانبەر دیواری دەفتەرخانە بوو، هەڵ کێشاو لەو شوێنەدا دەستیان بەشەڕ کردەوەو تەنگیان بە گەمارۆدەران هەڵ چنی. لە سەرێکی دیکەوە سەرتۆپی ئازایانی کین لەدڵ بە دەسەجەمعی هەڵیان کردە سەر دەروازەی مەڵبەندی فەرمانڕەوایی و بە زەبری تیغ و تیر لایەکی دەروازەکەیان رووخاندو رژانە نێو کۆشکەکەوەو ئیتر بەم رەنگە شەڕی مەغلووبە گەرم بووو لە ئاکام دا محەمەد سادق و دارو دەستەکەی بەوپەڕی بێ ئاوڕوویی یەوە وەگیرکەوتن و بە دیل گیران و زۆربەی هاودەستانیشی بریندار بوون و کوژران. ئەو رۆژە بیست و چوار کەس لە هەردوو لا بە گوللەو تیر بریندار کران و کوژران و پاشماوەی هێزەکەیشی سەرلەبەر لە کۆت و زنجیردران و زیندان کران.

لە مانگی سەفەری ساڵی ١٢٥٠ دا مەحموود پاشای بابان پشتی لە دەوڵەتی عوسمانی کردو ئەحمەد پاشای بابان، کوڕی سلێمان پاشای کە برازای بوو، بە فیتی دەوڵەتی عوسمانی لە وڵاتی بابان هەڵ فراندو مەحموود پاشا پەنای وەبەر پاتشای ئێران بردو داوای یارمەتی و دەست گیریشی لە رەزا قولیخان کرد. حوسن جیهان خانمی (نواب والیە) والی یش نەیان کردە نامەردی، جێی مەحموود پاشایان لە ئەردەڵان دا کردەوەو زۆریان رێزلی ناو بەوپەڕی قەدرزانینەوە دڵیان دایەوەو پیاوانە لەگەڵی دا جوولانەوە. لە وەرزی زستان دا (نواب والیە)و والی و شازادە تووبا خانم لەگەڵ مەحموود پاشاو پیاوماقوولانی

سنەو بابـان دا بە نیازی ڕزگارکردنی مەڵبەندی بابان و یارمەتیخوازی
لە پاشـای قاجـار، بەرەو تاران بەرێکـەوتن. کاتێ گەیشتنـە تاران
دەستـەیێ لە مایەفیتنەو ئاژاوەگێـر کە ماوەیێ بوو بە شوێن هەلێـك دا
دەگـەران سا بەهـەر نرخێ بێ گەوهەر لە گەوهەردان و ئەسێرە لە برجێ
ئاسمـان لێـك بکـەن، نێوان والیەو والی چکۆلەو والیەی دایکی کە بە هۆی
منـدالیی کورەکـەیـەوە بۆ خۆی کاروبـاری وڵاتی بە دەستەوە گرتبوو،
بشێـوێنن و بۆ ئەم مەبـەستە لە ڕێگای تووبا خانمی گەوهەری سەدەفی
سەلّتـەنـەتـەوە سەر بـەندی کارەکەیان گەیاندە کاربەدەستانی دەوڵەت و
داوایان کرد والیی چکۆلە خۆی کاروباری وڵات بە دەستەوە بگرێ نەك
دایکی. دەربـاری قاجاریش ئەم خواستەی بەجێهێنا. حوسن جیهان
خانـمیش بە زیـرەکیی خۆی کە لە سەرەتـای کارەوە هەمـوو شتێکی
پێشبینی کردبـووو دەیزانی کارەکـە بەرێ بەکوێوەیە، لەوە گەیشتبوو
کە ڕەزا قولیخـانی کوری لەبـەر تەمـەن بچـووکیو کەم ئەزمونیی، ئەم
کارە گەورەیـەی لە کێشـدا نیـیـەو بێگـومـان ئەم کارە دەبـوو بە مایەی
تێـك چوونی سەرحەدەکـان و تێـداچـوونی چاك و خراپی میـرنشینی
ئەردەڵان. حوسن جیهان خانم هەرچەندی ئامۆژگاری کرد، خونچەی
هەویـای نەپـژاو دایە بێ دەنگی. ئیـدی بەم شێـوەیە بە هانەهـانـەی
ئاژاوەگێـران کە هەمیشـە والیـان دنە دەدا، نێـوان دایـك و کوریـان
تێـك داو دایـك و کوڕلێـك بوون بە ناحـەزی یەکتـرو کەوتنـە
لێك خوێندن. پاش ئەوەی کارەکە بەم جۆرە گەیشت و ئاوها شکایەوە
ڕەزا قولیخـان و هاورێیـانی لەگەڵ مەحموود پاشای بابان دا گەرانەوە
بۆ ئەردەڵان. حوسن جیهـان خانم، دایکی والیی چکـۆلە، پاش چەند
ڕۆژێ لەتـارا ن مانـەوە ، ناچـار، نەوەك شیـرازەی کاروبـاری

میرنشینەکە بە نەزانیی و پیاوخراپی و زمان بەدیی چەند کەسێکی ئاژاوەگێر کە مایەی ئەم دایك و فرزەندلیك کردنەبوون، بپچڕی و پەڕەی دەفتەری ئەم میرنشینە تەمەن هەزار سالەیە پەرتووت و شڕوهوڕ بێ، ئەویش گەڕایەوە بۆ ئەردەلان و وێڕای ئەوەی زۆری هەوڵ دا لەگەڵ والیدا نێوانی سازو هەموار بێ، بەلام بێسوود بوو. زۆری نەبرد پیاوخراپ و دووزمان سزای لەدژ ڕای حوسن جیهان خانم سەرپێچی کردنی خۆیان بە چاوی خۆیان دیت. حوسن جیهان خانم کە دیتی ئامۆژگارییە دلسۆزانەکانی وەك سەنگە و گۆزەوگومەز وگوێز وان و هیچ کاری لەسەر و دلی والیی کوری ناکا، ناچار کولیداو گۆشەنشینی و دوورەپەیزیی هەلوژێرد.

لەو سەروبەندەدا لە لایەن سەرۆکەکانی میرنشینی بابانەوە پەیتا پەیتا نامەیان بۆ مەحموود پاشا دەنارد، ئەگەر جەنابی والی و مەحموود پاشا بێت و بەرەو شارەزوور تەشریف بێنن، گەورەو بچووکی ئەو ناوچەیە سەریان لەرێدایەو بۆ هەموو فەرمایشتێ گوێ بەفەرمانن و تەیارن میرنشینی بابان لە گەماریی ناحەزان خاوێن کەنەوەو جلەوی کاری ولاتەکە بدەنە دەست کەسانێك خۆیان هەلیان دەبژێرن. مەحموود پاشایش کارەکەی لە ڕەزا قولیخان ڕاگەیاندو ئەویش لەسەر خواستی مەحموود پاشا هەر ئەو سالە، سالی ۱۲۵۷، فەرمانی دا، سەرتۆپی لەشکری سەرسنوورەکانی تەیارو ئامادەکردو خۆیشی لەگەل هاودەستانی خۆی و مەحموود پاشاو کەسوکارانیدا بەرەو جێی مەبەست بەرێکەوتن و تا لە چوارقوناخەی سنەدا سەرلەبەری ئەو لەشکرانەی فەرمانی ئامادەبوونیان بۆدەرکرابوو، پێیان گەیشتن و سەرلەبەر لە ناوچەی مەریوان هەواریان گرت. بەلام سەبارەت بەوە کە

هیچ هەوالێك لە میرنشینی بابانەوە نەگەیشت. چەند رۆژیکیان بە راووشکار بەسەربرد، تا خەبەر گەیشت، عەبدوللابەگی برای ئەحمەد پاشای بابان لەگەل بری لەشکری خوی و تیپی سەربازدا، بە حەوت توپەوە، لە چوارفەرسەخیی هەوارگەکەیان دا هەلیان داوە. بەلام لەوانە نی یە بتوانی خوی راگری. بە گەیشتنی ئەم هەوالە والی بە تەگبیری خرابی وەزیرەکەی کردو ئەمانوللا خانی وەکیل بە دوو هەزار کەسێکەوە لەگەل مەحموود پاشای بابان و دەستەو دایەرەکەی دا بەرەو سلیمانی ناردو قوبادبەگیشی بە هەزار سوارەوە لەگەل سولتان و تفەنگچی یانی هەوارمی دا راسپارد، دەربەندی کە لە نیو فەرسەخیی هەوارگەکەیان دا بوو، بگری. خویشی نەختی بەرەو پاش کشایەوە.
وا بلاوە: هیدایەتوللای وەزیر کە بنەمالەکەی پشتاوپشت هەر لەکونەوە لە دەرباری والی یەکانەوە نزیك بوون و لەبەر نیهادپیسی، بەرتوورەیی والی کەوتبوو، خەبەری دووبەرەکی و پەرت و بلاویی لەشکرەکەی بە عەبدوللا بەگ و سەربازانی راگەیاندو هانی دان پەلامار بدەن.
عەبدوللا بەگیش بە نیازی هەل کردنەسەر دژمنەکانی، هەر ئەو رۆژە بو نیوەرو، کاتی سەرکردانی لەشکر زوریان نووستبوون و لە حەسانەوەدابوون و هیندیکیش لەو دەشت و دەرانەدا خەریکی ئەسپ لەوەراندن بوون، هیرشی بردە سەریان. ، هەرکە پیش قەرەولانی لەشکری ئەردەلان خەبەری ئەم هیرش بردنە سەرەی عەبدوللا بەگیان راگەیاند، کە بری لە سوپای لە شکری ئەردەلان کە هیندیکیان چەکدارو هیندیکیان بی چەك و بەشیکیان هیشتا دوگمەی کورتەکانیان دانەخستبوو و پشتوینیان نەبەستبوو، سواربوون و بەم رەنگە نزیکەی هەزار سواری خربووەو ریگەی لە لەشکری بابان

گرت و دەستیــان بەگیـانبـازی کرد. هەردوو لەشکـر پێـك گەیشتن و پیش قەرەولــی هەردوو لەشــکــر تێــك گیــران. لاوانــی ئەردەڵان کەلـەمیـردانی بابانیان سیٚ جار پاشەکشیٚ پیٚکردن، بەڵام سەبارەت بە سستیو بیٚهێـزی‌یەکی سوپاکە لە بنەڕەتەوە تووشی هاتبووو تا دەهات بەرەو کزیو شکست دەچووو دەستی غایەتیو ناپاکیشی تیٚکەوتبوو، هەروەهـا لەبـەر ئەوەی کاربـەدەستانی سوپای ئەردەڵان و بابانەکانیش سوینـدیـان بویەکتـر خواردبـوو لە سەر قسـەی والیو مەحمـوود پاشـا شەڕنـەکـەن. هێنـدیٚ لەوانی کە دژی والیبوون وایان بەچاك زانی بیٚ شەڕوشــوڕ بگــەڕینـەوە بو ناوچـەی ئەردەڵان. ئەم ڕووداوە کاریٚکی گەورەی لە زوربەی لەشکرەکە کردو بەجاریٚ دەستەپاچەیکردن، ئیتر ئەمـان کشـانەوەو زوربەی لەشکرەکەیش توانی بەرەنگارییان کزبوو، بەلام بریٚ لە شێــردلانی ئەردەڵان، ئی وەکـو عەلی بەگ و نەزەر عەلی بەگ و محـەمــەد ڕەزابــەگ، کوڕی محـەمـەد عەلی بەگ و میـرزا فەزلـولـلای مورادو میـرزا ئەبـولفەتح کە ئامۆزاو برای دایکیی یەکتری بوون لە مەیدانی شەڕدا پیٚیان لیٚداکوتا، تا بلیٚی مەردانە شەڕیان کرد. میـرزا ڕەحیمی کوڕی میـرزا یوسف کوژراو مستەفا خانی کوڕی ئەمیر ئەســلان خان و نەجـەف قولیخـانی کوڕی مستـەفـا خان و محـەمـەد قولیخانی کوڕی نەزەر عەلیخان و میرزا محەمەد ڕەفیعی نازیر ئەختیٚ دوور لە ئوردووگـاکـە سەرلەبەر کوژران و هەرچیشیان لیٚمانەوە بە پیٚی ئایـەتی قورئـانی پیـروز «یـوم یفر المرءمن أخیوامه وابیه» هەڵاتن و تا وڵاتی خویـان، نەوەستانەوە. لە سەریٚکیٚ دیکەوە ئەمانوڵلا بەگ لەگەل ئەو بەشـە لەشکـرەی ئەردەڵان و سەحمـوود پاشای بابان دا گەیشتبوونە دەورو بـەری سلیٚمـانی. کاتیٚ هەوالی شکـانی لەشکـری ئەردەڵانیان

،یشتیٚ ، ناچار ورەیان بەرداو ئەوانیش کشانەوەو گەیشتنە والی .
راستیی ئەم ڕووداوە پاش چەند ڕۆژیٚ لە لایەن دژمنانی والی‌یەوە بە
ویی شای قاجار گەیشتەوە . حوسن جیهان خانمیش کە نیٚوانی لەگەڵ
ورەکـەی‌دا ناخـۆش بوو، چووبۆ تاران و [17] ئەم شکـانـەی خستـە
،ستـۆی هیٚنـدیٚ لە پیـاوماقـوولانی ئەردەلان . سەبارەت بەمە مووسا
مانی وەسساف لە لایەن دەربارەوە ڕاسپیٚردرا کە بابا خان ئاغا، برازای
،حمـەد خانی میـرمیـرانی مەراغـەیی کە میـراخوری والی بووو عەلی
مانی عەمـوو کە باپیـرەی لە بنـەماڵەی بەرزی ئەردەلانەو چەند ساڵە لە
اوچـەی تووی‌سـەر کان دا نیشتـەجیٚن و لەو سەردەمـەدا وەزیـرایەتیی
،یـالـەتی ئەردەلانی بەدەستـەوەبـووو ئیسمـاعیـل بەگی داروٚغـەو
ڕیادبەگی فەراش باشی هەموو کۆت و زنجیرکران و لە زیندان خران و
ەللا قولیخانی ئیٚلخانی ڕاسپیٚردرا هەشت هەزار تمەنیان سەرزەنشتانە
یٚبسیٚنیٚ و ئیتـر بەم جۆرە بۆ تارانیـان ناردو سەرزنشتـانـەکـانیشیـان لە
ماوەییٚکی کەم دا لە کەس و کارەکانیان وەرگرت .
لەم سەردەمـەدا میرزا عەبدولمەجید، نەوەی خوداڵی‌خۆشبوو میرزا
ئوکـر وڵـلاو ئامـۆزای میـرزا هیـدایـەتـوڵـلای وەزیر کە فەرمانڕەوای
جوانـرۆ و عیٚلی جاف بووو لە ڕاستیش دا بریٚ نیشـانـەی پیاوەتیی پیٚوە
ووو لە سەرگـرانی‌و سەرڕاستی‌و زیـرەکی‌و ژیری‌دا ئیفلاتوونی دووەم
وو، بۆ عوزرهیٚنـانـەوە لە بارەی شکانەکەی شەڕی مەریوانەوەو بڕینی
ەستی ئەو دەستـانـەی ئاژاوەکـەیان لەم ڕووەوە نابۆوە، چووبۆ تاران ،
بەڵام هەرکـە گەیشتـە ئەویٚ، لەبەر ئەوەی دووزمانان ئەمیشیان هەر بە
مایـەی ئاژاوەو شکـانـەکـە لەقـەڵـەم دابوو، بەکسـەر، بیٚ چەندو چوٚن
مەڵیـان واسی . خوداڵیٚ‌خۆشبوو حوسەین قولیخانی بەهەشتی لەبارەی

مردنیەوە ئەم پارچە شیعرەی کە مێژووی کوژرانی نێوبراوی تێدایە،
داناوە:

سال این جور عیان، تاریخ این نقش شگرف
زد رقم حاوی: شهید دوست شد عبدالمجید

پاش ئەم رووداوە کاروباری میرنشینییەکەی رەزا قولیخان شلۆق بوو، ناچار بۆ چارەسەرکردنی چوو بۆ تاران. پاش دوو سێ مانگ تووباخانمیش لە کوردستانەوە هات بۆ دەرباری شای برای. شایش بە ناوی ئەو خۆشەویستیو خوشك و برایەتییەوە لە نێوانیان دا هەبوو لە تاوان و گوناهی رەزا قولیخان خۆش بووو لە فەرمانرەوایی لابردو هەژدە مانگێکی لە تاران هێشتەوە. لەو ماوەیەدا لە تاران بوو، زیاتر لە هەزارکەس لە سەیدو شێخ ومەلاو زاناو گەورەپیاوو پیاوماقوڵانی کوردستان لە خزمەتیدا بەسەریان برد. لەم ماوەی دووركەوتنەوەیەی والیدا محەمەد سادق خان خۆی کاروباری فەرمانرەوایی بەرێوەدەبردو ئەرکی وەزیرایەتیی ئەیالەتی خستبووە ئەستۆی میرزا هیدایەتوڵلای وەزیر، بەڵام ئەوەی راستی بێ ئەم دووکەسە بەوپەری بەدکرداری‌یەوە لەگەڵ دڵسۆزانی والیدا دەجوولانەوە، تەنانەت کار بە ئەندازەیێ گەیشتبوو کەس لە ترسان خەوی لێ نەدەکەوت. ئەمە هەر وا بوو تا شای قاجار جارێکی دیکە والیی هێنایەوە سەر کار. یەکێ لەهۆیەکانی ئەم هێنانەوە سەرکارەی والی بەدکرداریی میرزا هیدایەتوڵلای وەزیر بوو کە لەگەڵ خەڵکی کوردستان دا دەیکرد. ئیدی بەم جۆرە فەرمانرەوایی میرنشینی ئەردەڵان جارێکی دیکە بە رەزا قولیخان سپێردرایەوە.

حوسن جیهان خانمیش ناوچەی عیشق ئابادی بە سیورغال بۆ

کلبنەی چاوی، ئەمانولـلاخانی دووەم وەرگـرت و ئەم ناوچـەیـە لە ئەیالەتی ئەردەڵان پچراو هاودەستانی حوسن جیهان خانمیش ئی وەکو محەمـەد سادق خان وحوسـەین عەلی خان و ئەبولفەتح خان. کورانی ئەمانوللاخانی گەورەو مەلا مەهدی قازیو میرزا هیدایەتوللای وەزیرو عەلی محەمـەد بەگی کوری ئەحمـەد بەگ لەگـەل چەند کەسیك دا لە مامەکانی کۆچیان کردو لە نیسفەندئاباد جیگیر بوون. پاش گەرانەوەی رەزاقـولیخـان بۆ کوردستـان، کاروبـاری میرنشینەکە بە ریکوپیکی بەریوە دەچوو. چونکە حوسن جیهان خانم لە تاران مابووەو خەریکی ئاژاوەگیـریو دەست لەکـارەوە خـستن بووو حاجی ئاغـاسیی سەدری ئەعزەمیش هەرچی ئەو دەی گوت، بە قسەی دەکردو ئەمە بوو بە هۆی ئەوە کە ناوچـەی ئەردەلان هیمنیو ئاسـایش بە خۆیـەوە نەبینی. پاش ئەوەی والی گەرایـەوە، پینـج مانگی نەبرد، حوسـن جیهان خانم داوای مولـك و مالی خۆیو هاودەستـانی خۆی لی کـرد. بۆبەجیهینـانی ئەم داوخـوازە قەنبـەر عەلی خانی سەرتیپ راسپیردرا، بەلام ئەم پیاوە دوای ئەوەی یەك دوو مانگی لە سنـە مایـەوە و هیـچ کاریکی پی سەروبـەر نەنـرا، ناچـار گەرایـەوە بۆ تووی‌سەرکـان و ئەنجـامی کارەکـەی لە دەربـاری قاجـار راگـەیـانـد، بەلام بۆوەرگـرتنـەوەی مال ومـولـك و یەك لاکـردنـەوەی کارەکـە، قەنبـەر عەلی خانی سەرتیپ بە دووسەت سواریکـەوە هەمـدیس گەرایەوە بۆ سنەو لەنوی‌وە تی هەل چووە، بەلام دیسـان هیـچ کاریکی بۆ جیبـەجی نـەکـرا. ماوەیی خۆی لەو ناوچەیە خلافـانـد. لە دەوروبەری سالی ۱۲٦۱دا، کاتی ئەحمەد پاشای بابان لە دژ دەسەلاتی رۆم و عەجەم سەربزیوی دەکرد، سولتانی رۆم نەجیب پاشـای والی بەغـدای راسپـارد، ئەحمـەد پاشـا سەرکـوت کاو بۆ

ڕێك خستنەوەی کاروبار بچێ بۆ مەڵبەندی بابان. نەجیب پاشایش سێ هەزار سوارەو سەربازو بیست تۆپەوە بەرەو شارەزوور بەڕێکەوت و بڕیاری ئەوەی دابوو کە هەرچۆن و بە هەرنرخێ بێ کا پاشای بابان یەك چاوکاتەوە. بۆ ئەمەیش، کۆیەو حەریری گرت چەند ڕۆژێ لەگەڵ ئەحمەد پاشادا کەوتە وتوویژەوە، بەڵام بە هیچ ئاکامێ نەگەیشتن. لە پاشان ئەحمەد پاشا بە چوار پەل سەربازو دوو سێ هەزار سوارەو چوار تۆپەوە بێباکانە بەرەنگاری نەجیب پاشا بۆوە دوو سێ فەرسەخ لەولای لەشکرگاکەی نەجیب پاشاوە هەڵیدا. ئەو شەوە بۆ سبەینێ، کە دەبوا شەڕ گەرم بێ، دووبەرەکی و ناکۆکی کەوتە نێو لەشکری ئەحمەد پاشاوەو کارگەیشتە بەگژیەك دا چوون. ئیدی ... شیرازەی کاری ئەحمەد پاشا پچڕاو هەر بەو شەوەزەنگە ئەنگوست لەچاوە هەرچی خەیمەو بنەوبارگەو پێداویستی شەڕو تۆپخانەیان هەبوو بەجێیان هێشت و بە هەزار سوارێکەوە لە پیاوماقوولان خۆی گەیاندە سلێمانی و لەوێوە باروبنەیان پێچایەوەو بەرەو سنە دایان کێشا.

والیی بەغدایش بەبێ هیچ کۆسپ و تەگەرەو شەڕوشۆڕ سلێمانی و شارەزووری گرت و عەبدوڵلای برای ئەحمەد پاشای بە فەرمانڕەواو پاشای بابان و شارەزوور هەڵ وژێردو بۆ خۆیشی گەڕایەوە بۆ بەغدا.

لەم سەریشەوە ئەحمەد پاشا پەنای وەبەر والیی ئەردەڵان هێناو والیش ڕێوڕەسمی میوانداری و میوان پەزیرییەکی شایانی لەگەڵ نوانـدو بە ڕێزلێگرتنێکی شایانەوە بەرەو ڕەوانسەری ڕەوانە کردو لەوێ جێگای بۆ فەراهەم کرد.

پاشان، عەبدوڕەحمان بەگ نێردراوی پاشاو عەبدولکەریم بەگ، پیاوی والی چوون بۆ دەرباری قاجارو داوای یارمەتییان لێ کرد، بەڵام

ەبەر ئەوەی هەردوو دەوڵەتی گەورەی ئێران و ڕۆم بەرژەوەندیان لە
ەك ڕەنگیو نێوان خۆشیدابوو، بڕیاردرا کە لەوێ کۆچ بکەن و
بگەڕێنەوە بۆ خاکی ئەردەڵان و لەوێ جێگیر بن. پاشایش بەرژەوەندی
خۆی لەوەدا دیت ڕوو لە دەوڵەتی بڵیندی ڕۆم بنێو ئیدی ناچار بە
هەزار عوز رهێنانەوە بەرەو بەغدا چووو وەزیری بەغدای کرد بە پێناو بۆ
ڕایی‌کردنی کارەکەی.

لە ئاکامی نامەنووسینە نارەزاییئامێزەکانی حوسن جیهان خانم دا،
سەرەنجام والی، لە ڕۆژی ۲۳ی سەفەری ساڵی ۱۲٦۲دا بۆ بیر
لەچارەسەرکردنەوەو چەسپاندنی کاری فەرمانڕەوایی خۆی بەرەو تاران
بەرێ کەوت و لە ڕۆژی ۱۵ی (ربیع الاول)دا گەیشتەجێو هەر ئەو
دەمە بە دیداری شای قاجار گەیشت، بەڵام لەبەر ئەوەی لەدوورو
نزیکەوە هەراو ئاژاوەی وڵات هەمووو وەپاڵ وی دەدراو ئەو لابراو
خۆری ئاسمانی پیاوەتیو لاوچاکی، حەزرەتی ئەمانوڵلا خان لەجێی
وی داندرا.

ڕەزاقولیخان پاش ئەوەی دیتی بارەکە ئاوها شکایەوە مەنوچەهر
بەگی میرئاخوری بە چەپەری بۆ ئەردەڵان نارد، لە هەواخوازو
هاودەستانی ڕاگەیێنێ، لە شەوی چوارشەمەی هەشتی (جمادی
الثانیة) دا بۆ شار دەگەڕێتەوە. مەنوچەهر بەگە ئەم هەواڵەی بە جێی
خۆی ڕاگەیاندو هەر ئەوشەوە بۆ سبەینێ ، هەرچی سەر بە
فەرمانڕەوای تازە بوون باروبنەیان پێچایەوەو خۆیان بۆ کۆچ کردن
ئامادەکرد. شازادە تووبا خانمیش لەگەڵ گەورەو پیاوماقووڵانی
کوردستان دا وایان بە چاك زانی کە لەدژ فەرمانڕەوای تازە بوەستن و بە
گژیدا بچن. ئاگایان لەوە نەبوو: چرایەکی یەزدان هەڵی‌کا، گەمژە

فووی لێ کا ریشی هەڵ دەکرووزێ. هەر لەو سەروبەندەدا ئەمانوڵلا بەگی وەکیلیش لە تاوان، لەگەڵ برێ لەهاودەستانیدا خۆی گەیاندە ناوچەی ئیلاخ. لە سەرێکی دیکەوە، ئەمانوڵلا خانیش نامەیێکی بۆ سەرکردایەتیی لەشکری سەرسنوورەکان و خەڵکی ناوچەکەو بەگزادەو ئاغاکانی کورد ناردو ئەوانیش نەیان کردە نامەردی گوێ بەفەرمانیی خۆیانیان بۆدەربری و بەو پەری دڵ گەرمییەوە بە پیریەوە چوون و پێشوازیان لێ کرد. شازادە تووبا خانمیش لەسەر قسەی مەلا عەباس و محەمەد سولتان کە وایان بە بەرژەوەند زانیبوو، بەرەنگاریی ئەمانوڵلا خان نەکا، لە رۆژی پێنج شەممەی رێکەوتی نۆی ئەو مانگەدا بریاری دا شاری سنە چۆڵ کاو لەوێ نەمێنێ.

برێ لە باجگران لەگەڵ بیست سی ماڵێك دا لە پێشکارو نۆکەرانی رەزاقولیخان کۆچیان کرد، چوون بۆ گەرووس و لە گوندەکانی محەمەد رەحیم خانی گەرووسیدا هەواریان گرت. بەڵام زۆری پێ نەچوو، ئەمانە تەماح گرتنیو شەیتان سواری سەریان بوو، روویان لە ئەمانوڵلا بەگی وەکیل ناو هاتنە ناوچەی ئیلاخ. لە ماوەی شەش رۆژدا زۆربەی گوندەکانی ئەو ناوچەیەیان بە زۆرو ستەم تێك داو وێران کرد. پاشان، لەبەر ئەوەی کاروباری ئەمانوڵلا خانی دووەم تەواو چەسپیو بەگەشە کەوت، ئەمانوڵلابەگ ناچار خەڵکەکەی بەرەورووی عەباس قولیخانی کوری ئەمانوڵلا خانی گەورە کە لەو ناوچەیەدا بوو کردەوەو خۆیشی گەرایەوە بۆ سنەو ماڵ و منداڵەکەیشی بۆ شوێنێ کە ناوی هۆشبارانە، لە ناوچەی هەورامان، ناردو خۆیشی دووبارە لە سنەوە گەرایەوە بۆ ناوچەی ئیلاخ. بەڵام پاش یەك رۆژ باروودۆخ دیسان تێك چۆوەو دیسان گەرایەوە بۆ سنە. هەر لە پازدەی ئەو

مانگەدا چەند کەسێ لە ناسراوو ناوداران بە ماڵ و منداڵەوە لە گەڵ محەمەد سوڵتانی فەرمانڕەوای سەقزدا بۆ ئەو ناوچەیە چوون . بەڵام برێ لە کەس و کارانی محەمەد سوڵتان ، هی وەکو ئیسماعیل بەگی وەکیل و تافە بەگە و ساڵح بەگە و براکانی و محەمەد بەگی کوری یەحیا بەگە و چەند کەسانێکی تر کە دەمیان لە دژمنکاریی محەمەد سوڵتان دەژەنی و خۆیان بە دەستداو سەر بە ئەمانوڵلاخانی دووەم دەزانی بریاریان دا روو بکەنە موکریان . پاش ئەوەی محەمەد سوڵتان و هاورێیانی گەیشتنە سەقز، سەرلەبەریانی چەپاوداو تالانی کردن ، بەڵام خودا کردی هەر لەم سەروبەندەدا سلێمان خانی فەرمانڕەوای هەوشار کە بۆجێبەجێ کردنی کاروبارێك هاتبووە ناو شاری سەقزەوە، ماڵ و منداڵیانی بەرەو ناوچەی هەوشار کۆچ داو لە ناو موڵکەکانی خۆیدا جێگیری کردن و هەرچییەکیان پێویست بوو، بۆی سەروبەرنان .

# ئەمانوڵلا خانی دووەم

کاتێ ئەمانوڵلا خانی دووەم لە قەسلانەوە بۆ سنە بەرێ کەوت شیرازەی کاری کۆڕو هاودەستەکانی عەباس قولیخان و ئەمانوڵلابەگی وەکیلی پچڕاو هەرکەسە بۆخۆی ڕووی لە شوێنێ کردو پەرش و بڵاوبوونەوە. لەم لایشەوە شێری بێشەلانی ئازایەتیو بوێری هاتە ناو شاری سنەوە دامەزرا، وردو درشتی خەڵکی شار سەرلەبەر پێشوازیان لێ کردو بەپیریەوە هاتن و ملی گوێ بەفەرمانیو دەستدایی یان بۆ کەچ کرد، بە یەغبالٚ و بەختی یارەوە لە ڕۆژی یەك شەمەی (جمادی الثانی)ی ساڵی ١٢٩٢ ی ك دا بوو بە تەخت ڕازێنەوەی ویلایەت. بەوشێوەیەی لێی دەوەشایەوە دەرووی دڵاوایی و نوازشتی لە چاك و خراپ خستە سەر گازی پشت و ژێردەستەو سپایی یان لە چاوێریی دڵشادو بەرخوردار بوون. دادپەروەریو دەسبڵاویی کرد بە پیشەو ڕێورەسمی خۆی. خەڵکی وڵات لە دادپەروەریی شادو دڵخۆش بوون. سەبارەت بەوەی کە ڕەزاقولیخان ڕزگاربوونی خۆی لە ئاژاوەو بشێوییی باروودۆخی کوردستان دا دەدیت، نامەو کاغەزێکی زۆرو زەوەندەی بۆ هەلاتووەکان نارد، چەندیان پێ دەکرێو بۆیان دەکرێ لەسەر سنوورەکانی ئاژاوەو بشێوی بنێنەوە. نەخێر خۆ ئەگەر دەستیشیان ڕۆیشت ئەوە بەو خەڵکەوەی لەگەڵیان دان بچنە خزمەتی

شازادە تووبـا خانم و بە یارمـەتی و کۆمـەگی ئەوەوە ڕێگـای شەڕ وشۆڕ بگـرنـەبەر. ئەوانیش کە لە هەموو ئەقڵ و تەدبیرێك بێبەش بوون ئەم قسـە لە ئاوەزبـەدەرانـەیان سەلماندو وەك دەڵێن نچێر ئەجەلی بێ بۆکن ڕاوکـــەر دەچـێ، ئەوانیش یەکـراست هەڵیـان کردە سەر ناوچـەی ئەردەلان. لە سەرێکی تریشـەوە کاتێ ئاکامی ئەم خەیاڵەخاوە بەرگـوێی شەرەفی بنـەماڵەی ئەردەلان ئەمانوڵلاخان کەوتەوە تیپێکی لە ئازاو بوێـرانی دژمن شکێنی ئەردلانی بەسەرکردایەتیی نەجەفقولیخانی کوڕی خودالیخشبوو محەممەد حەسەن خان و سەرپەرشتیی ئیسماعیل بەگی دارۆغــە بۆلەنـــاوبـــردن و قەلارکــردنیـــان نارد. ئەم لەشکـرە سەرکـەوتـووە لە سبـەینێی ڕۆژێکی مانگی نێـوبـراودا لەپـڕ وەك بەلای ناگـــەهـان بەسـەریـان دا دان و دژمن لەبـەر ئەوەی توانی خۆراگـریو بەرگەگری یان لەخۆدا نەدیت، ناچار پاشەکشێیان کردو هەلاتن، بەلام هێنـدێکیـان لە مەیـدانی شەڕدا خۆیـان ڕاگـرت و مانـەوەو برێکشیـان بەدیـل گیـران. پاش ئەم سەرکەوتنە پیرۆزە نەجەفقولیخان دیلەکانی بە کۆت وز نجیـــرەوە ڕادانـــە پێش ئەم میـرە بێ نەزیـرە. لە سەرچـاوەی ئەیـالـەتـەوە فەرمـانی سزادانیـان دەرچـوو، بەلام حوسەین قولیخان و مەحموود خان بۆیان تێکەوتن و لەبەر دلی وان بەخشـران. لە سەرێکی دیکـەوە ئەمانوڵلابەگی وەکیلیش نزیکەی هەزار کەسێکی چەکداری لە تفـەنـگە بەشـانـانی هەورامـان و سوارچـاکانی لەك و سوورسوورەوە ڕووی لە شار کردو بە بێ ئاگـاداریی ئەو خودانـە بەشـان و شکۆیە، لە ڕۆژی سێ شەمـەی (٢٨)ی ئەو مانگەدا گەیشتە قەلای حەسەن ئاباد. ئەمانوڵلا خانیش هەرکە ئەم هەواڵەی بیستەوە دەریای غیرەت و پیاوەتیی بە جۆش هات و فووی بە کەرەنـــای شەڕدا کردو خۆیـشـی شاقـــەلـی

مەردایەتی لێ هەڵ کردو بۆ لەناوبردنی ئەم ئاژاوەو بشێوی یە چووە بەر مەیدانی شەڕو لەشکرەکەی کرد بەسێ بەشەوە: خۆی سەرکردەیی پێشەوەی لەشکرەکەی لە ئەستۆ گرت. سەرکردەیی دەستەڕاست و دەستەچەپیشی بە مەحموود خان و نەجەفقولیخان سپارد.

شەڕی نێوان هەردوولا هەر لە سەرەتای سبەینێوە تا پاش نیوەڕۆ بەردەوام بووو لەپاشان ئەمانوڵلا بەگ بە پێی (لا مانع لقضائه ولا راد لحكمه) دەستەودابەرەکەی دەستیان لێ هەڵ گرت و سەرپێچی یان کردو چوونە پاڵ ئەمانوڵلاخان. ئەمانوڵلا گی وەکیلیش لەگەڵ ئەسەدوڵلا بەگی کوڕی و فەتح عەلی بەگی برازای و چەند کەسێکی تردا، بێ پشتیوان و ماڵ وژن لە قەڵای حەسەن ئاباددا مانەوە. عەلی محەمەد بەگی ئامۆزای ئەمانوڵلا بەگی وەکیل کە لە خزمەتگوزارانی والی بوو بۆی تێ کەوت و هێنایەوە بۆ خزمەت والی. والیش نەی کردە نامەردی جوان و زەریف لە یەکێ لە ماڵەکانی سنەدا زیندانی کردو لە پاشان بە سزای تاوانی خۆی گەیشت. بە دەم ڕووداوەکانی ساڵی ڕابردووەوە ئەوەبوو نەختێکمان لەبارەی ئەحمەد پاشای بابانەوەی باس کرد.

ئێستایش جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە سەرەوکاری باسەکەو پێوەندیی و لەسەری دەڕۆین. پاش ئەوەی ئەحمەد پاشا لە دەوڵەتی ئێران نائومێد بوو، بە هاودەست و پەیرەوانیەوە گەڕاوەو بەرەو بەغدا بەڕێ کەوت. لە گەرمیانەکانی ئەو ناوچانەدا وچانی مایەوە. وێڕای ئەوەی ئەحمەد بەگی کوڕی نەجیب پاشای والیی بەغدا دڵنیای کردبوو. بەڵام ڕانی نەدەکرد بچێتە ناو بەغداوە، ناچار لە بەهاری ساڵی ۱۲٦۲دا ڕووی لە شاری سلێمانی کردو لە دوو فەرسەخیی شاردا لەگەڵ عەبدوڵلا پاشای برای دا بەشەڕهاتن. سەرەنجام لەدوای شەڕو شۆڕی زۆر بەی لەشکرەکانی

دەستیان لەشەڕ هەڵ گرت و داوای متمانەنامەیان کرد. ئەحمەد پاشا بۆ خۆیشی لەگەڵ برێك دا هەڵات و دایقەڵاشت، ئەوەستایەوە تا گەیشتە گونـدی تیلەکـۆ، کە موڵکی حوسەین قولیخانی کوری ئەمانوڵڵاخانی گەورە بوو لە ناوچەی ئەسفەنـدئـابادا. سەبارەت بەوەی کە ئەحمەد پاشـا پوورزای ژنـەکـەی حوسـەین قولیخان بوو دووەسێ شەوێ لەو گوندی تیلەکۆیە مایەوە. حوسەین قولیخانیش هەر لەسەر پەیرەوکردنی ڕێورەسمی باووبـاپیـرانی خۆی، وێرای دەست کورتیو تەنگـانەی بژیوو بەڕێوەچوون، ئەختینەو شتی پێداویستی دیکەی بۆ پێکەوە ناوەو داویـەتێ. پاش قەدەرێ لە ڕێگـەی قزڵ ئوزوون و ئەفشـارەوە بەرەو ئەرزەرۆم و ئەو سەرسـنـوورانـە بەرێکـەوتـووەو لەوێوە چووە بۆ ئەستـەمـووڵ و ئێستـا لەو ولاتـە گیرساوەتەوە. لەپاش هەڵاتنی، ماڵ و منـاڵ و کۆچ و باروبنـەی لەگەڵ هەموو هاورێیانیدا لەگەڵ عەبدوڵڵا پاشـا چوونـەتـە شاری سلیمـانیو لەوێ لە زێـدو نیشتمـانی خۆیان دا ماونـەوە. لـە کاتێکـدا بنیـاتی فەرمـانـرەوایی ئەمـانـوڵـڵا خانی دووەم دامەزراو توێتکەی دەگرت و کاروباریشی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتری برەو دەستـانـد، شازادە تووبا خانمیش بە نیازی شێواندنی کاروباری والی پەیتـا پەیتـا نامـەی بۆ تاران دەنـووسی، بەڵام بێسـوود بوو. ئەوەنـدە هەبـوو کە لەبـەر ئەوەی خوشـك و برای یەکتـر بـوون، فەرمـانی موڵکـایـەتیی ئەسفـەنـدئابادی بۆ دەرکردو لە ڕۆژی یەك شەمەی ١٥ ی رەمـەزانی ١٢٦٢ دا لەگـەڵ هاورێیـان و پەیـرەوانی خۆیدا گەیشتـە قەسـلان و دەستی کرد بە خرکـردنـەوەی هەمـوو هەڵاتـووەکـان کە لە ناوچـەکانی ئەفشارو گەرووس و کولیاییدا گیرسابوونەوە. پاش چەند ڕۆژێ ئەو هەڵاتـووانـە هەمـوویـان لە دەوری کۆبوونەوەو گوندەکانی

ئەسفەندئابادی هەریەکە بە پێی پلەوپایەی خۆی بەسەردا بەشینەوە. زۆری نەخایاند نەخۆشیی پەتا - پەنابەخوا - لە ناوچەی قەسڵان دا بڵاوبووەوەو بە یەك دوو شەوێ هەودای ژیانی چەند کەسێکی بڕی و نزیکەی ۲۸ کەسێ مردن. لە ڕۆژی ۲۰م دا بە پێی (ففروا الی اللە) تووبا خانم قەسڵانی بەجێ هێشت و چوو بۆ گوندی وەیهەج کە لە سازگاریدا بەهەشتی سەرزەمینێ بوو بۆ خۆی لەوێ گیرسایەوە. پێش بەسەرچوونی پەتاکەو لە قەسڵان دەرچوون تووبا خانم حەسەن ئاغای برای شیریی نارد بۆ تاران. بۆ ئەوەی خۆی بیبێ بەوالیی ئەردەڵان لە ئەمانوڵڵاخان کەوتە گلی و گازن و پەرێشانیی خۆی وردوبارێك بۆ ڕوون کردەوەو ڕای گەیاندێ کە وڵاتەکە کەسی تێدا نەماوەو چۆڵ و هۆڵە. هێندێ لە هاودەستانی بۆی هاتنەکار و پشتیوانییان لێ کردو قسەکانی قوبوول کراو سەرەنجام بەڵێنی فەرمانڕەوایی ئەردەڵان بە ڕەزاقولیخان درا. بە هۆی حاجی میرزا ئاغاسییەوە جەنابی ڕەزاقولیخانیان کە لە تاران بوو داواکرد، مژدەی والێتیی ئەردەڵانیان ڕاگەیاندێ و لە پاش چەند ڕۆژێکیش فەرمانیان بۆ نووسی و بە هۆی حەسەن ئاغاوە کە لەپێشەوە نێومان هێنا، مژدەیان بە حەزرەتی تووبا خانم دا.

# فەرمانڕەوایی ڕەزاقولیخانی
# بۆ جاری دووەم

وەك لەپێشەوە گوتمان شاریاری قاجار سەبارەت بە خزمایەتی، ویلایەتی کوردستانی بە ڕەزاقولیخان سپارد. جگە لەمەیش هۆی ڕاستەقانیی ئەم تێك چوونەی کاروباری ئەمانوڵڵا خانەو لە والێتی خرانی ملهوری و بێ ئاوەزی و نیهادچەپەڵی و ناپاکیی وەزیرەکەی بوو. ئەگینا ئەمە نەبوایە، وەك بۆ هەمووان ڕوون و ئاشکرایە، دایکی ڕۆژگار کوڕێکی هەڵ کەوتوو و لێوەشاوەو جوامێری وای لە باوەشیدا نەپەروەراندووەو تا ئێستای بەخۆیەوە نەدیوە. لە پیاوەتی و وشیاری و سەرداریدا تا بڵێی پیاو هێندەی بیر بکەیەوە وشیار و چەندی بڵێی سەردار و سەروەر بوو.

ئیتر، وەك لە پێشترەوەمان گوت، ڕەزاقولیخان لە ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی سێیەمی مانگی (ذی القعـدە)ی ١٢٦٢دا بوو بەوالی و بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەی ئەردەڵان و سەرسنوورەکان کرا بە هەمەکارەو لە نۆیەم ڕۆژی هەرئەو مانگەدا بەڵگەنامەی فەرمانی فەرمانڕەوایێتیی بە شاری سنە گەیشت. ئەوەی شایانی باسە، شێخ عەلی خانی ماکوێی سەرهەنگ و هاشم سوڵتان و مەحموود پاشای

بابـان و مەحمـوود خانی کوری خوداڵێخـۆشبوو ئەمانوڵلاخانی گەورە لەگەڵ یەکدا رێك کەوتن و وەزیرە بوودەڵەکەی ئەمانوڵلاخانیان لەگەڵ ئیسمـاعیـل بەگی دارۆغـەو میرزا محەمەد رەزاو میرزا عەبدولکەریم و چەنـد پیـاوماقـوولێکی تـردا کە سەر بە ئەمانوڵلاخان و گوێبەفەرمانی بوون، دەسگیـرکـردو لە زینـدانیـان هاویشتن. لە رۆژی شەمـەی رێکـەوتی ١٠ی مانگی نیـوبراودا، کاتێ کە ئەم هەواڵە بە شازادە تووبا خانم گەیشت، عەباس قولیخان و چەند زاتێکی دیکەی بۆسنە ناردو بۆ خۆیشی نەشـریفی هەر لەو دەمـەدا لە گونـدی کۆنگرەوە بەرێکەوت، هات بۆ گونـدی باشمـاق. هەرکـە عەباس قولیخان لە دوادوای شەوی رابـردوودا کە چوار سەعـاتی لێبەسـەرچـوو بوو، گەیشت، میـرزا جەعفـەر کە لە ماڵی هاشم سوڵتـان دا زینـدان کرابوو ترسێکی زۆری لێنیشت و کەس وکـارەکـەی هەر ئەوەنـدەیـان پێکـرا پەنـایـان وەبەر رەحیم خان وهاشم سوڵتان بردو پوول وپارەییکیان بە ناوی دیاریو پێشکێشەوە دانێو سەری جەعفەر خانیان لەم بەلاو گێچەڵە رزگارکرد.

نەواب ئەمـانـوڵـلاخـانیش لە رۆژی یازدەیەمی ئەو مانگەدا، دەمەو عەسـرانێ لە تەك چەنـد کەسێکی گیان بە گیانیی خۆیدا بەرەو کولیایی سوار بووو بەرێکەوت و لەوێ بە تووبا خانم گەیشت. پاشان لەوێرا چوو بۆ هەمەدان. لەوێشەوە خۆی بە تاران گەیاند. پاشان لەلایەن شاو جەنـابی حاجی میـرزائـاغـاسییـەوە عوزرێکی زۆری بۆ هێندرایەوەو دڵ درایـەوە. شازادە تووبـا خانـمیش رۆژی یەك شەمـە گەیشتـە چەخمـاخ دەرەو لەوێـوە بەرەو سەلاواتئـابـاد کە دەست وپێـوەنـدانی رەزاقـولیخـانی تازە گەیشتبـوونێ، بەرێکەوت. ئەوانەی گەیشتبوونە ئەوێ تێیـان گەیـانـد کە رەزاقـولیخـان گەیشتـووەتـە ئەو نزیکـانـە،

راستی‌یه‌که‌ی ئه‌وه‌یه که شازاده تووبا خانم و ره‌مزاقولیخان پێکه‌وه گه‌یشتبوونه سه‌لاوات ئاباد. له پاشان ره‌زاقولیخان رۆژی سێ‌شه‌مه گه‌یشته خوسره‌وئاباد و بۆ رۆژی چوارشه‌مه به به‌ختی پیرۆز و پرله‌فه‌ره‌وه گه‌یشته بارەگای فه‌رمانره‌وایی و شان و شکۆ و چوونه سه‌رته‌ختی حوکمرانیی ئه‌یاله‌ت و به پێی داوودەستووری گه‌وره‌پیاوان سێ رۆژی پرسه بۆ ئه‌ماتوللابه‌گی وه‌کیل دانلو ئه‌سه‌دوللابه‌گی کوڕیشی به پله‌ی بریکاری سه‌ربڵیندو سه‌رفرازکرد. پاشانه‌کێ، له دوای زیندانی‌یه‌کاتی نارد، پاش گلمیی و بناشت، هه‌ریه‌که پارمیێکی خسته ئه‌ستۆیان و باجگیرانی لێ‌راسپاردن، لێیان بستێنن. پاش چه‌ند شه‌وێ جه‌عفه‌رخانی، که‌سه‌ر به بنه‌ماڵه‌ی بڵیندی ئه‌ردەڵانی‌یان بوو، کوشت. ئه‌مه‌یش له رێ‌ورەسمی والی‌یاتی به شان وشکۆی ئه‌م خانه‌دانه‌دا کارێکی نامۆ و به‌ده‌ربوو. به‌لام ئه‌واتی تر له کوشتن رزگاریان بوو. پاش گه‌ڕانه‌وەی ره‌مزاقولیخان، حوسه‌ین قولیخان که به فه‌رمانی نه‌واب ئه‌ماتوللاخان پاراستنی که‌وشه‌ن و بوومی ره‌واته‌ری پێ‌سپێردرابوو، به‌ده‌ست خه‌ڵکی ئه‌و ناوچه‌یه تالان کراو ده‌ست درێژی‌یه‌کی زۆری لێ‌کرا. هیچ شه‌رمێکیان له خوداو له‌و بنه‌ماڵه به‌رزه نه‌کرد. ئه‌ویش به ناچار له‌گه‌ڵ دوو سێ که‌سێك دا گیانی خۆی به هه‌زار شه‌رمه‌ق رزگارکردو سا به هه‌ر جۆرێ بوو، له رێی ئه‌فشاره‌وه خۆی گه‌یانده سوله‌یمانی و خزایه پاڵ عه‌بدوللا پاشای بابانه‌وه. نه‌جه‌ف قولیخانی کوڕی خودالێخۆشبوو محه‌مه‌د حه‌سه‌ن خانیش که هه‌مه‌کاره‌ی ناوچه‌ی جوانرۆ و جاف بوو هه‌رکه ئه‌م رووداوه‌ی بیسته‌وه به‌سه‌ر هه‌وارمان دا به‌ره‌و شاره‌زوور به‌رێکه‌وت و ئه‌میش خۆی گه‌یانده پاشای بابان و په‌نای پێبرد. میرزا فه‌تاح، کوڕی

میرزا فەرەجوڵڵایش لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمانوڵڵاخان دا کاروباری سەفەری بەدەستەوەبووو بە نازناوی (صاحب اختیار)ی سەربلێندبوو، هاتە خزمەت پاشای بابان و لەوێ گیرسایەوەو ئارامی گرت. میرزا محەمەد سادق، کوڕی میرزا هیدایەتوڵڵایش کە سەرپەرشتی تیرەی سوورسوور بوو، ناچار هەڵات و خۆی گەیاندە ئەوانی دیکە. هەروەها میرزا محەمەد، کوڕی میرزا یوسف و میرزا محەمەد عەلیی کوڕیشی کە لە خزمەتی خان ئەحمەد خان، برای والی دا، بە ناوی ڕیش سپیو ڕاوێژکار لە ناوچەی مەریوان دا جێگیربوو، بەرمو شارەزوور بەرێکەوت و خۆی گەیاندە هەڵاتووەکانیتر. نەواب والیەو ئەمانوڵڵاخانی والی کە لەگەڵ چەند کەسێکدا لە دەرباری قاجاردابوون پەرێشانیی هاودەستانی خۆیان بە سەردەم دارانی دەوڵەت ڕاگەیاندو لە ئاکام دا سەرلەنوێ ناوچەی ئەسفەندئابادیان بەرەوڕووی ئەمانوڵڵاخان کردەوەو ئەویش محەمەد جەعفەرخانی کوڕی خودالێخۆشبوو محەمەد سادق خانی لە بری خۆی کرد بە بەرپرسیاری ئەو هەرێمەو خەڵکێکی زۆریش لەدەست وپێوەندانی خۆی ڕوویان لەو هەرێمە کرد. نەجەف قولیخان و میرزا فەتاح و ئەوانی تریش کە پەنایان بۆ سولەیمانی بردبوو گەڕانەوە بۆ ئەسفەندئابادو خۆیان بە نێوبراو گەیاند.

بەڵام ڕەفتاری ڕەزاقولیخان لەگەڵ هاودەستانی ئەمانوڵڵا خانی دووەم دا کە لە سنەدا مابوونەوە ڕۆژ بە ڕۆژ توندو تیژتر دەبوو وپتری پەرەدەستاند. بە نموونە شەوێ لە شەوان ئیسماعیل بەگی کوڕی میرزا یوسفی کە لە پیاوە گەورە وناسراوەکانی وڵات بوو داواکردو لەخۆڕایی و بێ سۆنگە کوشتی.

به بۆنەی ڕووداوی سەربزێوی یاخیبوونی محەمەد حەسەن خانی سالارەوە لە خۆراسـان شای قاجـار بۆ لەنـاوبـردنی، پەی دەرپـەی لەشکـری بەڕێدەکـردو ئەوەبـوو چەنـد جارێکی لە بەرپـرسیـارانی کوردستـان داواکـرد، چەنـد سوارێ لە دلێـرانی کوردستـان شێرانی مەیـدانی شەڕی ئەو کەوشـەن وبوومانە، تەنانەت دە سواریش بن، بۆ شان وشکـۆپێدانی لەشکـرەکـە بنێـرن، بەڵان والی لەبـەر ئەوەی لە ڕەوشـت و ئاکـاریدا زۆر لووت بەرز بووو کاربـەدەسـت و ڕاوێژکارانیشی لە دوور بینیو لێکدانەوەی کار دوور بوون، هیچ یەکێ لەم داخـوازیـانـەی شایـان بەجێ نـەگـەیـاندو ئیدی نەختە نەختە ئەم سەربـزێـویو سەرسـەختیو گوێنـەدانـە بوو بە هۆی ئەوە شا پشتیان تێکـاو ڕوویـان لێوەرگێـرێو گوێیـان ڕاکێشێ. تەنـانـەت دەتوانین بڵێین، شا هاتـە سەر ئەو بڕیـارە کە بنـاغـەی ئەم بنەماڵە تێك داو داری بەسەر پەردوویەوە نەهێڵێ.

# خوسرەوخانی ئەرمەنی

بە بەڵگەی «هەر شتێکی خودا بیەوێ سەبەبکاری بۆ دەڕەخسێنێ» جەنابی ڕەزاقولیخانی والی بە دەستی خۆی و لە بێ سەروبەری وەزیرەکەی هۆی لەناوچوون و نابووتی فەرمانڕەوایی پشتاوپشت بۆ بەجێماوی خۆی فەراهەم کردو ملی ملهوڕی و بێ ئاوەزی و سەرشەقی ناولەم لایشەوە شای قاجار بە دزییەوە ویلایەتی سنەی بە خوسرەوخانی گورجی سپاردو ئەم کارە وا پیشان دەدرا کە خوسرەوخان بە ڕووواڵەت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری زنجان بەڕێ خراوە. بۆ دڵنیایی کردنیش خەڵاتێکیشی بۆ ڕەزاقولیخان نارد، بەڵام چۆن خەڵاتێ، خەڵاتێ کە جۆڵای چارەنووس لە تان و پۆی دنیادا خەتی داماڵینی کەوای دارایی و فەرمانڕەوایی ئەردەڵانی بە خامەی جەلی تۆمار کردبوو.

والی و ئەمینداراتی دەوڵەتەکەیشی ئەمەیان بە مایەی توان و دەس ڕۆیی خۆیان زانی و دوایی کتێوی کەم کارفامی و کەم دووربینی خۆیان ئەخۆتێدەوە لەسەر تەختی حەسانەوە و ئاسوودەیی و سەرسووکی پاڵیان لێدایەوە. تا ئەوەی کە خوسرەو خانی گورجی کە فەرمانی فەرمانڕەوایی بەدەست هێنابوو و لە لایەن زنجان و ئەفشارەوە پەڕابووە سەر ئامادەکردنی هاودەست و سواران و ماڵ و سامانی زۆر و

به دەسەلاتداری و دەستڕۆیی خۆی، خەڵکێکی زۆری بۆخۆی ڕەخساندولەتەك سلێمان خانی ئەفشار و زەینولعابیدین خانی شاهسووندا گەیشتنە سنووری کوردستانی سنەووای بلاوکردەوە کە کاربەدەستی کاروبار ڕێك خستنی کرماشانە.

بەڵام لەبەر ئەوەی تیرەو هۆزەکانی ئەفشار و گەڕووس هەمیشە بەدڵ خزمەتگوزاری بنەماڵەی ئەردەلان بوون، هەواڵی دانانی خوسرەوخانی ئەرمەنی بە فەرمانڕەواو لەشکرکێشیی بۆ ئەو ناوچەیەیان لە نامەیەك دا بە دوورودرێژی لەگەڵ پەیکێك دا بە والی ڕاگەیاند. ڕەزاقولیخان سەرلەبەری گەورەپیاوان و ناوداران و پیاوماقوولانی ولاتی کۆکردەوەو پاش وتوویژو ڕاوێژێکی دوورودرێژ وایان بە بەرژەوەند زانی بەرەو مەلبەندی بابان کۆچ بکەن و بۆ ئەوێ هەڵێن. خەڵکێکی زۆر لە پیرو جوان ولاتیان بەجێ هێشت و لە زێدونیشتمانی خۆیان دەستیان شوشت. والی خۆشی هەرچی کەس وکاری هەبوون، لەژن و منداڵانی، جگە لە تووباخانم فەرمانی کۆچ کردنی دان و بۆ گوندی دوسەی، کە لە سێ فەرسەخیی شاری سنەدایە ناردن و خۆیشی لە دووی وان بەرێ کەوت و بۆ ئەو شوێنە هات. لەوشوێنە سەرلەنوێ لەگەڵ ڕاوێژکارانیدا خر بۆوەو بڕیاردرا کە پاش ئەوەی هەواڵی ڕاستەقینەو ڕوونیان لەلایەن خوسرەوخانەوە وەگیردەکەوێ، بڕیاری دوایی خۆیان بە جاری بدەن. لەوماوەیەدا خوسرەوخانی ئەرمەنی گەیشتە گوندی پەنجە کە ماڵی سەیید عەبدورەحمانی لێ بوو لەوێ گیرسایەوە. والیش شێخولئیسلام و برێ لە پیاوماقوولان و ناسراوانی بۆوەدەست هێنان و ڕای سپاردن بۆ لای خوسرەوخانی ئەرمەنی بچن، بەڵام خوسرەوخان

دەستی بە قورئـانـدا دا کە دەست لە هیـچ کاروبـاریکی نێو خۆی کوردستان وەرنەداو کاری بەسەر هیچی ئەو ولاتەوە نی‌یە، تەنها هەربۆ ئەوە هاتـووە کاروباری والی ڕێك بخاو لە یەك دوو ڕۆژی زیاتر لەوی نامێنێتـەوەو لەپاشان بەرەو عەرەبستان دەرواو ئیتر بەم جۆرە پەیکەکانی والیی دڵنیاکرد.

سەبـارەت بەوە کە ئەم خانـەدانـە ئاووگڵی بە نیهـادپـاکیو وەفـاو جوامێـری شێلداروەو لە دڵ و سینەی‌دا نەخشی بەستووە، والی بڕوای بە قسـە فروفێـلاویو سوێنـدە بەدرۆیـەکـانی خوسـرەوخـان کردو سەلمـاندیو ویرای ئەوەی برێ لە پیاوماقولان و ناودارانی ویستیان لەو باوەڕەی پاشگـەزکـەنەوە، بەلام سوودی نەبوو، ئەو هەر لەسەر باوەڕی خۆی مایـەوەو بە قسـەی نەکـردن. ژن ومـاڵ وکەس وکـاری خۆی بەجێ‌هێشـت و چوو بۆ کن خوسرەوخانی بەدفەڕ. لەم لایشەوە محەمەد سوڵتـان کە لەو ڕۆژانـەدا کارگێـڕیکی جێ‌متمـانـەبـوو لەگـەڵ چەنـد ناسـراوێـك دا بنـەوبـارگـەی والی‌یـان کۆچ پێ کردو بۆ هەورامـانیان گواسـتەوە. هەرچی ڕەزاقـولیخـانی والیش بوو هەرکـە گەیشتە ئاوایی کەڵهوڕئاباد هاوڕێ‌یەکانی بەجێ هێشـت و خۆی لەتەك چەند کەسێکی هاودەم و نزیکی خۆدا بە ئاسـانی ڕووی کردە کن خوسـرەوخـان . لـە ڕاسـتـیش دا ئەمـە شکـاری بوو کە بە پێـی خۆی، خۆی لە داوی نێچیروانێکی کە لەکبازی بەدنیهادی وەك خوسرەخان هاویشت. پاش گەیشتنی والی، خوسـرەوخـان بە ڕوالـەت ڕێورەسمی پێشـوازو میـوانـداریـی بەجێ‌هێنـاو لە نوێ‌ژەنـەوە بە قورئـانی سوێنـد داو سویندەکەشی بە جۆری بوخوارد بە هیچ جۆریکی لێ نەکەویتە گومان و دوودڵی‌یـەوە. هەر ئەو شەوە لەدوی ئیسمـاعیـل خانی برای ناردو

ئەوانەی کە لە کەڵهورئاباد لەگەڵیدا بوون، ئەوانیشی ئامادە کرد.

بۆ سبەینێ، بە گەیشتنی ئیسماعیل خان، خوسرەوخان یەکسەر فەرمانی لە زیندان هاویشتنی والیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەرکردو هەرلەودەمی هەموویانی تالاّن و برۆوو ریسوا کرد. هێندێکیانی لە زیندان هاویشت و هێندێکیانی لە جل و بەرگی خۆیان رووت وقووت کردەوەو هەرچی پەتیەتیێ دنیا هەیە وەسەری هێنان.

رۆژێکی دیکە ئەو خودانەناسە بەدکارە رەزاقولیخانی بەدەست چەند کەسێکەوە داو بۆ تارانیی نارد. سەبارەت بەوە کە وەختی خۆی سەرسەختی وملهوریی رەزاقولیخان بیوو بەهۆی تووڕەیی و نارەزاییی شاو ئەویش لەسەر ئەوە بریاری گوێراکێشانی دابوو، بەلاّم کاتێ دەست وپێوەندانی خوسرەوخان هەواڵی پەشیمانیو مل کەچیی رەزاقولیخانیان لەشا راگەیاندو لەم سەریشەوە تووباخامیش کەژنی رەزاقولیخان بوو خۆی بە شاگەیاندبووو داوای بەخشینی مێردەکەی لێ کردبوو، لە تووڕەییی شا رزگاری بووو شا خان و مانێکی گەورەی بە تووباخانمی خوشکی بەخشیو رەزاقولیخانیشی ناردەوە کن خێزانەکەی.

پاش سێو چوار مانگێ والی چەند توغرایێکی بۆ خەڵکی سنە نووسی. ناوەرۆکەکەی ئەمە بوو: «کوێر، وریابە هەڵۆهات» ئەم توغرایانە هەموو بەدەست خوسرەوخانی نەرمەنی کەوتن. ئەویش نەیکردە نامەردی، هەڵستا هەمووی خرکردەوە بۆ شای ناردن، کە والی خەریکە ناوچەی کوردستان دەشلەژێنیو ئاژاوەی تێدا دەگێری و

ئەم توغرایانە بەلای ئەوەوە بەڵگەیێکی ڕوون و ئاشکران بۆ نیهادپیسی والی.

پاش ئەوەی خوسرەوخان کارەکەی لە شا ڕاگەیاندو توغرایەکانی دیت، شا بەجارێ ئاگری گرت و فەرمانی‌دا ڕەزاقولیخانیان لە زیندان هاویشت و بەم جۆرە جارێکی دیکەیش گیرایەوەو لە ماڵی میرزا نەبی خانی ئەمیر دیوان دا زیندان کراو هەرچی دەردی سەری‌و پەتپەتیی دنیا هەیە بەسەریان هێنا. شێر باکی بەکوت و زنجیرنی‌یە.

لەبەرەوەتر باسمان کرد، کاتێ کە خوسرەوخانی گورجی (ئەرمەنی)گەیشتە ناوچەی کوردستان وبە بەڵین وسوێندی فرەوان ڕەزاقولیخانی هەل فریواندو بەلای خۆی‌دای ڕاکێشا، محەممەد سوڵتان خان و سەرلەبەری پیاوماقوولانی ویلایەتی ئەردەڵان ماڵوژن و منداڵی والی‌و زۆربەی خەڵکەی ئەردەڵانیان بەرەو هەورامان کۆچ داو لەو کاتەدا من، نووسیاری ئەم دێرانە یەکێ لەو کۆچ کردووانە بووم. هەرکە گەیشتنە شوێنێ کە ناوی هۆشبارانی‌یە، حەسەن سوڵتانی هەورامی بە پیریی کۆچ کردووانەوە هات و بە شێوەیێك کە شایانی پلەوپایەیان بێ ڕێوڕەسمی پێشوازلێ کردنیانی بەجێ هێنا.

لەو دەمەداخان ئەحمەد خان کە لەگەڵ والی‌دا دوری نێو یەك قەپێلك و ئەستێرەی یەك بورج بوون، فەرمانڕەوای مەریوان بوو، سەبارەت بەوە کە والی لەگەڵی‌دا نێوانیان خۆش نەبوو، ئەمەی بە هەل زانی‌و بەرەو ناوچەی هەورامان هات و مرخی لەگرتنی کۆچ کردووەکان خۆش کردبوو، بەڵام هەرکە دیتی خەڵکەکە بە جارێ دەستیان لە گیانی خۆیان شوشتووەو هەروا بە ئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن، لەو کارە کشایەوە. ئەو شەوە کۆچ کردووەکان کە لە هەزار کەس زیاتر بوون،

# فەرهەنگی ناوان

(ئ)

پاش ئەوە دژمنە ئەرمەنی یەکەی کوشت و لەناویبرد، پاشان سەحتی تۆ بخانەدا شکا، قەلاو خانومانی خۆی ئاگرتێبەردا لە (سولچە)وخۆیشی کوژرا.

(٦٥) تەلاری دڵ گوشا، سەیفوددەولە، فەرمانڕەوای زۆرزانی سەدەی دەجەر (١٣٣٧ - ١٣٤٠)کە لە سنە بە شەریف قەساب ناوبانگی دەرکردبوو، ڕووخاندنی هێندێ لە ژوورو پاشماوەکانی عیمارەتی گولستان و دیوانخانەکەی (ئەرولان)یش کە بە دەستی نەخش کارانی دەست ڕەنگین بە وێنەی ڕەنگاورەنگە وجوانی

فەرمانڕەوایان وپیلوانی بەناوی ئەردەڵان ڕازاندرابوو، لە دوادوای شاهێتی ڕەزا شادا بەفەرمانی سەر لەشکر موقەددەم ویران کراوپاشماوەی حیجازی و نەخشەکانیشی سەرتیپ هۆشمەند لەناوی بردن.

(٦٦)ئەم عیمارەتە جوانە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان کۆشکی هاوینەی ئەمانوڵلاخانی ئەکە بووە لە ڕۆژاوای سنەو لە ناوەندی باخێکدا هەر بەو ناوەوە ماوەتەوەو ویرای ئەوەی کە بە ئاسەواری سەدەی هەژدەهەم دەزانرێ، هێشتا لە ڕووی جوانی و تیشەنەی گەچکاری و شێوازی بیناکاری یەوە شانی لەشانی جوان ترین ئاسەواری سەدەی بیستەم دەدا، بەڵام بەداخەوە، لەبەر کەمتەرخەمی و پشت گوێ خستن و زۆری خاوەن و دەسەڵاتدەس پێ کردنی و چاک نەکردنەوەی ڕووئە نەمانەو خەریکە لەناوچێ

(٦٧)ڤیت وفیتکاری شازادە خانمەکانی قاجاری کە لەحەرەمگای میرنشینی ئەردەڵانە دەستیان ئەڕوێشت وبیشبرکێی نێوخۆیان هۆیەکە لەو هۆ سەرەکییانەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکانی پێ لەناوچوو.

(٦٨)ماهشەرەف خانم(مەستوورە)هەر بەهۆی ئەونەخۆشی یەوە کە گرایە نەخۆشی ڕشانەوەبوو کۆچی دوایی بەم قسە دڵتەزێنە بڕیوەتەوە.

(٦٠) ئەمانوڵڵا خانی والی زۆری حەز لە ئاوەدان کردنەوەی ئەردەڵان و خانووبەرەو کۆشك و تەلارو جوگاو جۆبارو گەرماوی چاك و ڕێگاوبان و پردو باخ و باخاتی گەورەوفرەوان دروست کردن کە هێندێ لەمانە ، تا ئێستایش لەم لاو لەولای کوردستانی سنە ماون و بە ئامالآخانی ناویان ڕۆیشتووە.
(٦١)دیاردییە بۆ گەرانەوەی فەتح عەلی شای قاجار لە سەفەری خۆراسان.
(٦٢)فەتح عەلی سوڵتان کە فەرمانڕەوایی بانەی بە مافی خۆی دەزانی ، چەنانێ پێشتر هەڵی کوتابووە سەر بانەو ئەحمەد سوڵتانی کە بە فەرمانی ئەمانوڵڵاخان ببوو بە فەرمانڕەوای ئەوێ کوشتبوو و بانەی خستبووە ژێر دەستی خۆیەوە.
(٦٣) بنەماڵەی وەزیری کە ئێستا بە دەسەڵات ترین و بە سامان ترین و دەسرۆترینی بنەماڵەکانی سنەن لەسەردەمی خان ئەحمەد خانی سێیەم ، کوری سوبحان وێردی خانەوە، واتە لە دەوروبەری ٢٠٠ ساڵ پێشتر لە ئەردەڵان ناوبانگێکی زۆری پلەوپایەی وەزیرییان هەبووە، باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە خواجە محەممەد یوسف سووروەی دزەیی یە کەلەکوردستانی سنە جاران بە خاوەن ڕێزو بازرگانیان دەگوت خواجەو ئێستایش لە هێندێ ناوچەکانی هەورامان ئەم ناوە هەر لەباوەو یەکەم کەسێکی لەم بنەماڵەیە بە پلەی وەزیری گەیشت میرزا عەبدوڵڵای ئەووەلە. لەوەزیرە بەناوبانگەکانی ئەم بنەماڵەیەو میزا عەبدوڵڵای دووەم، میرزا فەرەجوڵڵای وەزیر، میرزا جەعفەری وەزیرو میرزا محەممەد ڕەزای وەزیرن.
لە کورانی محەممەد ڕەزایوەزیریش مشیری دیوان و پاشان ئاسەفی ئەعزەم خاوەن دەسەڵات و دەسرۆیوون.
(٦٤)چەرداوەری لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان کە لەلای ڕۆژهەلاتەوە لەگەڵ زەویی هەمەدان دا هاوسنوورە. خەڵکی ئەم ناوچەیە سەرلەبەر گۆران و کوردزمانن لە سەرداراانی بەناوی ئەم هەرێمە باقی خان ناوبانگێکی زۆری هەیە.
ئەم خانە لە گەرمەی شەری گەورەی یەکەم دا بەرانبەر بەپێشکەوتنی هێزی ڕووسیای تەزاری بەربەرەکانێیەکی سەختی کردووەو زەرەروزیانێکی زۆر قورسی پیان گەیاندووە. ئەم پیاوە سەرەنجام لە شەرێکی دا کە لە دژی هێزی بەیرەم خانی کرد ،

(گاور) گوایه هەر وشەی «گبر»ی فارسیی کۆنە کە واتای (زەردەشتی)یە، بەلام ئەمڕۆ لەمنە بە هەڵە ڕۆیشتووەو کراوە بە ناو بۆ عیسایی کلدانی‌یەکان کە بە ڕەگەز کوردن و لەبەر پەیڕەوی کردنیان لە کەنیشتەی کلدانی بەکلدانی ناویان ڕۆیشتووە.

(٥٢)ژنـانی کورد هەر لە کۆنـەوە خۆیـان لە زوربـەی کارویـار هەلقـورتـانـدووەو تێوەگلاندووە، تەنانەت لەشعروشۆریش دا هاوبەشی‌یان کردووەو دەی‌کەن. ئەی ئەوە نی‌یـە میـژ وو ناوی ژنێکی بە نامێی دلاوەری کوردی وەك فاتـورەشی تۆمـار کردووە. کەچی وێـرای ئەوەش لە هێنـدێ ناوچـەی کوردستـان ،بـە نمـوونـە لە ئەردەلان دا لەبـە لاسـایی کـردنـەوەی ڕێورەسمی نەتـەوە دراوسێکانی نەبووە بە باو ژنان کاری فەرمانڕەوایی لە ستۆگرن.

(٥٣) زەهـاو: ئەسـلەکـەی «زێ ـ ئاو»ە ،مـفـتی زەهـاوی، شاعیـری گەورەو فەریحەخۆش لەم گۆشەی کوردستانەوە سەری هەڵداوە.

(٥٤) چوارباخ: ١٥٠ ساڵ لەمەوبە لە شوێنی ئەم باخە گەرەکێ هاتۆتە گۆڕێ کە ئێستا بە گەرەکی «چوارباخ» ناوی ڕۆیشتووە.

(٥٥) کەهیە: بەزاروی کارگێری ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی بەفەرماندەی(خلو ـ حامیە)پارێزگاری گوتراوە.

(٥٦) لە خەڵخـاڵ کە سەر بە ئازەربـایجـانـە دوو تیـرەی گەورەی کورد لە پەلەکانی عێلی شقـاقی (شکـاك) هەن بەناوی «کلوکجان لو »و «شاتران لو» ئەم دوو تیرەیە کە ئێستایش هەر بە زمانی کوردی داخێون نزیکەی «ە» هەزار کەسێ دەبن.

(٥٧) ئەمیر ئەسلان خان هەر ئەو کەسەیە مەهدی بەگ بە ئەمیر ئەرسلان خانی ناوبردووە.

(٥٨) قازی محەمەد شەریف ساڵی مردنی خوسرەوخانی ١٢٠٨ك و جێگای ناشتنی «عەتەبات»نووسیوە.

(٥٩) قازی ژمارەی جەنگاوەرانی لوتف عەلی خانی لەم شەڕەدا .....١کەس نووسیوە.

ڕۆژهەلاتی ئیسفەندئابادیش بە هۆی دراوسێتیی هەمەدان و میهرەبانەوە زمانی تورکی چەسپیوەو تەشەنەی کردووەو بووە بە باو.

(٤٣)بە قسەی مێژووی قازی محەمەد شەریف مستەفا خان کەمترین بەربەرەکانێیەکی پیشان نەداوەو لەگەڵ میرمیران و ناوداران دا شاری جێهێشتووەو مەحموود سارایش هەژار و بێچارەو پاشماوەی جووەکانی تالان کردووەو هێندێکیشیانی کوشتوون و ئەنجا گەڕاوەتەوە بۆ شارەزوور.

(٤٤) ئەم حاجی سەیفەددین خانە گوایە هەرئەو «حاجی» سەرتیپ، سپەهسالارە بەنامییەی نادرە کە لە کوردەکانی خۆراسان بووە.

(٤٥)لە ناو ئەو برە قەلا سەختانەی داغستان داکە بەئلزایەتیی خان ئەحمەدخان گیراون ناو قەلای «دوزاق دەرە»یش هاتووە.

(٤٦)سالی ١١٥٥

(٤٧)بەراز، کە لەهۆزە گەورەکانی کوردن وزووتر ژیانی خێلەکی ژیاون وبەپێی وەرزەکانی ساڵ گەرمیان وکوێستانیان کردووە، پێش چوار تا پێنج سەدەش دەستەجاتێ لەم هۆزەلە هێندێ گوندی ئیسفەندئابادو کوێستانەکانی وەکو هەواجو (عەباس جوب)هێورین وحێگیربوون.

(٤٨)٥٠٠تومان پارەی سەردمی نادر بە پارەی ئەمڕۆبە هلیونەها ڕیاڵ لێك دراوەتەوە.

(٤٩)شیا (شەیدا: قازی لەم بارەوە دەنوسێ: «. . . لە سالی ١١٦٧ دا مرد. . پاش شەش مانگ، تەرمەکەیان لەهەمەدانەوە هێنا لەشەیدا ناشتیان و هیچ پێست وگۆشتی لەناونەچووبوو. . »

(٥٠) Kemez گوندێیە لەسێ کیلومەتریی ڕۆژاوای سنە.

(٥١)لەشاری سنەدا لە ڕۆژگاری کۆنەوەی کەمایەتییەکی عیسایی هەبوون وهەن و خەڵکی ئەو ولاتە بە. هەڵە ئەرمەنییان پێ دەڵێن: خەڵکی سنە هاوشارییە کلدانییەنی خۆیان هێندێ جاربەوگاورەناودەبەن گەرەکەکەشیان بەگەرەکی «گاوران» ناودەبەن.

سەرەڕای ئەوەی کە لەسەردەمی دەسەلاتی نادردا چەند بەشێ لە کوردستانی سنە ببوو بە مەیدانی شەڕوشۆڕ و کێشەو هەرای خوێناوی‌و وێران و وێرانکاری‌و کارەساتێکی زۆری پشت شکێن بەسەر خەلکەکەی هاتووە کەچی خەلکی کوردستان بە چاوێکی تایبەتەوە ڕوانیویانەتە ودەڕوانتە ئەم سەردارە نلودارە نادرپوخشەترین و جێمتمانەترین و سەڕاست ترینی سپاهی‌یانی خۆی لە کورد هەلبژاردووەو تەنانەت بە قسەی (جەیمس فرایزەر)، دیرۆکنووسی ئینگلیسی، پێشەنگە و پێش لەشکر و ڕیزی پێشەوەی لەشکری نادر لە هەموو شەڕەکانی هیندستان دا کوردو هێزەکانی حاجی خانی سەرتیپی کورد پێکیان دەهێناو هەروەها نادر شا زۆربەی ڕاوێژکارانی سپایی‌و کارگێڕی خۆی لە سەرانی کورد هەلبژاردووەو ڕەوانەوەی گرفت و تەنگە وچەلەمەی بەرەوڕووی ڕاوتەگیری ئەوان کردوتەوە.

ئاشکرایە، کە ئەم هەموو دلنیایی‌و متمانەو یەك ڕەنگی‌یەلەلایەکەوەو لە لایەکی ترەوە ئاشنایی‌و خوێنەوانەدن بە داوودەستوورو ئاکارورەوشتی نەتەوەی کوردو تەنانەت زۆرحەزکردنی لە بیروبڕوای تایبەتی خەلکی کوردستان و ڕێزگرتن و قەدر گرتنی تەواوی پیرانی ئەم ولاتە بە نموونە هی وەکو (شێخ مەولاناوا)لەهەست بە خزمایەتی‌و پێوەندی نەتەوەیی بەولاوە چیدیکە نی‌یە. هەرلەبەر ئەمەیە کە کورد نادریان بە یەکێ لە خۆیان داوەتە قەلەم و یادی شانازی ئامێزی سەردەمی نادری لەبیرناکەن.

(٤٢) ئیسفەندئاباد: لەهەرێمە گرنگەکانی سنەیە. *

(*) ئەم هەرێمە تا بلێی ئاپۆرەو قەوغایە لە سنە. نیشتەنی ئەم هەرێمە لە کۆن دا هەموو (گۆران)و گۆران زمان بوون و هەروەها خەلکی (قەلا) کە لە گوندە گەورەو بەنامێ‌یەکانی ئەوێ‌یە لە پەیرەوانی (عبدالملکی)ن و تا ئێستایش شێوە زاری خۆیان کە زۆرلە شێوەزاری هەورامی‌یەوە نزیکە پاراستووەو پێی‌داخێون، بەلام پاشان بە هۆی ئەوەوە کە لەگەل ئەو کوردانە لە ڕۆژاواوە لەم هەرێمە هەواریان گرتووە، شێوەزارەکەیان بووە بە شێوەزارێکی تایبەتی کرمانجی. لە هێندێ گوندی باکووری

اگر چه او منار کلەها ساخت
زلی با وی سلیمان نردها باخت
بسال سیزده خان قزلباش
از آن گفتند کزماماست آنحه برماماست

(٣٨) ئاوییەر: ڕەوەزە چیایەکە لە باشووری ڕۆژاوای شاری سنە هەڵکەوتووەو باخ وباخاتی داوێنەکانی و هەروەها ئەودۆڵەی کە کانیی مامەتکەی پێدا دەڕواُ سەیرانگای خەڵکی ئەم شارەیە.

٣٩ لوڕ: لە پەلــی گەورەی کوردەو دەکرێ بە چوار بەشــەوە: کوگیلوێیی، ماســانی، بە ختیاریو لوڕی ئەسڵی. یەکێ لە تیرە بە ناموبەناوبانگەکانی لوڕ «لەك»ە، کە گوایە پێش سەردەمی سەفەوییو لە سەرەتای فەرمانڕەوایی سەفەوی‌دا هاتووونە باکووری لوڕستان و لەوێ هەواریان گرتووە. کەریم خانی زەند کە لەم تیرەیە لە سەردەمی حوکمڕانیی‌دا بڕێ لە بایرانەوەندەکانی کۆچ پێکردن بۆشیراز. لە کوردستانی ئەردەڵانیش لە کۆنەوە هۆزێ بە ناوی (زەند)و لەکەوە هەبوون و تا ئێستا پاشماوەیان لە ئیلاخ (ئیلاق)و شوێنانی دیکە هەر ماوە.

(٤٠) جاف: لە تیرەو هۆزە گەورەکانی کوردن کە زۆربەیان لە کوردستانی عیراق دەژین. جاران ئەم هۆزە هاوینــان دەهــاتنــە کوردستــانی سنــە، پاش تەڕوتــووشی تەواوبــوون دەگــەڕانــەوە بۆمەڵبــەنــدی خۆیان (گەرمیان و کوێستانیان دەکرد) لەم سەدانەی دوایی‌دا دەستەجاتێ زۆر لەم هۆزانە لە دەوروبەری شاری سنە هەواریان گرتــووەو نیشتــەجێ بوون، وەك: قــوبــادی وشێــخ ئیسمــاعیلی وئێنــاخیو وەڵەدبەگیو . . هتد.

(٤١) پێش سەردەمی فەرمــانــڕەوایی سەفــەوییــەکــان و بگــرە لە ڕۆژگــاری فەرمــانــڕەوایی‌یانیش دا تیــرەو هۆزێکی زۆری کورد بۆسنــوورپاراستن لەخێڵ و هۆزانی ئۆزبــەگ و تورکمــان براونــەتــە سەرسنــوورەکــان و لە لێــواری باکــوورو باکــووری ڕۆژهــەڵاتی خۆراسان دا ـ ژیاون. لە تیــرەیــەکی ئێــوون و چکۆلەی قرخلووی کورد نادر چاوی بە دنیا هەڵێناوە. (قرخ) واتە: کەنار یا لێوار.

جل وبەرگێکی کوردیی تایبەت بێ.

(٢٩)لــە رۆژهــەلاتــی سنــە گردێکــە بە ناوی تووسی نەوزەر کە گۆیــا تیــرەی «دۆشەزەرینە» سەریەوە، ئەمەیان راست ترە.

(٣٠)مورادخانی چوارەم، کوری محەممەد خان.

(٣١)مەبەست لە کوردستان ئەردەلانە.

(٣٢) قازی محەممەد شەریف لە مێژ ووەکەیدا بە دەم گێرانەوەی ئەم چیرۆکە وەباسی ئەو خزمەتگوزاری یە گەرم د دلسۆزانەیەی کە بۆ ڕێزلێنانی خان کراوە بە درێژی دەکا.

(٣٣) کەلب عەلی خان غەزەلیاتی جوانی بە شێوەی گۆرانی گوتووە کە هێندێکیان تا ئەم چەنانەی دووایش هەر بەسەر زارانەوە بوو.

(٣٤) هۆی ئەم گۆرانکــاری‌یــانــە نە قازی محـەمـەد شەریف ونە مەستــوورە هیــچ کامیان روونی نەکردۆتەوەو مێژ ووی ئەمەیان بە تاریکی هێشتووەتەوە.

(٣٥) مێــژ ووی قازی محــەمــەد شەریف سەرلـەنوێ چوونەوەسەرتەختی میرنشینی ئەردەلانی خان ئەحمەد خانی سالی ١٠٩٩ کۆچی نووسیوە.

(٣٦) لەبــارەی نێــونــرانی بابــانــەوە (بــابــان) ناتوانرێ رابەکی بنەبر بدرێ. هەرچی ویــلایــەتی بابــانــە بریتی‌یە لە (سلێمانی)ی ئێستا کە لەسای دلاوەری‌وتوانی میرانی ئەم ولاتــەوە (کــە کەمتــر گوێیــان بە سولتــانــەکــانی بەرەی عوسمــان داوە)سنووری دەرووی ئەغلەبە فرموان بووەتەوە (*)

(*) میــرانی بابــان بە وتــەی نووسیــاری «شــەرەفنامە»، د.. لە نێوان فەرمانڕەوایانی کوردستــان دا نێــویان بە زۆروزەووەندیی ئەسپ وحەشەم وخەلك ودەستەودایەرەو پێشکار، رۆیشتووە. ئەمرۆکە ژمارەیێکی زۆر لە میرانی بابان لە کوردستانی عیراق و سنە ماون.

(٣٧) قازی محــەمــەد شەریف ژمــارەی سپــایی‌یــانی قزلبــاشــەکانی لەم شەرەدا بە ٧٠٠٠٠ حەفتا هەزار شەرکەر نووسیوە. شێخ ئەحمەدیش لە شیعرێك دا لەسەر ئەم ژمارەیە سوورەو دیاردیی بۆ درندەیی‌و خوێنرێژیی سەروەری قزلباشان کردووە، دەلێ:

ئەداوەو سەریان بۆ کەس شۆڕنە کردووە، سەرەنجام ملیان بۆخان ئەحمەد خانی کوڕی هەڵۆخان کەچ کردو لە گوێڕایەڵی و فەرمانی نەدەچوونە دەر.
(٢٢)بە پێی ئەم قسەیە دەبێ بنەماڵەی وەکیل کە لە بنەماڵە کۆنەکانی سنەیە، بە ڕەچەڵەك لە ئەردەلانی یەکان بێ.
(٢٣)مەبەست ناوچەی «سنە»یە.
(٢٤)گیان لەبەرێکە لە کۆمەڵەی بۆقگەل، لەشی درێژو چوارپەلی هەیەو کلکی درێژە.
(٢٥)ئەم تاکە شیعرە لە پارچە چامەیێکدا کە لە پەراوێزی مێژووی ئەردەلان، نووسینی شەریفی قازیدا نووسراوە، هاتووە. ئەو شیعرە وەك بەرچاو دەکەوێ لە دایك بوون، چوونە سەرتەخت، نەخۆشی، چاك چاك بوونەوە، تەناتەت مردنی خان ئەحمەد خانیشی تێدا بەدیارخراوە.
ئەمەش پارچە شیعرە کەیە:
خان اکراد یعنی خان أحمد
سال بخت آمد از عدم بیرون (١٠٠٢ك)
سال کج بخت یافت حکم جلوس(١٠٢٥ك)
در غلط گشت ابلەو مجنون(١٠٣٩ك)
بان صحت بیافت اندر غم(١٠٤٠ك)
یافت حکمی ز بیشتر أفزون
سال غم ها هزیمتش دادند(١٠٤٦ك)
رفت بیرون أز أین زمانە، دون
(٢٦)لە جەژنێك دا کە خان ئەحمەد خان بە بۆنەی چوونەسەر تەختەوەی گێرابوو شێخ شەمسەددین خودبەیێکی بە ئاوتاوی خوێندەوە. بۆ خوێندنەوەی دەقی ئەم خودبەیە بڕوانە کتێبی (سنەأردلان) نووسینی مەردۆخ «کوهستان».
(٢٧)نیسبەت درانی ئەم بەرگەو داهێنانی بە خان ئەحمەد خان تا چێنەوە سەر هیچ دەساوێژێکی مێژووو هیچ بەڵگەیێکی لەسەر نی یە. مەگەر مەبەستی مەستوورە

(١٢)ئەمیر شەرەفخان لە کتێبەکەی خۆیدا ئەم مەسەلەیەی روونتر لێك داوەتەوەو دەنووسێ: «ئیدی لەو سەردەمەوە شارەزوور بوو بە بەشێ لە زەویوزاری عوسمانی».

(١٣)«شەرەفنامە» دەڵێ: «. . . نێوی نرا تەیموورخان پاشا». (پاشا وشەیێکی کوردییە ئەسڵەکەی «پادشا»یە. ئەم وشەیە تورك ولە پاشان عەرەب وەریا نگرتووەو کردوویانە بە نازناوی سپاییو زاراوەی سیاسیی خۆیان).

(١٤)سەربە پارێزگای سلێمانییە لەکوردستانی عیراق.

(١٥)ئەم قەڵایە لە دووریی ٦ کیلۆمەتریی باشووری سنەیەو لە سەر کێوی هەڵ نراوە.

(١٦)بە پێی مێژووی «مەلا محەممەد شەریفی قازی» بە بۆنەی ئەم چاك بیرکردنەوەیە شاعەباس پایەی سەرەك وەزیری (وزیر أعظم) بە ئالیبالی، باپیرەی شیخ عەلی خانی زنگەنە دەبەخشێ.

(١٧)لەبارەی خەیانەتی «کلاوزەر خانم» (زەرین کوە)بە خان ئەحمەد خان و چۆنێتیی ئیعدام کردنی «یوسویاسکا» وەرگێری تایبەکاری خانی ئەردەڵان هێشتا هەر بە سەرزاری خەڵکی کوردستانەوە دەگەرێو پیروردێن سپیانیش ئەو شیعرانەیان کە لەم بارەوە گوتراون، هێشتا هەر لەبەرە.

(١٨)سەبارەت بەوە کە ئیمپراتووریەتی عوسمانی خاوەنی خاکی رۆمی رۆژهەڵات بوو. بە هەموو وڵاتەکانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی خاکی رۆم دەگوترا.

(١٩)ئەوەی روونە هەر تیرەو هۆزێ کە لە قەڵەمرەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بووبن مەستوورەی کوردستانی بە دژمنی داوەتە قەڵەم و لەم دژمنایەتییەدا وەك پێ لایەنێ خۆی نەنواندووە (وەرگێر).

(٢٠)نووسیار لێرەدا پێ لایەنیی خۆی لەدەست داوەو کەوتۆتە ژێر کاری هەست وخوستی تایبەکاری خۆیەوە.

(٢١)لە مێژووی قازیدا نووسراوە کە: تیرەی بلباس هەرگیز باجیان بە کەس

(٥)سەبارەت بەوە کە زنجیرەی ساسانی لە کوردی شوانکارە هەڵ کەوتووە رەنگە سەرچاوەی ئەم داستانەش، واتە: سەر بە ئەردەشێری بابکان بوونی بابائەردەڵانیش هەر لەم سەرچاوەوە ئاوبخواتەوە.

(٦) بەشی گەورەی نیشتەنیانی ئێستای کوردستانی ئەردەڵان ئەو کوردە کۆچ کردووانەن کە لە سەدەی دەیەمی ز. یازووتر، لە سەروبەندی جیاجیادا لە کوردستانی باکووروو رۆژاواوە کۆچیان کردووەو بە هۆی لە نیشتەنییە ئەسڵییەکانەوە نزیکیی تەواویان، بەبێ لێك هەڵەنگوتن و کێشەوهەرا لە ئەردەڵان جێگیر بوون و لەگەڵ خەڵکی دیکەی ئەو ناوچەدا تێکەڵ بوون، وەك ئەردەڵانیان و گەڵباخیان و شامەنووریان و بۆرەکەییەکان و...

(٧)لەبارەی بنەچەکەی بنەماڵەی ئەردەڵانەوە «شەرەفنامە» دەنووسێ: «لە کورانی فەرمانرەوایانی دیاربەکر، لە سۆرمۆتۆرەی ئەحمەدی کوری مەروانن... بابا ئەردەڵان ناو... لە ئاخرو ئۆخری دەوڵەتی جەنگیزیەدا بەسەر ویلایەتی شەهرزول(شارەزوور) راگەیشتووە...

(٨)«شەرەفنامە» سوڵتانی رۆم (عوسمانی)ی لەم سەردەمەدا بە سوڵتان سلێمان خان نووسیوەو سەرداری سپاکەیشی بە سوڵتان حوسێن بەگ، فەرمانرەوای عیمادییە لە قەڵەم داوە کە لەگەڵ هێندێ میرانی کوردستان دا ویلایەتی شارەزووریان گرتووە.

(٩)کتێبەکەی خوسرەو بەگ سەرچاوەیێکە لە بارەی مێژووی کوردستان و ئەردەڵانەوە کە مەستوورە کەڵکی لێوەرگرتووە. ئەم کتێبە خوسرەو کوری محەممەدی بەنی ئەردەڵان لە ١٢٤٩ی قەمەریدا نووسیویەو بە کتێبخانەی فەرمانرەوای ئەردەڵان خوسرەوخانی ناکامی پێشکێش کردووە.

(١٠) واتە: فەرمانرەوای عیمادییە.

(١١) بە قسەی «شەرەفنامە» لەساڵی «١٠٠٥»دا سنجاقی «حلە» بە دەست مەئموون بەگەوە بووە.

مەبەست لە (حلە) حەلەبجە - هەڵەبجەیە، (حلە)ی باشووری بەغدا نییە

## پەراوێزەکان

(١) مەبەستی مەستوورەی کوردستانی، ئەردەڵان یا ئەیالەتی «سنە»یە، کە شارەکانی سنەو بیجادو سەقزیٔ ئەمر و بووە.
سەرەرای ئەوەیکە لە باشوورو باشووری رۆژاوای لەو سەردەمەدا لە ئێستای بەربلاوتر بوومو کەوشەنی لە نزیکی شاری کرماشان وقەسری شیرین دەگەڕێتەوە.

(٢)سەرچاوەی ئەم داستانە بەڵگەی کۆنەو نرخی مێژوویی‌نەیشی هەر بەو ئەندازە داستانەکەی «ئەژدەهاك = ضحاك»ە. لەم بارەیەوە فیردەوسیش بەدەم باس کردنی ڕووداوەکانی ڕۆژگارەوە دیاردیی بۆکردووەو لە پاش چۆنێتیی نەخۆشیی ئەژدەهاك و هەلاتنی خەلکەکە ئاوها دەڵێ:

کنون «کرد» از آن تخمه دارد نژاد
که آباد باید بدل برش یاد

(٣) لە کوردستانی باکوورو ڕۆژاوا بە شارنشینان و نیشتەنی‌یانی گوندان کرماج و کرمانج دەگوترێ، هەروەکو لە کوردستانی ڕۆژهەلات و (کرماشان و ئەردەڵان) گۆرانیان پێ‌دەگوترێ.
(٤) شارنشینان و نیشتەنی‌یانی گوندی کوردستانی ئەردەڵان وکرماشان (کە بە پێچەوانەی کوردی رەوەندەوە کە بە پێی پێداویستی وەرزی لەوەرگاو زستانەوار «ئیلاخ و قشلاخ» گەرمیان و کوێستانیان دەکرد لە کۆنەوە «گۆران» یان پێ‌گوتراوەو شێوەزاری گۆرانیش کە تا ئەم دواییانەیش زمانی شیعر و ئەدەب بوومو هێشتا هەر بە برەوو رەنە، زارێکی تایبەکاری زمانی کوردی‌یەو لە زاری هەوارمی‌یەوە زۆر نزیکە.

ذی‌الحجـــه)ی ساڵی ١٢٦٣دا جەنـابی حوسـەین قولیخـان نەخـۆشی بەسـســەری‌دا زاڵ بووو لە ماوەی شەوو ڕۆژێـك دا گیـانی بەبـەهـەشتی بەرین شادبـوو و لە پرسـەکـەی‌دا هەزاران سینـەی بۆهـەڵ دڕان و منی مەستوورەی سەرلێ شێواوو دەربەدەریش لە دووری لێك دا برانی ئەو گیـانـە ئازیــزەم دوو سێ ڕۆژێـکــە لەش وڕوحـــم بە بەڵای تای نەخۆشی‌یەوە دەتلێتەوە. بزانین خودا چیمان بەسەردێنیو ئارەزووی بەچی‌یە... (٦٨)

له گونـدی هۆشبـارانی یان بەسـەربـرد . بۆ سبەینێ کە هێشتا ڕۆژ هەڵ نەهـاتبـوو بنـەوبـاریـان ڕاداو لە ڕێگـایـەکی ناهەموارو سەختەوە، کە هەڵـــوێی بەسەردا فریـا پەڕی دەوەری و مانگی پێ سووکی ئاسمـانی لیـوەتیپـەڕیـا دەکـەوتـە خواری بۆ نێو کە ندەڵان و هەڵدێری پەستی و هەپـرو ون بە هەپـروون دەبـوو، تێ پەڕین و بەگـونـدێ لەگوندەکانی شارەزوور گەیشتن، کەنێـوی سەرگـەتەو لەوێ لێی گیرسانەوە. ئینجا لەوێوە محـەمەد سوڵتان و میرزا عەبدوڵڵای مونشی باشی چوون بۆ سلێمـانی و بە خزمـەت عەبـدوڵڵا پاشای بابان گەیشتن و ڕێ و ڕەسمی پێشـوازلی کردنیـانی بەجێ گەیـانـدو پیاوماقووڵێکی لەتەکیان دا نارد بۆ ناوچـــەی شارەزوور، بـــۆ ئەوەی ئەو خەڵکـــە بەســـەر گونـــدەکـــانی شارەزووردا بەشرێنەوەو دابین کرێن.

له باسی لابردنی خونچەی باخی خوسرەوانی، نوێ باوەی بێستانی کامـەرانی، ئـەمـانـوڵـڵا خانی ثانیدا لەبیرمان کرد لەوە بدوێین کە لەو کاتـانـەدا دڵســۆزانی گیـان فیـدای ئەو زاتـە هەردەستـەیێکیـان کەوتـە وڵاتێکەوەو هەر برێکیان لە بنارێك دا گیرسانەوە. حوسەین قولیخانی مامی ئەمـانـوڵـڵاخـان کە پوورزای من، نووسیـاری ئەم کتێبەیش بوو، ڕووی لە سلێمـــانی کردو بەوپـەڕی ڕێـزەوە لەوێ پێشـوازی لێکـراو گیـرسایەوەو کاتێکیش هەواڵی کۆچی ئێمەی بیستەوە خەڵکێکی زۆری بە ئەسپ و هێسترەوە نارد، سەد کەسێ لە بنەماڵەی ئێمە بگوێزنەوەو لە لایـەن خوێشیـەوە جێگـای هێـورین و گوزەرانی بۆ ئامادەکردین و هەر یەکـەی بە پێی پێـداویستی خۆی کۆمـەگە و یارمەتی دەداو لە خزمەتیدا کاتمـان بەخۆشی بەسەردەبرد، بەڵام پاش چەنانێ، چارەنووسی خودا لەخـۆش گوزەرانیی ئێمـە ڕازی نەبوو، ئەوەبوو، لە ڕۆژی ١٤ مانگی

(ز)



(س)

(ن)